



کۆما بەرهەمێ

# ئەحمەدێ خانی

نووبار
عەقیدەنامە
مەم و زین
دیوان

بەرهەڤکرن: تەحسین ئیبراهیم دۆسکی



# ئەحمەدێ خانی

کۆما بەرهەمێ

نووبار
عەقیدەنامە
مەم و زین
دیوان

بەرهەڤکرن

تەحسین ئیبراهیم دۆسکی

# کۆما بەرهەمێ

# ئەحمەدێ خانی

نوبار، عەقیدەنامە

مەم و زین، دیوان

بەرهەڤکرن

تەحسین ئیبراهیم دۆسکی

# پێشگۆتن

پشتی شێخێ شاعرێن کوردان مەلایێ جزیری، سەیدا ئەحمەدێ خانی دئێتە هژمارتن مەزنترین و ناڤدارترین شاعرێ کورد، و ئەو بەرهەمێ شعری یێ وی ل پاش خۆ هێلای و جهەکێ زێدە بلند د کتێبخانەیا ئەدەبییاتا کوردی دا بۆ خۆ کرییە باشترین نیشانە ل سەر ڤێ چەندێ.

سەیدایێ خانی -وەکی د شەجەرەیا نسەبا مالباتا وی دا هاتی- ناڤێ وی یێ دورست ئەحمەدە، کورێ ئلیاسێ کورێ عیاضێ کورێ رۆستەمێ کورێ عەبدررەحمانێ کورێ عەبدررەزاقێ کورێ سلێمانێ کورێ میر حسەنە، و دئێتە هزرکرن کو مالباتا وان ل سەر دەمێ ڤی میر حسەنی ژ گوندێ (خانێ) ئەوێ سەر ب (چەلێ) ڤە بەر ب دەڤەرا خۆشابێ ڤە چووینە، و بۆ دەمەکی ل گوندێ (زێریناکێ) ئاکنجیبووینە، پشتی کو مەنصبێ (دوزداریا کەلا زێریناکێ) ژ لایێ میرێ هەکاریان یێ وی سەردەمی ڤە بۆ میر حسەنی هاتییەدان. و پشتی میر حسەنی و حەتا زەمانێ نەڤیچرکێ وی شێخ عەبدررەحمانی ئەڤ مەنصبە د دەستێ ڤێ مالباتا وی دا بوو.

ل سەر زەمانێ شێخ عەبدررەحمانی ئەڤ مەنصبە ژ وان هاتە ستاندن، لەو شێخ عەبدررەحمان ب مالباتا خۆ ڤە بەر ب دەڤەرا بایەزێدێ ڤە چوون، و ل (دوزەسۆرێ) د ناڤ ئویجاخا مەحموودییان دا ئاکنجیبوون، و ل وێرێ شێخ عەبدررەحمانێ خانی بۆ قازی، پاشی ل سەر دەمێ کورێ وی رۆستەمی مالبات بۆ بازێرێ بایەزیدێ هاتە ڤەگوهاستن، و میرێ بایەزیدێ یێ وی سەردەمی بهایەکێ زێدە دا رۆستەمی و مالباتا وی، و ئەو نێزیکی خۆ کرن.

ژ رۆستەمی پێدا ئەڤ مالباتە بوونە ژ ئاکنجییێن بایەزیدی، و مەلا عیاض و کورێ وی مەلا ئلیاس ژی -وەکی ژ ناسناڤێ وان ئاشکەرا دبت- ل ڤی باژێرێ کارێ مەلاتییێ کر.. و ئەو بوو ل سالا ل سالا ۱۰٦۱ مشەختی (بەرانبەر ۱٦٥۱ زایینی) خودێ کورەک دا مەلا ئلیاسێ خانی و وی ناڤێ کورێ خۆ کره (ئەحمەد).

ئەحمەدی ژیانا خۆ ل باژێرێ بایەزیدێ برە سەری، وی قووناغا زارۆکینییا خۆ ل وێرێ قەتاند، و فەقیاتییا خۆ ل وێرێ و ل چەند جهەکێن دی ژی دەرباس کر، و پشتی هنگی ئەو زڤڕی بایەزیدێ و ل وێرێ بۆ دەمەکی بوو کاتب (مونشی) ل دیوانا میرێ بایەزیدێ، هەر وەسا وی کارێ مەلاتییێ و دەرسدانا فەقییان ژی کر.

د ناڤ بەرهەمێ خانی دا ناڤێن دو میرێن بایەزیدێ ب بەر چاڤێن مە دکەڤن:

یێ ئێکێ: محەمەد بەگێ کورێ بەهلوول بەگێ، ئەوێ ل سالا ۱۰۹۱ مشەختی (۱٦۸۱ ز) مری، و خانی شعرەک ب مرنا وی ڤەهاندی.

یێ دویێ: میرزایێ کورێ عەبدییێ کورێ محەمەد بەگێ ناڤبۆری، و ئەڤە میرێ بایەزیدێ بوو دەمێ خانی مەم و زینا خۆ ڤەهاندی. و خانی د دیباجەیا مەم و زینێ دا مەدحێن ڤی میری دکەت و هندەک گازندەیان ژی ژێ دکەت![1]

---

(۱) سەیدا مەلا عەبدللاهـ ڤارلی، کو ژ مالباتا خانییە، کتێبەک ل دۆر ژین و بەرهەمێ خانی نڤیسییە، گەلەک زانینێن نوی دەربارەی وی و مالباتا وی تێدا هەنە، ئەڤ کتێبە ل بن ناڤێ (دیوان و ژینوارییا ئەحمەدێ خانی) بەلاڤبوویە، و ئەو ل سالا ۲۰۰٤ ل ستەنبۆلێ چاپبوویە.

ئەحمەدێ خانی ل سالا ١١١٩ مشەختی (بەرانبەر ١٧٠٦-١٧٠٧ز) مربوو، و مرنا وی ب ڕستەیا (طار خانی إلى ربه) هاتبوو قەیدکرن، و مرنا وی ل بایەزیدێ بوو، و گۆڕا وی و مەدرەسەیا وی حەتا نوکە ل بایەزیدێ دئاشکەرانە.

## بەرهەمێ خانی یێ شعری:

ل دویڤ وان دەستنڤیسێن گەهشتینە مە، سەیدایێ خانی چار بەرهەم ل پاش خۆ هێلاینە، ئەو ژی ئەڤەنە: نووبارا بچووکان، عەقیدەنامە، مەم و زین، و دیوانا شعران.

### ١- نووبارا بچووکان:

حەتا ئەڤرۆ دئێتە هزرکرن کو (نووبار) ئێکەمین بەرهەمێ شعری یێ ئەحمەدێ خانییە، و وی ب خۆ دیرۆکا دانانا ڤی بەرهەمی بۆ مە تۆمار کرییە، دەمێ ل دووماهییێ دبێژت: ((ئەڤ ڕەنگ دبێژت خانی: ئەگەر تو ب ئیذعانی، بفکرە کیتابا ثانی، د جلدێ ئەووەل دا، ژ جوزوا عاشر، د وەرەقێ چارێ دا، ژ صەفحەئێ دەستێ ڕاستێ، د سطرا ثالث دا، ژ کلمەیا ثانی، بگر تو حەرفا چارێ، تاریخە ژ بۆ نووبارێ)). و ئەڤ تاریخە وەکی ئاشکەرا دبتە: (١٤) هەیڤا (٣) ژ سالا (١٠٩٤) مشەختی، بەرانبەر ١٣ / ٣ / ١٦٨٣ زایینی.

ل دۆر ناڤێ ڤی بەرهەمی خیلاف چێبوویە کانێ ئەو: نووبارە یان ژی نووبهارە؟ و ب هزرا من یا دورست ئەوە ناڤێ ڤی بەرهەمی نووبارە نە، و نیشان ل سەر ڤێ چەندێ ئەڤەنە:

١- کەڤنترین دانەیێن دەسنڤیس ژ ڤێ کتێبێ، کو هندەک ژ وان دزڤرنە دەمەکێ کێمتر ژ سیه سالان پشتی خانی، پەیڤا (نووبار) ل سەر ڤی

بەرهـەمی دانایـە. و د بناخـەیێن ڤـەکۆلینان دا دانـەیا نێزیکتـر بـۆ دەمـێ نڤیسەری ڕاستتر دئێتە دیتن؛ چونکی یا بەرهزر ئەوە کو ئەو پتر یا پاراستی بت ژ دەستێڤەدانان.

٢- بەری پتر ژ سەدسالان ژی ئەڤ ڕاستییە د ناڤ زانا و ڕەوشـەنبیرێن کورد دا یـا بـەلاڤبوو، و باشـترین نیشـان ل سـەر ڤـێ چەنـدێ گۆتنا یووسف ضیاء پاشایێ مەقدسییە ئەوێ د کتێبا خۆ دا (الهدیـة الحمیدیـة) دبێژت: ((ئەحمـەدێ خـانی نـاڤێ وێ کریـیـە نووبـار و عـامی دبێـژن: نووبهـار))[1]، مەعنا: نووبهار نـە ئەو ناڤە یێ خانی ب خۆ ل سەر بەرهەمێ خۆ دانای، بەلکی ئەو ژ لایێ خەلکی ڤە یێ هاتییە گۆتن.

٣- پەیڤا (نووبار) یەعنی: نووبەر، پتر د گەل هندێ دگونجت کـو ئـەڤ بەرهەمە بەرهەمێ خانی یێ ئێکێ بت، هەر وەکی وی دڤێت ب ڤی ناڤی بێژت: ئەڤە بەرێ ئێکێ و یێ نوییێ دارا من یا ئەدەبییە.

خانی ئـەڤ بەرهەمـە وەک فێرکارەک بـۆ زارۆکـێن کرمانجـان دانایـە؛ دا ئەو وان پێ فێری زمانێ عەرەبی بکەت، وەکی ئەو ب خۆ دبێـژت: ((ژ پـاش حەمـد و صـەلەواتان، ئـەڤ چەنـد کەلیمەنـە ژ لوغاتـان، ڤێـک ئێخسـتن ئەحمـەدێ خـانی، نـاڤ نووبـارا بچووکـان دانـی، نـە ژ بـۆ صـاحب رەواجـان، بەلکی ژ بۆ بچووکێد کرمانجان وەکی ژ قورئانێ خلاص بن لازمە ل سەوادێ چاڤناس بـن، دا ب ڤان چەند ڕەشبەلەکان، ل وان طـەبیعەت مەلـەکان، دەرێ زهنێ ڤەبیتن، هەرچی دخوونن زەحمەت نەبیتن)).

---

(١) یوسف ضیاء الدین پاشا الخالدي: الهدیة الحمیدیة فی اللغة الکردیة، اسطنبول ١٣١٠، ص (٢٧٩).

ژ بۆ بەرهەڤکرنا ڤێ دانەیێ ژ (نووبار)ێ مە پالدایە سەر هژمارەکا دانەیێن دەستنڤیس، و یا ژ هەمییان گرنگتر دانەیا مصرییە، ئەوا نوکە ل بن هژمارا (٤٦) د (الخزانة التیموریة) دا ژ (دار الکتب) پاراستی، و هەر چەندە ل دووماهییا دەستنڤیسێ ناڤێ نڤیسەری (ناسخی) و سالا نڤیسینێ (نەسخێ) نەهاتییە بەلێ د سایتێ وەزارەتا ڕەوشەنبیری یا ترکی دا ئیشارەت بۆ ڤێ دەسنڤیسێ هاتییەکرن و کو ناسخێ ڤێ دەستنڤیسێ ئەحمەدێ خانی ب خۆیە[1]، و ژ ڕەنگێ نڤیسینێ دئێتە زانین کو ئەو گەلەک یا کەڤنە، و نێزیکە بێژین چو خەلەتی ژ لایێ کێشێ و پەیڤان د ڤێ نوسخەیێ دا نینن.

دانەیا دی یا گرنگ کو مە پالدایە سەر ژ نڤیسینا موصطەفایێ کوڕێ ئیسماعیلێ کوڕێ موحەممەدێ کوڕێ شەعبانییە، ل سالا ١١٤٨ مشەختی (١٧٣٥ ز) ل باژێڕێ دیاربەکرێ هاتییە نڤیسین، یەعنی: پشتی مرنا خانی ب (٢٩) سالان.

دانەیا سێیێ ژ نڤیسینا عوثمانێ کوڕێ مەلا محەممەدێ کوڕێ مەلا بیازیدێ کوڕێ مەلا حوسێنێ مەلا زادەیە، و ئەو ل سالا ١١٦٦ (١٧٥٣ ز) هاتییە نڤیسین. و تشتێ بەرچاڤ د ڤان هەر سێ دانەیان دا -کو کەڤنترین دانەنە- ئەوە ناڤێ (نووبار) ل سەر کتێبێ هاتییەدانان.

## ٢- عەقیدەنامە:

د پتریا دانەیێن دەستنڤیس دا پشتی فەرهەنگا (نووبارێ) ڤەهینۆکا (عەقیدەنامە) دئێت، و ب هزرا من ئەحمەدێ خانی ئەو دانایە دا بۆ نووبارێ ببتە پاشگۆیەک، یەعنی: وی ئەو ژی هەر بۆ ئارمانجەکا فێرکاری دانایە،

---

(١) وەکی هەڤالێ مە موفید یۆکسەلی ئەم ئاگەهدارکرین.

لەو ب ڕەنگەکێ کورت و سادە وی عەقیدە و بیر و باوەریێن ئیسلامی ل دویڤ ڕێبازا ئەشعەرییان، کو ڕێبازا پترین مەلا و زانایێن کورد بوو ل وی دەمی، ڤەهاندییە.

بۆ ئامادەکرنا ڤێ دانەیێ مە هەر پالدایە سەر وان دەستنڤیسان یێن مە بۆ ئامادەکرنا نووبارێ پالدایە.

## ٣- مەم و زین:

ئەڤ بەرهەمی کو دبتە گۆپیتکا هزر و بیرێن خانی، ل سالا ١١٠٥ مشەختی (١٦٩٣-١٦٩٤ ز) هاتییە دانان دەمێ ژییێ خانی چل و چار سال، وەکی ئەو ب خۆ ڤێ چەندێ ل دووماهییێ ئاشکەرا دکەت، و هەر چەندە مژارا سەرەکی یا ڤی بەرهەمی سەرهاتییا ڤیانا مەم و زینێیە، بەلێ خانی ب شارەزاییەکا زێدە شیایە مەم و زینێ بۆ خۆ بکەتە بەهانە دا گەلەک هزر و بیرێن خۆ یێن جودا بۆ مە ڤەگوهێزت.

بۆ بەرهەڤکرنا ڤێ دانەیێ مە پالدایە سەر هژمارەکا دەستنڤیسان، و گرنگترینێ وان ئەڤ هەردویەنە:

١- دەستنڤیسا مەلا محەمەدێ کوڕێ مەلا سلێمانێ مکوری، ئەوا ل سالا ١١٤٤ مشەختی (بەرانبەر ١٧٣٠-١٧٣١ زایینی) هاتییە نڤیسین، یەعنی: پشتی ڤەهاندنا مەم و زینێ ب (٣٩) سالان، و پشتی مرنا خانی ب (٢٥) سالان.

ئەڤ دەستنڤیسە کەڤنترین دانەیا مەم و زینێیە حەتا نوکە گەهشتییە مە. و ئەو ل گوندێ شێخ عومەر ئەوێ سەر ب خامۆرێ ڤە هاتییە نڤیسین، و خامۆر دکەفتە باشوورێ باژێرێ ئاگری یێ نوکە، نڤیسەر ل پێشییا دەستنڤیسا خۆ دبێژت: (هذا کتاب مم و زین لمولانا أحمد أفندي خاني

رحمة الله عليه) و بەلکی ژ گۆتنا وی: (مەولانا) بێتە وەرگرتن کو خانی سەیدایێ وی بت! مەعنا: ژ لایێ جهی و دەمی ڤە ناسخێ ڤێ دانەیێ گەلەک یێ نێزیکی خانی بوو.

٢- دەستنڤیسا عەزیزێ کورێ شیربارێ مامزێدی، ئەوا ل هەیڤا رەجەبێ ژ سالا ١١٦٥ مشەختی (گولانا سالا ١٧٥٢ ز) هاتییە نڤیسین، چل و شەش سالان پشتی مرنا ئەحمەدێ خانی، و گرنگییا ڤێ دانەیێ ژی ژ هندێ دئێت ناسخێ وێ ژ ئویخاجا (مامزێدیانە) کو پشکەکە ژ عەشیرەتا (زیلان) ئەوا ل بایەزید و دەور و بەرێن وێ بەلاڤ، مەعنا: ناسخێ ڤێ دانەیێ ژی ژ لایێ دەم و جهـ و لەهجێ ڤە یێ نێزیکی خانی بوویە.

## ٤- دیوانا خانی:

گەلەک شعرێن ئەحمەدێ خانی یێن جودا جودا هەبووینە وی ئەو د چەند دەلیڤە و هلکەفتان دا ڤەهاندبوون، و حەتا نوکە ئەم ب پشتراستی زانین کانێ خانی د ژیانا خۆ دا شعرێن خۆ د دیوانەکا تایبەت دا کۆم کربوون یان نە.. تشتێ ئەم دزانین ئەوە ئەڤرۆ چو دەستنڤیسێن کەڤن ب ناڤێ دیوانا خانی د دەستێن مە دا نینن، هەر چەندە گەلەک دەستنڤیس هنە هژمارەکا شعرێن خانی تێدا هاتینە قەیدکرن.

د ڤێ کتێبێ دا ئەو شعرێن د دەستنڤیسێن کەڤن دا بۆ خانی هاتینە پالدان و ب بەر چاڤێن مە کەفتین مە بەرهەڤکرینە، و ل دویڤ قافییێ ب رێز کرینە و وەک دیوانەکێ ل بەر دەستێ خواندەڤانان دانینە، د گەل هژمارەکا وان شعرێن (بەرگومان) ژی یێن هندەک دەستنڤیسان بۆ خانی پالداین، بێی کو ئەڤ پالدانە ل نک مە مسۆگەر بت.

ژ گرنگترین وان دەستنڤیسێن مە ل ڤێرێ پالدایە سەر:

١- دەستنڤیسا شاعر و زانایێ ناڤدار مەلا خەلیلێ سێرتی ئەوا ل سالا ١١٩٣ مشەختی (١٧٧٩ ز) ل مەدرەسەیا قوبەهان (قوبا) ل ئامێدییێ هاتییە نڤیسین.

٢- دەستنڤیسا دیوانا شێخ ئەحمەدێ کورێ شەرەفێ شاوری یێ ناڤدار ب شێخ ئەحمەدێ فەقیرێ گوندشێخی ئەوا ب دەستێ شێخ ئەحمەدی ب خۆ ل سالا ١٢٣٧ مشەختی (١٨٢٢ ز) هاتییە نڤیسین.

٣- دەستنڤیسا ئیبراهیمێ کورێ سەیید ئەحمەدێ بێسکی، و دیرۆکا نڤیسینێ ئاشکەرا نینە.

٤- دەستنڤیسا خەلیلێ بازیدی. و دیرۆکا نڤیسینێ گەلەک یا ئاشکەرا نینە، ب تنێ کسەکی ل سەر نڤیسییە (١٨٤٦ م) کو دکەفتە بەرانبەر سالا ١٢٦٢ مشەختی.

٥- دەستنڤیسا خەلیلێ موذنب (گونەهکار) ل ١٧ی رەجەبا سالا ١٣٢٠ مشەختی (بەرانبەر ١٩٠٢/١٠/١٩ ز) هاتییە نڤیسین.

هەژییە بێژین: ئەڤ هەر چار بەرهەمێن سەیدایێ خانی بەری نوکە مە د چار کتێبێن جودا دا بەلاڤکربوون، و ل ڤێرێ مە ئەو هەمی د ئێک بەرگی دا کۆمکرن، پشتی مە ئەو ژ دەهمەن و جوداهییێن د ناڤبەرا دانەیان دا ڤالا کرین؛ دا ب رەنگەکێ ساناهیتر مفا ژێ بێتە دیتن.

تەحسین دۆسکی

دهۆک ١٤٣٩/٤/١٣ مشەختی

# نووبارا بچووکان

بسم الله الرحمن الرحيم

مەبدەئێ هەر علمەکی ناڤێ عليم

حەمد و ثەناء و شوکرانی، ژ بۆ وی خالق و رەحمانی،
کو فەصاحەت و بەیان دایە لسانی، لسان دایە ئنسانی،
هندی صەلەواتن هەمی، ل رەسوولێ مە ئێ ئوممی،
کو بوونە پەیرەوێد وی، عەرەب و عەجەم و کرمانج و رۆمی.
ژ پاش حەمد و صەلەواتان، ئەڤ چەند کەلیمەنە ژ لوغاتان،
ڤێک ئێخستن ئەحمەدێ خانی، ناڤ نووبارا بچووکان دانی،
نە ژ بۆ صاحب رەواجان، بەلکی ژ بۆ بچووکێد کرمانجان،
وەکی ژ قورئانێ خلاص بن، لازمە ل سەوادێ[١] چاڤناس بن،
دا ب ڤان چەند ڕەشبەلەکان، ل وان طەبیعەت مەلەکان،
دەرێ زهنێ ڤەبیتن، هەرچی دخوونن زەحمەت نەبیتن، ئومێدە
ژ طفالان، کو مە عەمەل بەطالان، د وەقتێ دەور و دەرسان،
بکەنە ئنعام و ئحسان، ب دوعان ڤە بیر بینن، فاتحان ژ مە
ڕا بخوینن.

(١) سەواد، مەخسەد پێ نڤیسینە.

## القطعة في بحر
## الهزج المكفوف المحذوف

حەتتا تو دەور و دەرسان نەکەی تـەکرار ومەصرووف

د دونیـایێ تـو نـابی نـە مەشـهوور و نـە مـەعرووف

(مَفـــــاعِيْلُنْ فَعُـــــوْلُنْ مَفـــــاعِيْلُنْ فَعُـــــوْلُنْ)

چ خوەش وەزنە ببیتن هەزەج مـەکفووف و مەحذووف

خـــودێ (اللهَ)، قاصـــد (رَسُـــوْلَ)، ئـــەی خـــودێزان

خەلیفـە چـار و هـەم چـار ئیمـامن ئـەی موسـلمان

ژ چـاران یێـک ئەبابـەکر، عومـەر، عوثمانـە ئـێ دی

عەلییـە بـێ تەکـەللوف کـو بـوو خاتـەم ژ بـۆ وان

دڤێـــتن تـــو بزانـــی ب دل ناڤێـــد ئیمامـــان

موحەممـەد مالـک ئەحمـەد ئـەوێ دیتـر کـە نوعمـان

موبەششەر بوونە دەهـ کەس ژ ئەصحابان ب تـەعیین

کـو دێ بچنـە بەحشـتێ خـودێ مزگینـی دا وان

ژ ئـەووەل بـوو عوبەیـدە د گـەل هـەر چـار یـاران،

سـەعید و سـەعد و طـەلحـە زوبـەیر و عـبدرەحمان

ل مـه فەرضـە بـزانین رەسـوولێ خـوە ب تـەحقیق

ب مەولـد هـەم ب مەدفـەن، بناسـین دا و بابـان[1]

د مـەککێ بـوو ژ دایـێ، مەدینـە بوویـە مەدفـەن

وی عەبدللاهـــە والـــد، ئەمینـــە والـــدە بـزان

ژ دونیایێ کو چوو وی عومر بوو شێست و سێ سال

ژ شێسـتان پێنجەهـ و سێ بـوارن د مەککـەیێ دان

د چـل سـالی رسـالەت ژ بـۆ ڕا هاتـە خـوارێ

د بیسـت و سـێ دمـایی ژ بـۆ نـازل بـوو قورئـان

جـەمیعێ ئوممـەتا وی ب لوطفـا خـوە ئیلاهـی

ژ دونیـــایێ ڤرێکـــی ب قورئـــان و ب ئیمـــان

حـەتتا ئـەو شەهسـوار بێـت و گۆیـا ئوممـەتا خـوە

ژ مەیـدانا حسـابێ هـەلینت شـوبهی چووکـــان

---

(١) د هندەک دانەیان دا هاتییە: عەلی چارک حسەن دو موحەممەد سێنە ئەی جان.

پاشی ئەڤ مالکە ژی د دویڤ دا هاتییە:

نیمامێ دی حوسـەینـە د گـەل مووسا و جەعفەر

ئـەڤن بالجملە بـێ شـەک بزانـی قەنج ئیمامان

ژ بۆ مە چارێ دیـتـر هەیـیـن صاحـب مەذاهب

موحەممەد و مالک و ئەحمەد ئەوێ دیتر کە نوعمان

و ئاشکەرایە کو ئەڤ مالکە ژ لایێ هندەک شیعەیان ڤە د چێکرینە، و خانی ئەو نەگۆتینە!

## القطعة في بحر
## الرجز المطوي المخبون

پەردە كو ڕابتن ژ بەر عارضى دلستانە خوەش
دل ژ غەمان كو بێتە دەر بولبولى گولستانە خوەش
(مُفْتَعِلُنْ مَفَاعِلُنْ مُفْتَعِلُنْ مَفَاعِلُنْ)
بەحرێ رەجەز كو خەبن و طەى گەر ببتن رەوانە خوەش

(زَوْج) و (رَجُل) چ مێر، و ژن (مَرْأة)ە (زَوْجَة)ە (نِسَا)
(والِدَ) باب، و (والِدة) دا، و (شَقيق) و (أَخ) برا
(ابن) كوڕە، و (بِنت) كچە، (صهر) خەزوورە، مامە (عَم)
(عَمَّة) مەتە، (عَمامَة) شاش، (جَدَّة) چيە؟ خوە پيرەدا
(أجْرَة) كرێ، و (رَهن) گەرەو، (خَسْر) زيانە، (كِذْب) درەو
(بَيْع) فرۆهتنە، (عَطَا) دان، و كرين چيە؟ (شِرا)
(مَنْكِب) و (عِطْفه) هەردو مل (بال) و (ضَمير) و (قَلب) دل
(جَذل) و (فَرَح) چ شاهينە، (مَوت) مرن، گرين (بُكا)
(ثَوْر) و (حِمار) گا و كەرە، بان چيە؟ (سَقف)، و (بَاب) دەرە
(جَبْهَة) ئەنى، و (فَم) دەڤە، (لِحيَة) رهن، خەبەر (نَبا)

(حِنْطَة) گەنم، (شَعِيْر) جەهە، (سُلْت) شلێلە، (كَرم) رەزە

خورمە (رُطَب)، (عِنَب) ترى، (بِعْ) بفرۆش، (ثَمَن) بها

شيرە (لَبَن)، (غَنَم) پەزە، (رائِب) ماست، و (زُبْدَة) توو

(صوفَ) هرى و (ريش) پەرە (أصْفَرَ) زەر كەفى (قَبا)

(صَرْصَر) و (ريْحَ) با بزان، تۆز و (عَجاج) و (نَقعه) هەم

(غَبْرَه) و (هَيْج) و (هَبوه) و (فَضْطَلُ) و (قَتْرَه) و (هَبَا)

(جَائِيه) ترس، و (صَاعِقه) دەنگ و برووسك، و بێهشى

(لَوْث)، و (لِوا) عەلامەتن، (بَثّ) غەمن، هەم ئەشكەرا

(خَرْص) درەو، (مَغيض) دەو، (بَط) چيە قاز، و (قَبْج) كەو

(شَطّ) كنارە، (نَهَرَ) جوو، (لَوح) و (سُكاك) و (جَوْ) هەوا

(عَسْجَد) و (عَيْن) و (نَضْرَ) زێر (فِضّه، لُجين) و (نُقْرَ) زيڤ

سفر چيە؟ (مَفْرَق)ە، (نُحاس) پاخرە، هەم (رصاص) قەلا

(رُبَّ) و (رُبَّما) گەلەك، (ثَمَّ) ل وێ، (هُنا) ل ئێر

(لا) نە (لَنا) ژ بۆ مە را، (إنْ) ئەگەرە (لِمَ) چرا

(أيْنَ) ل كۆ، و (كَيْفَ) كو، (تَحْتَ) ل بن، (عَلى) ل سەر

(ثُمَّ) ژ پاشى، وێ بزان، (أنْتَ) تو، (لِي) ژ بۆ م را

## القطعة في بحر
## الرمل المحذوف

عارفێ کو ب قەنجی مەعرووف بت

دێ حەلیم و صابر و مەوقووف بت

(فَــــاعِلاتُن فَــــاعِلاتُن فَــــاعِلاتْ)

وەزن ئەڤە حینا رەمەل مەحذووف بت

(ظِـل) و (تَبْـع) و (فَيء) سهنه، (شَـمْس)ه طـاف

دەشـتـه (بَيْـدا)، (مَشي) چوونـه، (خُطْـوَه) گـاف

(نَـار)ه ئـاگر، (حَـرّ)ه گـەرمی، (بَـرد)ه سـار

(ثَلْج)ه بـەرف، و (مـاء) و (سَلْسَـل) هـەردو ئـاف

(وَابِـل) و (وَسْـمِي) و (مِـدْرَار) و (مَطَـر)

(طَـلّ) و (غَيث) و (رِهْـم)ه بـاران، (ئَـاد) خوناف

(رِجـل)ه پێـی، و (رُكْبَـه) ئـەژنوو، (بَطـن)ه زک

(صَدْر)ه سینگ، و (جِيْد)ه ئسطوو، (عَيْن)ه چاف

(فَخْـذ)ه ڕان، و (ضِرْس) ددانـه، (شَـفَه) لێـڤ

(ظَهْـر)ه پشـت، و (سُرّه) ناڤکـه، (جَـوف)ه نـاف

(كِبْـد) جـەرگ، و (كِلْيَـه) گـورچى، (كُذْنَـه) بـەز

رِووڤينـــه (أمْعَـــا)، (مَـــراره) هـــەم زەراف

(ضَـيْق)ە تـەنگى، (قِصْرـ)ە كـورتى، (طُـول) درێژ

(غِلْظَـــة) و (دِقَّـــة) ســـتوورى هـــەم زراف

(قِـدْر)ە ديـز، و (قَصْـعَه) كاسـه، (خُبْـز)ە نـان

(لحـم)ە گۆشـت، و (طَـبْخ)ە پـاهتن، (نَيْء)ە خاڤ

(شَـبْع)ە تێـرى، (عَطْـش)ە تێهنـى، (جُـوْع)ە بـرس

(صَـيْحَه) گـازى، (صَـوْت)ە دەنـگ و (اسْـم)ە نـاڤ

## القطعة في بحر
## الرجز المثمن السالم

گەر دێ تە مەقصوودەک هەبی لازم دڤێ لێ بی ب لەز

خاسما تە مەعبوودەک هەبی د ئەمرێ وی دا دائم بیەز

(مُسْتَفْعِلُنْ مُسْتَفْعِلُنْ مُسْتَفْعِلُنْ مُسْتَفْعِلُنْ)

سالم موثەممەن هەر ئەڤە ئەی طالبێ بەحرا رەجەز

هاتم (أتيتُ)، (آتي) تێم، وێ هات (أتى)، (إيتِ) وەرە

(آتيتُ) من دا، (خُذْ) بگر، (ارْجِعْ) ڤەگەڕ، (اذْهَبْ) هەرە

(اجْعَلْ) بگێڕ، (اسْحَقْ) بهێر، (اضْرِبْ) بقوت، (انظُرْ) بنێر

(اقْرَأ) بخوون، (اعْلَمْ) بزان، (إيمان) ب مەعنا باوەرە

(مِصْر) و (بَلَد) باژێرن ئەو، (دِرْهَم) دراڤ، ئەرمووش (حَرِيْر)

(مَانِح) سەخی، (سائِل) رەجووکارە، (شَفَاعَة) مەهدەرە

(إمْلاق) خزانییە، (غِنَى) مالداری، و هەم ئستران

(إطْلاق)ە بەردان، (طَلْق)ە زان، (زَوْج) و (وِتر) جوێت و فەرە

(أكْيَس) مرۆڤێ تیژ فەهم، (أصْمَع) مرۆڤێ گوهـ بچووک

(أكْشَم) مرۆڤێ گوهـ بری، (أصْلَح) وەکی (أيْهَم) کەرە

(أَكْحَل) مرۆڤێ چاڤ ب کل، (أَشْهَل) مرۆڤێ چاڤ بەلەک

(أَشْقَر) مرۆڤێ چاڤ هشین، ڕەنگێ گەنم گۆن (أَسْمَر)ە

(أَمْرَد) روال، (أَقْرَع) ب موو، (أَقْرَع) کەچەل، (أَمْلَس) هلوو

(أَصْغَر) بچووک، (أَكْبَر) مەزن، (سَيِّد، حُلاحِل) میرسەرە

(أم) ماکە، (أُمُّ الشَّمْلة) ڕۆژ، (أُمُّ النُّجُوم)ە ئاسمان

(أُمُّ الخَبَائِث، خَمْرە) مەی، (مُدْمِن) مودامی مەیخوەرە

(أُمُّ الفَضائِل) عالمی، (أُمُّ الرَّذائِل) جاهلی

(أُمُّ القُرى، أُمُّ البِلاد) کەعبە، (نَبِي) پێغەمبەرە

## القطعة في بحر
## الرجز المرفل

هەرچی ب علمی جەهل کر موبەددەل

صفرێ خوە وی ب زێڕ کر موکەللەل

(مُسْـــــتَفْعِلاتُنْ مُسْـــــتَفْعِلاتُنْ)

بەحرا رەجەز بوو ج خوەش مورەففەل

(أَخْضَـــر) ج؟ کەسکە، (أَحْمَـر) ج؟ سۆرە

(أَزْرَق) هشـینە، (جَـوْرَب) ج؟ گـۆرە

(طَـوْد) و (جَبَـل، طُـوْر) هەر سێ چیانـە

(وادي) نەوالـە، (حُفْـــرة) ج؟ کـۆرە

(مَرْسُـــول) هنـاری، (مَـدْفُون) ڤەشـاری

(مَجْبُـــور)ە بێگـاڤ، (مُجْــبَرَ) ب زۆرە

(أَبْکَـــم) ج؟ لالـە، (أَعْـرَج) ج؟ لەنگـە

یەکچاڤـە (أَعْـوَر)، (أَکْمَـە) خـوە کۆرە

(مَقْتُـول)ە کوشـتی، (مَغْسُـول)ە شوشـتی

(مَیِّـــت) مـرارە، (مَرْقَـد) خـوە گـۆڕە

## القطعة في بحر
## المضارع الأخرب

ئێ توی کو کبر دائم تە ژ بۆی خوە کریە مەرکەب

ئەووەل تو (بێ) بکە (یێ) پاشی بگێرە مەرکەب!

(مَفْعُـــوْلُ فَـــاعِلاتُنْ مَفْعُـــوْلُ فَـــاعِلاتُنْ)

خوەش وەزنە بێ مەلالە گەر بت موضارع ئەخرەب

(رُمّـــان) هنـــار، و (جُلْنَـــار) گـــێلاس، و (تِـــيْن) هژیـــرە

(قِثّـــاء) خیـــار، و (دوفَـــض) پیڤـــاز، و (ثُـــوْم) سیـــرە

(تُفّـــاح)ە سێڤ، و (سمســـم) کـــونجی، و بهـــ (سَـــفَرْجَل)

(دُبّـــاء) و (قَـــرْع) و (يَقْطـــيْن) کونـدک، (جُـــبن) پـەنیرە

پۆخین (سَويْق، أَقِّط) کەشک هەنبان (جِراب) و گرِ (جُـرْب)

(مَشْـــحون) تـەژی، و (خَـــاوي) ڤـالا، و (رِسْـــل) شـیرە

(مُـــزْن) و (سَـحَاب) و (عَـارِض، غَـيْم) و (غَمَامـه) عـەورن

(قَمْقَـام) و (يَـمّ) بـەحرن، (صَمْصَـام) و (حُسَـامِ) شـیرە

(بَيْـــدَا، فَـــلاة) و (سَبْسَـــب)، (فَيْفَـــاء) و (بَـــدْو) دەشـــتن

(يَنْبـــوع) و (عَـــيْن)ە کـــاهنی، (جُـــبّ) و (قَلیـــب) بیـــرە

(ابنُ السَّبيل) رێوی، هەڤرێ (رَفیق) و (صَاحِب)

(مُزْجَاة) هندک، و پورِ (جَمّ) و (لُبَد) کەثیره

(عَبْد) و (رَقیق)ه کۆله، (حِرْفَة، صَنیْعَه) پیشه

(جَاهِل) نەزان، و زانا (عَلّام) و هەم (خَبِیْر)ه

(عَوْجان، حَنیَّه، صَفرا، قَوْس) و (قِسي) کەڤانن

(وَفْض) و (کِنَانَه) کیشک، (نَبْل) و (نِشاب) تیره

(جَیش) و (حَشَم) چ؟ لەشکەر، (أسْرا) ب شەڤ ل رێ بر

(بَاسِل) جوامێر، و نجده (سَرِّیَة)، (قَیل) میره

# القطعة في بحر
# الرمل المقصور المثمن

شێخ و صووفیتی کەرامەت علمە و خوەندن عەمەل

خەلوەتە حوجرە طەریقا تە شەریعەت بێ خەلەل

(فَاعِلاتُنْ فَاعِلاتُنْ فَاعِلاتُنْ فَاعِلاتْ)

خوەش تو ڤێ بەحرێ بخوون لەورا کو خوەش چوونە رەمەل

(شَيْخ) رسپی، (شَيْب) پیری، (شَاب) جوان، و (شَأن)ە حال

(مُرْوَة)ە مێرینی، لاوینی (فُتُوَّة)، (كَهْل)ە کال

(مَقت)ە بوغض و(بَعْض)ە هندک (بُضْع)ە فەرج و(بِضع)ە چەند

(سَفْك) و(سَكْب) و(صَبّ)ە رهتن، (قَتْل)ە کوشتن شەڕ (قِتَال)

(رُعْب و رَهْب و هَوْل و وَهْل و فَشْل و وَجْل و رَوْع)ە ترس

(رَبع)ە ئۆرگە[1]، (رَج) هژاندن، (فَجّ)ە ڕێ، پرسین (سُؤال)

(كَوْن) بوون، و (ظَعْن) چوون، و (شَق) کەلاشتن، (دَق) قوتان

(دَوْحه) دار، و (رَوْح)ە راحەت، (رَوْضَة) چیمەن، (رَس)ە چال

---

(١) د دەهمەنا دانەیەکێ دا، ل بن پەیڤا (اورگە) هاتییە: (أی وسط) ئانکو: ڕامانا ڤێ پەیڤێ (نیڤ، یان: ناڤە) و د دانەیەکێ دا دا ل شوینا ڤان هەردو پەیڤان هاتییە: (ربع) ئەو ڕەنگە، ئانکو: ربع ژی هەر ب ڕامانا ترسە.

(بَقّ)ە پێشوو، (وَجْع)ە ئێش، و (رَعْشَة) لەرزین، دەردە (دَاء)

(دِفء)ە گەرمی، (بُعْد)ە دووری، (بَغْل)ە هێستر، (نَعْل)ە نال

(شَیْح)ە پووێژان، (حَبَق) پوونگە، و (حَزْمَل)ە سویەند

(قِطّ)ە کاغەد، (قُطْن)ە پەنبوو، (وِقْر)ە بار، و (لُد) جەوال

(مَنْجَنون) گەردوون، و (مَجْنون) دین، و (مَاجِن) بێ حەیا

(خِزي)ە رسوائی، و (خِذلان) شەرمکری، شەرم (انفِعَال)

(صَرْح)ە کۆشک، (صَرْخَة، صِرّة) گازی، و (خُلَّة) ئەڤین

(خِلّ)ە یار، و (خَلْوه) تەنها، (حَلْو)ە شرین، (مُرّ)ە طال

(مِرَّه) قووەت، (وَمْق)ە موحبەت، (أُنْس) و (أُلْفَة) هۆگری

(غُمْر) و (بَلْد) و (كَلْت) کەودەن (بَعْل) مێر، و گان (بِعَال)

(ضَرّه) هەوی و (ضِغْن)ە کین و (ضِغث)ە تێکل (ظبي)ە ئاسک

(ضَجّ) گازی، (ضَلَّ) ونداببوون، و ونداببوویی (ضَال)

(لَهْجَه) ئەزمان (لُهجه) تێشت و (مَهْج)ە ڕووبی (مُهجه) رووح

(بَهْجَه، حُسْن) و شاهی و ژێهاتن، و (بَهرج) بەطال

(خَمْل)ە ریشی، (خَبْط)ە لێدان، (خَمْط)ە دارا ب ستری

(عَجْوه) خورمە، گورزە (حُزمە)، (عُرْوه) قولپ، و (عِنْدَ) بال

(طَلْعَة) و (وَجْه) و (مُحَيَّا) و (عَارِض) و (مَنْظَر) چ؟ ڕوو

(أَيْكه) بیشە، تەخت (أَرِيكَه)، (زَيْغ)ە مەیل، و (بَيْت)ە مال

(حَامــل)ە بــاردار، و (حُـــبْلى) ئــاڤس، و قــوّرغ (حَـمِـــيِ)

(حِـمَــى) پاوان (حُـلِي) خشر و (حِلْيـه) زینەت (حَـوْل)ە سال

(قاطِيــه، جُملَــه) و (كُــلّ) و (كافّــه) هـەمی، (كَــفّ) مـەنع

(صَدّ) ئەو رەنگ (لَوْن)ە رەنـگ و (هَمْسه) دەنـگ و (بُكْم)ە لال

(مَــرَّه، كــرَّه، تــاره) جــارەک، (بَــكّ) و (دَكّ) و (صَــكّ) كوتــان

(بُنْيــه، بَكّــه) کەعبــە، پالگەهـ (مُتَّكَــأ)، و (تكيــه) پــال

## القطعة في بحر
## البسيط المطوي

گەر تە دڤێتن ببی میر و سەر و موعتەبەر
کذب و خیلافێ مەبێژ گەر تە دکن کەر ب کەر
(مُفْــــتَعِلُنْ فَـــاعِلُنْ مُفْــــتَعِلُنْ فَـــاعِلُنْ)
مەطویە بەحرا بەسیط لێ بکە جارەک نەظەر

(شَــمْل) بەلاڤبوونــە هــەم ڤێککەتنــە، (شَــمْلَە) بــەر
(زَربیــە) مــافووره هــەم (طَنْفَســە) ئــەی بــا خەبــەر
(قَعْــبَرِي) و(عَبْقَــري) بــێ طــەب وطەبعــەت خوەشــن
(قَفْقَــف) و (قَرْقَــف) مــەین، و (کــوزە، فَخــار)ە جــەرِ
(حَــظ) و(خَــلاق) و (نَصــیْب، مَقْسَــمە) و (حُصَّــە) پــار
(فَصْم)ە برین (صَرْم)ە ژێ (کَسف) و وسان (قِطْعە) کەر
(هَــرْب) و (هَزیْمَــة) رەڤین، (قَــرْح) و (جَراحَــة) بــرین
(ضِدّ) و (عَدو) دژمنن، (حَــرْب) و(وَغــی) هەردو شەرِ
(زُخْــزِحَ) دووربــوویی بــوو، (أزْلَــفَ) ضــددێ ویــە
(أفْلَحَ) گەریا خەلاص، (صَــلْد)ە قەوی، (صَــخْر)ە بەر

(حِنْث) و (جُناح) و (حَرَج، وِزْر) و (وَبَال) و (ذُنُوب)

(إِثْم)ە گونەھ (غَيْظ)ە کەرب (کُرْب) غەمن (رأس)ە سەر

(إِرْب) و (وَطَر، احتياج) هەوجەیی، هیڤی (أَمَل)

(سَمْع)ە بهیستن، (بَصَر) دیتن، و فەکرین (نَظَر)

هیڤی نەمایی کیە؟ (مُبْلِس) و (آيِس، قَنُوط)

ئاسن و پیلا چنە؟ هەردو (أنيث) و (ذَكَر)

(أَقْبَلَ) بەردا، وەکی (أَدْبَرَ) پشتدا، (قُبُل)

پێشی، و پاشی (دُبُر)، (أُذُن) گوھ، (أطرش)ە کەرِ

(ذَوْب)ە بهاتن، (ذَنَب) دووڤە، براشتن (شَوي)

(شَاة)ە پەز، و (ضَأن)ە مەھ، (مَعْز)ە بزن، (هَجْمه)ە کەر

(بَيْضة) هێکە و (مَلْح) خویێ، (مَاح)ە سپی، (مُح) زەرک

(حَيّ) خوەش، و(حَيَّه) مار، (جُحْر) کون، و بەر (حَجَر)

(تُرْب) و (تُراب) و (سَماد، رَمْس) و (رُغَام) و (سَفاد)

(عَفَر) و (بَرا) و (ثَرى) ئاخن، و (صَفْوان)ە بەر

(خُرص)ە گوهار، و (سِوار) بازن، و (راكِب) سوار

(راجِل) و (ماشي) پەیا، (مَنْطِقه، مِنْطَق) کەمەر

(مِرْفَقه) و (مُسْنَد)ە پالگەھە، (مَعْجَر) گەلاج

(مِقْنَعه) و (مِقْرَمه) مەھرەمە، و (هامه) سەر

(تِـبْن) چ؟ کـا، و گیـا (عُشْــب) و (كَـلأ) و (حَشـيش)
(غُصْـن) و (أفـانين)ه طـا، تـازه (طَـري)، (رَطْـب) تـەر
(عِرْق)ه رِەھ، و(فَرْع)ه چق، بەلگـه (وَرَق)، (بَـذر) تـۆف
داره (شَـجَر)، (قَطْـف)ه بـەر، فێقیـه (طَلْـع) و (ثَمَـر)

# القطعة في بحر
# الهزج الأخرب المثمن

هەرچی کو ژ دونیایێ بەرداشتە دامەن بوو

بێ شوبهە د نێڤ عامێ ئەفراشتە گەردەن بوو

(مَفْعُـــولُ مَفَـــاعِيْلُنْ مَفْعُـــولُ مَفَـــاعِيْلُنْ)

وەزنا هەزەجا ئەخرەب ئەڤ ڕەنگە موثەممەن بوو

(مَربـوط)ە وەکـی (مَعْقـود)، (مَعْقـول)ە گرێـدایی

(مَكْتـوم)ە وەکـی (مَكْنـون)، (مَخْبـون)ە ڤەشێرایی

(مِشْکاة)ە کولـەک، (مِرْآة) نەینیکە، چرا (مِصْباح)

(وَهَـــاج) و (مُنَـــوّر) هـەم (دُرّي) ب روهنـایی

(مَنْشـور)ە وەکـی (مَنْشـور)، (مَبْثُـوث)ە بـەلاڤبوویی

(قِسْـطاط) تەرازوویـە، (مَـوزون) چیـە؟ کێشـایی

(مَـوْؤدە) کـەچا هێـژ خـوەش داینـایی د نێـڤ قـەبرێ

(مَوْقـوذە) ب دارکوشـتی، (مَـتْروك)ە ل جهـ مـایی

(نَضَّـــاختانِ) هـــەردو وێ هەلدکـــەلن ژ ئـــاڤێ

(مُـــدْهامَّتانِ) هـــەردو ڕەشـبوونە پـوڕ ئاڤـدایی

(ذَاهـب) چيـه؟ ئـێ چوويی، (مُسْـتَقْبَل)ە ئـێ بێـتن

(مَاضي) چيه؟ ئێ بۆری، (بَـاقي) چيـه؟ ئـێ مـايی

(أَضْغاث)ە وەکی (أَمْشاج) تێکەلبوونە، خەون ئەحلام

(مُزَّمِّـل) و (مُـدَّثِّر) ئـێ جـل د خـوە وەردایـی

(أَسْـفار) و (زُبُـر) هـەردو جـەمعێ د کتێبـانن

(مَرقـوم)ە وەکـی (مَکْتـوب)، (مَزْبـور)ە نڤیسـایی

## القطعة في بحر
## الرجز المطوي

گەر تە دڤێتن كو بەرابەر نەبتن كەس ب تە ڕا

علمی بخوون هەم عەمەلی تو بكە صنعەت ژ خوە ڕا

(مُفْـــــتَعِلُنْ مُفْـــــتَعِلُنْ مُفْـــــتَعِلُنْ مُفْـــــتَعِلُنْ)

ئـەڤ رەجـەزا مەطويـە دا قـەنج بزانـی تـو بـرا

(فُلْـك)ە گـەمی، (سُـلْك) ل ڕێ چوونـە، (ضِـيا) روهنـی بـزان

(شَهْر)ە مەهـ، و (لَيْل) شەڤە، و (سِفله) گەدا، (أَبْلَـه) نـەزان

(عِشْق) و (مَحَبَّة) چ؟ ئـەڤين، (بُغـض) و (عَـداوة) چ؟ نـەڤين

(انْهَزَمـــوا) جوملـە رِەڤـين، (إِخْتَلَســـوا) يـەعنی: رِەڤـان

(جَوْشَن) و (دِرْع) هەردو زرهـ، (جُنَّة) و (تِرْس) هەردو مەطـال

(صَارِم) و (سَيْف) هەردونە شير (سَهْم) و (قِسِي) تير و كەڤان

تەفشوو (قَدوم)، (دُلْـب) چنار، (سَكْنَه) و (مِجْفَر) چ؟ مكـار

(مِلْزَم) و (خَـرك) هـەردو مشـار، (قَطْـع)ە برين، (سـنّ)ە ددان

(إِبْـل) و (بَعِـيْر، عَـيْس) و (جَمَـل، نَاقـە، جَمـاز)ە دەڤەنـە

(حِجْر)ە مەهين هـەم (عَقِل)ە (مُهـر)ە كوری هەسپە (حِصَـان)

(عِجْل) و (حَمَل) گۆلک وبەرخ (جَدْي) و (عَنَاق) هەردونە کار

(سَمْن) و (سَمين) ڕوون و قەلەو (شَحم) بەزە (ضِرْع)ە گوهان

(مَرْصَد) و (مِنْهاج) و (طَرِيق) ڕێنە، و (مَرْصُوص)ە قەوی

(عَالِي) و (سَامي) چ؟ بلند، (مَالك) و (صَاحب) چ؟ خودان

# القطعة في بحر
# السريع المطوي

هەرچی کەسێ علمەکێ قەنج خوەندیە

دەولەتـە گـەر وی ب ئەصـل زانیـە

(مُفْـــتَعِلُنْ مُفْـــتَعِلُنْ فَـــاعِلُنْ)

بەحرا سەریعە و چ خوەش مەطویە

(مَكَّـــە، مَدْيْنـــە) مەدینـە چنـە؟ ئـەو (قَرْيَتـــان)

رۆژ و هـــەییڤ هـــەردو چنـــە؟ (زَبْرَقـــان)

(شَـــهْد) و (عَسَـــل) هـــەردو چنـــە؟ هنگڤـــین

(أري) و (سِـنون)[1] و (ضَرَب) ئـەو ژی وسـان

(عَضْـــب) و (عَصَـــب) هـەردو چنـە؟ شـیر و پـەی

شـــیر و قەلـــەم هـــەردو چنـــە؟ (أَقْطَعـــان)

(شَـــارق) و (بَیضـــا) چنـــە؟ ئـــەو هـــەردو رۆژ

مـــەغرب و مەشـــرق چنـــە؟ ئـــەو (خافِقـــان)

---

(١) د دانەیێن دەسنڤیس دا ب ڤی رەنگی هاتییە، بەلێ د کتێبا (لسان العرب) دا هاتییە: (سنوت) ب رامانا هنگڤین دئێت.. لەو دبت د بنیات دا (سنوت) بت.

(شَــمْس) و (قَمَــــر) رۆژ و هــەییڤن بــرا

رۆژ و هــەییڤ هــەردو چنـــه؟ (أَزْهَـــران)

(أَيْسَرـــ) و (يُسْرــى) چنـه ئـەو هـەردو چـەپ

راســت چيــه؟ (أَيْمَـــن)ه و (يُمْنـــى) بـزان

(حِلْــف) و (يَمْــين) و (قَسَــم)ن جوملـه سـووند

ئيمنـــى و عـــەدل چنـــه؟ (أَفْضَـــلان)

(ذِئْــب) و (غُــراب) هـەردو چنـه؟ گـورگ و قـرِ

گــورگ و قــژک هــەردو چنــه؟ (أَصْرَمــان)

(قَسْــوَره) و (ضَــيْغَم) و (دِلْهَــاث)ه شـێر

(حَــارث) و (لَيْــث) و (أَسَــد) ئـەو ژی وسـان

(أَبْطَــح) و (بَطْحَــا)نــه نەواليــد ب بــەر

(سَــارِق) و (لِــص) هەردونــه ناڤێـد دزان

(هِــرَّة) و (سِــنَّوْر)ه پسـيک، (فَــأْر)ه مشـک

(ثُقْبــه) کونــه، رووڤـی چيــه (ثَعْلَبــان)

(وَاحِــد) و (إِثْنَــان) چنــه؟ ئــەو يێــک و دو

سـێنه (ثَــلاث)، (أَرْبَعــه) چـارن عـەيان

(خَمْسَــه) و (سِــتَّه) چنـه؟ ئـەو پێـنج و شـەش

حــەفتن و حەشــتن ئەڤــه (سَــبْعه) و (ثَــمان)

(تِسْــع) و (عَشِــــر) هـەردو نهــ و دەهــ تـەمام

سـەد (مِئَــة) و (أَلْــــف)ە هـەزار ئـەی جــوان

## القطعة في بحر
## الهزج السالم المثمن

د فەصلا نەوبهاریٖ دا د گەل دلبەر بچی گشتیٖ

ژ ئەو خوەشتر عومر نابت ل من ئەو حال قەوی خوەش تیٖ

(مَفَـــاعِيْلُنْ مَفَـــاعِيْلُنْ مَفَـــاعِيْلُنْ مَفَـــاعِيْلُنْ)

هەزەج سالم موثەممەن بت ل طەبعان خوەش مونەققەش تیٖ

(عَضُد) باسک وئەنیشک (مِرْفَق) (ذِرَاع) زەند و(لِسَان) ئەزمان

تەنشت (جَنْب) و (بَغَل) بنکەش (عُنُق) ئستوٚ (ثَدي) پستان

(جَوارِح) دەست و پیٖ، (حُلْقُوم) و (حَلْق) و (حُنْجُره) گەوری

(عَشا) شیڤ، و (غَدا) تێشت، و (غَذاء) زاد، و (إناء) ئامان

(وَصَب) ئێش و (نَصَب) زەحمەت (خَتَن) زاڤا (خِتان) سوننەت

(بطانه) دوٚستی، و (مَبْطون)ە زکئێشی، و (دَوا) دەرمان

بزان چارن (عَناصِر): ئاخ و ئاڤ و با و ئاگر هەم

(مَوالید)ن ئەڤە هەر سیٖ: نەبات و مەعدەن و حەیوان

(طَبائع) گەرمی و ساری زوایی و تەری هەر چار

وە رەنگ صەفرا و سەودا بەلغەم و خوون بێژە (أخلاط)ان

(غَلَـل) ئـاڤ، و (مَعـين) جاری، (دَجـی، ظلـما) شـەڤا تـاری

(وَحَل، طين) و (حَمَأ، صَلْصَـال) هـەڕی، (وَدْق) و (حَيـا) بـاران

(جَـدار) و (حـائِط) و (أَبنِيَّـه) ديـوارن، (عَمُـود) ئـسـتوون

(خَشَب) دار و (وَتِد) صنگ و کەمەر (طَاق) و (رِواق) ئـەيوان

(جَريده) دەفتەر و (قِرْطاس)ە کاغەد (طِـرْس، وَرَق) ئـەو ڕەنـگ

(سُرادِق) خيڤەتن، (فِسْطاط)ە کوون، (ظَـرْف) و (وِعـا) ئامـان

ئيشارەت (وَحْـي) و (تَلْـويح)، و (إرادَة) ڤين و (قُـدْرَة) شين

(جَبَان) قەلس، و (بَطَل) مـەرد، و (لِـوا) ئـالا، (عَلَـم) نيشـان

(قَصِي) دوور و (دُحور) ئەو ڕەنگ (قَصَب) قامووشە (قِرد) مەيموون

(فَرَس) هەسپە، و (جَرَس) زەنگل، (إكاف) و (بَرْذَعه) کورتـان

(حَمِـيم) خـزم، و (حِمَايَـت) پـان، (تُـراث) و (إرْث)ە ميـراتن

(أَبـو) بابـە، (أُبُـوَّة) بـابی، و (بَـوَّاب)ە دەرگـەوان

(أبـو جـامع) چيـە؟ سـوفرە، (أبـو النَّـاجع) چيـە؟ حـەلوا

(أبـو نـافع) چيـە؟ سـرکە، (أبـو جـابر) دبێـژن نـان

## القطعة في بحر
## التقارب المقصور

موعــەللم بــلا دل وەكــی بــەر بــتن

دڤيــتن كــو شــاگردێ دلبــەر بــتن

(فَعُــوْلُنْ فَعُــوْلُنْ فَعُــوْلُنْ فَعُــوْلْ)

تەقاروب خوەشە گەر موقەصصەر بتن

(سَما) ئاسمان، (عَرْش)ە بان، خانی (بَيْـت)

(تَتَق) پەردە، (إرْفَـع) هلين، خوزی (لَيْـت)

(دُعَا) خوەستن و (دَع) بهێل (رُح) هەرە

(مَرَق) شۆرە، و(كُل) بخوە، (جِـئ) وەرە

(مَـــلَأ) مــەجلس، وتژيبـــوون (امـــتِلاء)

(سَـــنا) روهنييــە، هــەر وەكــی (انجــلاء)

(جحـيم) و (جَهَـنَّم، لَظَـی) و (سَـقَر)

هــەيين دۆژەهــ و جهــ (مَقَـام) و (مَقَـر)

(عِبَـــادَة) پەرەســـتن (عِبَـــارة) بــەيان

هـــەيين ئاشــكارا (عِـــلان) و (عَيَـــان)

ب مەعنا عەذابن (عِقَاب) و (نكَال)

(خَبَل، خَبطَه) دینی، خەرابی (خَبَال)

(شَحِیح) و (هَلوع) و (ضَنِین) و (بَخِیل)

ب مەعنا یەکن جوملە، (صَاغِر، ذَلِیل)

قەوی رِووترش رِوو (کَلوح) و (عَبوس)

ژ بۆ بووک و زاڤا دبێژن: (عَروس)

(مُوَشَّح، مُزَیَّن، مُکَلَّل) وسان

(مُشَکَّل) بزانە (حَسَان) و (بَسَان)

صەپاحییە (بَهلول)، و زینەت (بَها)

(سَجِیَّة) طەبیعەت، (تَحِیَّة) دوعا

هسناهی (روح)، و هەواره (نِیاح)

خەلاصبوونە (فَوز) و (فَلاح) و (نَجاح)

زڤستان (شِتا)یە، و هاڤینە (صَیف)

بوهارە (رَبِیع)، و پەییزە (خُرَیف)

(سَنَة) سال، و (اسبوع)ە حەفتی بناس

(سَراوِیل) و (سِرْبال)ە دەرپێ و کراس

(نُعاس) و (سِنة) هۆنژین، (هَجْعَة) خەو

(فَری، افتِرا، إدّ) هەر سێ دەرەو

(تَراخـــي، تَـــرَف) سســـتی و نەرمیـــە

(حَصَـــب) ســەختی، و (مَعْمَعـــان) گەرمیـــە

ســـڤکبوونە (خِفَّـــة)، گرانـــی (وَقـــار)

(تَـــرَبُّص) درەنگینـــی، دەنگـــە (خَـــوار)

فریڤـــی (حَنیـــذ)، فـــەرووزی (مُکـــاء)

(صِیاح) و (صَـدا) دەنـگ، و گـازی (نِـداء)

(رَجَـــز) ئســـترانە، وســـانە (هَـــزَج)

(هَـرَج) تێکلیبوونـە (مَـزْج) و (مَـرَج)

(بَنـــان) ســـەرتبلک و (أصَـــابع) تلـــی

(عَدالَـــة) بەرابـــەر[1]، (شِـــكاية) گلـــی

دەرازینـە (عَتَبَـە)، وە ڕەنگـە (وَصِـیْد)

ب مـەعنایێ ئـاخن (رُفَـات) و (صَـعِیْد)

(قَـــوارير)ە شووشـــە، (مُمَـــرَّد) هلـــوو

(دُخـــان، دُخّ) و (نُجُـــوم) ناڤێـــد دوو

(تَجَلْجُـــل) هژینـــە، (تَبَتُّـــل) بـــڕین

(تَكَلُّـــم) خەبـــەردان، (تَبَسُّـــم) كـــەنین

---

(١) د دانەیەکێ دا: بەرابەر (عدیل) و..

(تَبـــادُر، عَجَـــل، سُرْعـــه) هـــهر ســـێ لـــهزن
(حَديقـــــه) و (بُسْـــــتان) و (جَنَّـــــة) ڕەزن
(كِتَابــة) نقيســين، مورەككــەب (مِــداد)
(تِــلاوَة) چ؟ خوەنــدن، مەحەبیـەت (وِداد)
گهیشـــــتن بزانــــه (وُصُـــــــل) و (وُرود)
هــهم ئــهڤراز چوونــه (عُـــروج) و (صُـــعود)
(عَـــرَج) لەنگیـــه، و (عِـــوَج) خواریـــه
(إعَانـــــة) و (نُصْرَـــــة) چنـــه؟ ئاريـــه
(رِبـــا) زێـــدەهی، (رَبْـــوَة) عـــهردێ بلنـــد
(ضِـــيَافة، قِـــرا)، هـــهر وەكـــی (قَرْيَـــه) گونـــد
(جُدَد، رَبْع، قَصْـد) و (صِراط) و (سَـبيل)
هەمی ڕێنه، (مُهْـدي) و (هـادي) دەلیـل
(رَمَـــل) زوو ل ڕێ چوونـــه، هـــهم (هَرْوَلـــه)
(نَحافَـــة) زەبـوون بوونـــه، هـــهم (حَوْقَـــل)ه
(شَـــــجاعَة، جَـــــلادة) جوانمێریـــــه
(سَغَب) و (غَرَث) برس، و (شَبْع) تێریه
(جماع) و (رَفَــث، وَطْــأ) گــان، (بَــذْل) دان
(ذَكَر) كير، و قــوز (فَرْج)ه، گون (خِصْـيَان)

(تــدَفُّق) ڤــەرێتن، (تَلَــذّوذ) خوەشــی
وەکی (سَقي)یێ ئاڤدان، (نَضارة) گەشی
(أبــو الكِــبْر) زیـڤ، و (أبــو الفَضْــل) زێــڕ
(أبــو الـنجم) ڕووڤـی، (أبــو الحَـرْث) شێر
(أبــو الأمــن) تێـری، (أبــو عَمْـرو) بـرس
(أبو قَيْس) تووری، (حَذَر، خَوْف)ە تـرس
(أبــوجَعْفَر)ە مـێش، (أبوجَعْــد)ە گـورگ
قولنگــە (کُــري) و (حُبــاری)یــە چـرگ
(أبو اللهْـو)ە تـەنبوور، (أبـو غَفْـل)ە فیـل
(أبـو مُـرَّە) شیطـان، و (سُـلْطان) دەلیـل
(فَــــمَا خَطْــــبُكُمْ أَيُّهـــا المُرْسَــــلون)
گــەلی قاصــدان بــۆ چ هاتینــە هــوون؟
(تَعَــالَوا سريعــاً) وەرن هــوون ب لــەز
(فَهَـــذِهِ جَنَّـــةٌ) ئــەڤێ هایــە ڕەز
(لِنَــذهَبْ، وَنَلْعَــبْ، وَنَأكُــلْ معــاً)
بچــین دا بلــەیزین و ڤێکــرا بخــوەن
د گەل من (مَعي) و د گەل تـە (مَعَـك)
(وَلِي) هـەم ژ بۆ مـن، ژ بۆ تـە (وَلَـك)

(عَلَيْــكَ) ل ســمر تــه، (عَــلَيَّ) ل مــن

(عَلَيْــهِ) ل ســمر وى، (وَ مِنِّــي) ژ مــن

(عَلَيْنــا) ل ســمر مــه، (عَلَــيْهِم) ل وان

(عَلَــيْكُم) ل ســمر وه، (خَسَــارَة) زيــان

(نَهَــاراً) ب رۆژ، و (بَيَاتــاً) ب شــەف

(مِــنَ الجَهْــلِ فِــرَّ) ژ جــەهلێ بــرەڤ

(فَــإن كُنْــتَ تَرْجُــو طَرِيــقَ النَّجَــاة)

(فَخُــذْ مَسْــلَكَ مُظْهِــرِ المُعْجِــزات)

(لِمَــا أوحــي المُصْــطَفَى فاســتَمِعْ)

(بِسَــمْعِ الرِّضَــا فاعْتَقِــدْ واتَّبِــعْ)

(أُصَــلِّي عَــلى شــافعي أحمــدا)

(فــلا تَــنْسَ يــا شــافعي أحمــدا)

## في بيان
## أركان الإسلام و الإيمان

گەر دپرسیتن کەسەک روکنێ د ئیسلامێ چنە
بێژ شەهادەتدانە هەم پێنج وەقتێ نڤێژ و ڕۆژنە
هەم زەکات و فطرە هەم یا دی طەوافا کەعبێیە
گەر هەبت خەرجی نەبن چو مانع و چو دوژمنە
چیە ئیمان د ئەصل دا ب لوغەت باوەرییە
تو بزان قەنج کو ئەو باوەری ئینجا ب چییە
ب خودێ و ب کتێبان ب رەسوول و مەلەکان
بکە باوەر کو شەر وخەیری ب تەقدیرێ وییە
ب یەقین هەم تو بزانە کو قیامەت حەققە
هەرچی ئەڤ ڕەنگە نزانت مەگەر ئەو رافضییە

# عەقیدەنامە

ل باتە موحەققەق بتن ئەڤ جەواب

دوهی گۆتە من هاتفی بێ حجاب

(سأحمد ثناک بقول صحیح)[1]

ل تەوحیدێ باری (بلفظ فصیح)

خودێ یێکە بێ هەڤرِی و بێ هەڤال

نە مەعزوولیە نە مرن نە زەوال

نە ئەصل و نە فەصل و نە دا و نە باب

هەیین وی هەیینا وی نابت حساب

---

(١) د شیان دایە ئەڤ رێزکە ب کوردی ژی بێتە خواندن، و ب عەرەبی ژی، ئەگەر ئەو کوردی بت دێ ب ڤی رەنگی ئێتە خواندن: (سە ئەحمەد ثەنا کە ب قەولێ فەصیح) و هنگی دبت (سە) کورتییا (سەکو) بت، کو ب رامانا (یەعنی) دئێت، دبێژت: ئەو گۆتنا هاتفێ بێ حیجاب دوهی گۆتییە من مەعنا وێ ئەڤە بوو: ئەی ئەحمەد تو ثەنائێ بکە.. هتد. و دبت ئەو کورتییا (ئاسا) یا فارسی بت، و رامانا وێ (وەکی)یە، و هنگی مەعنا ئەڤەیە: خانی دبێژتە خۆ: ئەی ئەوێ تو وەکی ئەحمەدی (وەکی ئەحمەدی چونکی تو ژ هندێ کێمتری کو ناڤێ پێغەمبەری، ئەحمەد، ل سەر تە بێتەدانان) تو ثەنائا خودێ بکە ب گۆتنەکا فەصیح.. و ئەگەر ئەو عەرەبی بت ئەو دێ ب ڤی رەنگی ئێتە خواندن: (سأحمد ثناک بقول فەصیح) و هنگی مەعنا دێ ئەڤە بت: ئەی خودا پاشی ئەز دێ حەمدا تە کەم ب گۆتنەکا رەهوان، پاشی.. یەعنی: د ڤێ شعرێ دا . و ب ڤێ چەندێ زیرەکییا خانی بۆ مە دیار دبت!

ژ بــۆ وی چــو نیـــنن جهــات و مــەکان

نــە مانەنــد و مثــل و نــە هــەمتا نشــان

مـــــەکانان مەبینــــە ژ بــــۆ وی رەوا

نهایــەت (علــی العــرش قــد اســتوی)

ل وی ڕانەبۆرینــــە وەقــــت و زەمــــان

نــە ســال و نــە ماهــ و نــە حین و نــە ئان

ئەبــەد دێ هــەبیتن ئــەزەل هــەر هەیــە

د دونیـــێ و عـــوقبێ خـــودانێ مەیـــە

ئــەوی ئافرانــدن ئــەم و جوملــە خــەلق

نــەهن غــەیری وی قــەط چو خالق ب حــەق

رەســـوولێد وی جوملــە حــەقن تــەمام

خوصووصــا موحەمــەد (علیــە الســلام)

کــو ســەردەفتەرێ جوملــە عالــەم ئــەوە

نویــووەت خــوە مەکتووبــە خاتــەم ئــەوە

خــودێ ئافرانــدن ژ بــۆ وی فەلــەک[1]

ژ بــۆ خزمــەتا وی شــەهاندن مەلــەک

---

(١) ئەڤە ئیشارەتە بۆ وێ حەدیسا نەدورست و (مەوضووع) ئەوا تێدا هاتی: (لولاک لما خلقت الأفلاک).

کـو قورئـان ژ عەرشـان د گـەل وی هنـار

ژ بـۆیی حـەبیبێ خـوە یـێ ئختیـار

ژ بـال خـوە بوراقـەک ژ بـۆ ڕاشـەهاند

ل زینـەک مورەصـەع ئـەوی ڕوونهانـد

بوراقێ د گـەل ڕەفرەفـێ دەسـت ب دەسـت

ب ئـەمرێ خـودێ ئـەو بـرن پێشـی دەسـت

د حـەفت ئاسـمانان ئـەوی ئـەو پەرانـد

ب قاسـی دو قەوسـان ڤ بـال خـوە گەهانـد

هـەلانین خـودێ پـەردە ڕاکـر نقـاب

جـەمالا خـودێ دیـت ئـەوی بـێ حجـاب

دو جـاران ب چاڤـان جـەمالا وی دیـت

ل ضـەررا مەلاییـد دبێـژن نـەدیت

مەبـە بـێ سـەبەب مـونکرێ (قـد رأی)

ژ خـەلقێ (تمـارون علـی مـا یـری)

ئەگـەر تـو دبێـژی: ل کـوو دی خـودا

خـودێ کـو ل نـک (سـدرة المنتهـی)

موحەققـەق بـزان وی خـودێ دیتیـە

نهایـەت نزانـت حەقیقـەت چیـە

ژ بـۆیی کـو نیـنن ژ بـۆ وی شەبیهـ
کسێ وەصـف بکـەت دێ چ بێژت بەدیهـ

صـفاتێد سـەبعە ژ بـۆ (ذو الجـلال)
بـزان حـەفتن ئـەی عـارفێ (بـو الکمـال)

خوەشی، شین، و زانین، و ڤین، و کەلام
بهیسـتن، د گـەل دیتنـێ بـوو تـەمام

قـەدیمن وەکـی ذاتـی جوملـە صـفات
نـە عـەینێ د ذاتینـە نـە غـەیرێ ذات

خـودێ نینـە جەوهـەر نـە جسم و عـەرەض
نـە کوللـە نـە بەعضـە بـزان بـێ غـەرەض

ئەگـەر بـێ گونەهـ مـە موعـەذذەب بکـەت
ژ بـۆ وی هەیـە مـە موئـەددەب بکـەت[1]

رەوایـە بکـەت ئـەو ل عەبـدی مەشـاق
ب قەهرا خوە تـەکلیفێ (مـا لا یطـاق)[2]

---

(١) ل نک ئەشعەرییان عەقل قەبویل دکەت کو خودێ مرۆڤێ (موطیع) عـەزاب بدەت، بەلێ ماتوریـدی دبێـژن: عـەقل ڤـێ چەنـدێ قـەبویل ناکـەت، و ئەڤـە ئێـک ژ وان مەسەلێن جەوهەرییە یێن خیلافا ئەشعەری و ماتوریدییان تێدا چێبووی.

(٢) ئەڤە ژی ژ وان مەسەلانە یێن خیلاف تێدا چێبووی، ئەشعەری دبێژن: ئەو دبت، و ماتوریدی دبێژن: ئەو نابت.

ئەوێ کێ ب ظـولمێ تەکەللوف دکەت؟!
د مـولکێ خـوە دا ئـەو تەصـەرروف دکەت

ل مـە فەرضـە هـەرچی ژ بـۆ وی ب کێـر
نـە فەرضـە ل وی یـا ژ بـۆ مـە ب خێـر

ئیـرادەت دکـەت ئـەو ب خێـر و شـەران
رضـا نینـە ئـەمما ب فعـلا شـەران

بـزان بەنـدە موختـاریێ فعـلا خوەیـە
نـە خـالق، نـە مـەجبووریێ فعـلا خوەیـە

موافـق نـەبن قـەول و نییـەت عەمـەل
ل بـا مـە دبیـتن کـو ئیمـان خەلـەل

مرۆڤـێ ب ئیمـان د دۆژێ مـوقیم
بزانـە کـو نـامینیتن ئـەی حـەکیم

موسـلمان ب قـەتل و زنـایێ چـو جـار
نـە کـافر دبـن نـە موخەلـلەد د نـار

ژ مەعصـییەتان واجبـە تەوبـە زوو
گونەهـێ نینـە تەوبـە نـەبیتن ل دوو

نـە مەعـذوورە جاهـل کـو عاقـل بـتن
ژ خـالق ب جـەهلا خـوە غافـل بـتن

مرۆڤــێ نــەزان بیــت و نــادان و ســست
دبیــتن ب تەقلیــدێ ئیمــان دورســت

د وەقتــێ عــەذابا خــودێ کــەت نــزوول
ب ســەر کــافران نینــە ئیمــان قــەبوول

ژ عــەزل و گوناهــان نــەبی بــوون بــەری
ژ بــۆ قســمێ ژن نینــە پێغەمبــەری

وەلییــان کەرامــەت دکــەن ژێ ظوهــوور
دکەن خەرقێ عادەت گەلەک ژێ صودوور

خــودێ دێ ببیــنن موســلمان ب چــاڤ
وەکــی صــایی بیــتن هــەییڤا تــەڤاڤ

ژ بیــر دێ بکــەن نعمــەتا جەننــەتێ
وەکــی دەســت بــدەت دەولــەتا روئیــەتێ

بەطالــە تەناســوخ محالــە حولــوول
مەکــە ئتتحــادا دو تشــتان قــەبوول

ئەگــەر تشــتەکی پــوڕ موجــەززا بکــەن
قــەبوول ناکــەت ئێــدی تعجــەززا بکــەن

هــەیوولا چــو نیــنن عەدیمــە عــەدیم
دنــێ کــافرە ئــێ دبێــژت قــەدیم

مەکـە لـەج د لوقمـان و ئسـکەندەری
ژ بـۆ وان نەمەعرووفـە پێغەمبـەری

یەزیـدێ مـری لەعنـەتێ لـێ مەکـە
پەلیـد و خەبیثـە خـوە تێکـل مەکـە

مـەلائک شـەیاطین و جننـان ووجـوود
هەیـە دا نەکـەی بوویینـا وان جوحـوود

وەکی یێکن ئەڤ هەردو بێ شەک تەمام
د رزقییـەتێ دا حـەلال و حـەرام

بێـژم تـە فەضـلا صـەحابێد رەسـوول
ب جان پـێ کـە بـاوەر ب دل کـە قـەبوول

ئـەبوو بـەکرێ صـدیقە یـارێ شـەفیق
ئـەوە (ثـاني اثنـین) د غـارێ رەفیـق

ژ ئـەووەل د فەضـلێ سـەرامەد ئـەوە
کەریمـە و صـاحب کەرامـەت ئـەوە

ل پـێ وی ب حـەق عومـەرە دیـن پەناهـ
ب فەتحێـد وی شـانە خونـدکار و شاهـ

خلافـەت کەمـەر بـوو مجـالا وی بەسـت
ژ حـوکمێ وی پشـتا موخـالف شکسـت

د پێ وی ڤه عوثمان ب حەق بوو حەکیم
د علمی عەلیم و د حوکمی حەلیم
ژ کەرراری ئەفضەلترە بێ گومان
ئەڤە ئعتقادا مە دەر حەققێ وان
ل پێ وان عەلی صاحبێ (ذو الفقار)
سوارێ ل دولدول شەهێ نامدار
تەفەووق ل سەر ئێد مایی هەیە
ب مەعنا برایێ رەسوولێ مەیە
شەفاعەت دکەن ئەنبیا ئەولیا
ب ئذنا خودێ بۆ کەسێ ئەشقیا
د غەیب و حوضوورێ دوعایان ئەثەر
دبیتن ژ بۆ رِا (أیا با خبر)
ب فعلێد قەنج دا نەکەی مننەتێ
ب فەضلا خودێ دێ بچی جەننەتێ
بەحشت و جەهەننەم هەین وێ دەمێ
فەنا نابن ئەو ناچنە عەدەمێ
یەقین دێ ببیتن د (یوم القیام)
حسابا حەلالی عەذابا حەرام

ژ بـۆ ئـەهلێ خـەیران نـەجات و رضـا

ژ بـۆ ئـەهلێ شـەرران عقـاب و جـزا

د قـەبری دبیـتن ژ خـەلقێ مـری

سـوئالا نـەکیری د گـەل مـونکری

د حەشـرێ تـەرازوو و میـزان هەیـە

خرابـی و قـەنجی و کێشـان هەیـە

صراط ئەو پرا پڕ ب خەوف و خەطەر

جـەمیعێ خـەلائق دکـەن لـێ گـوذەر

جەهەننـەم د بـن دا و جەننـەت ل پـێش

ل سـەر وی ئیلاهـی تـو دەسـتم بکـێش

وە گەر نە.. ئەزێ موجرمێ بەد عەمەل

دزانـم کـو دێ بێتـە پـێ مـن زەلـەل

ب فعلێـد مـن یـا ئیلاهـی نەکـەی

د گەل من ب ئحسان و لوطفا خوە کەی[1]

مـن و جوملـەئێ ئوممـەتا موصـطەفا

ببـی جەننـەتێ تـابعێ موصـطەفا

---

(١) د دانەیەکێ دا پشتی ڤێ مالکێ مالکەکا دی هەیە، ئەو ژی ئەڤەیە:

ژ بۆ کاتبێ نوسخەیا نەووبهار    تو باشی حەفیظ و موعین و غەففار

## مەم و زین

سـەرنامەێ نامـە نـامێ (اللـە)
بـێ نـامێ وی ناتەمامـە (واللـە)
ئـەی مەطلـەعێ حوسـنێ عشـقبازی
مـەحبووبێ حـەقیقی و مـەجازی
نـامێ تەیـە لـەوحێ نامـەیا عشـق
ئسـمێ تەیـە نەقشـێ خامـەیا عشـق
بـێ نەقشـێ تـە نەقشـێ خامـە خامـە
بـێ نـامێ تـە نامـە ناتەمامـە
نـامێ تەیـە شاهـ بـەیتێ مەقصـوود
فهرسـتێ موکاتـەبـاتێ مـەحموود
مەضـموونێ موراسـەلاتێ لارەیـب
مەشـهوودێ موکاشـفاتێ بلغـەیـب
مـەحبووبێ قولـووبێ (مـن لـە القلـب)
قـەلبان تـو دکـەی ب بـا خـوە ڤـەن جـەلب
مەعشـووق تـویی ب فـەخر و نـازی
عاشـق تـویی لێـک بـێ نیـازی

موطلـــەق تـــو موفیـــد و موســـتەفادی
بـــێ شـــوبهە موریـــد و هـــەم مـــورادی
نـــووری تـــو د حوســـنێ ڕوویـــێ دلـــدار
نـــاری تـــو د قـــەلبێ عاشـــقێ زار
شـــەمعی نـــە ژ قســـمێ نـــوور و نـــاری
شەمســـی ژ عـــەیان تـــو پـــەردەداری
گـــەنجی تـــو د نیـــڤ طلســـمێ عالـــەم
کـــەنزی تـــو عـــەیان ژ ئسـمێ ئـــادەم
ئـــەڤ عالـــەم و ئـــادەمی د مەشـــهوود
ئـــەڤ مـــومکن و ماســـوایێ مـــەوجوود
هـــەمیان ب تـــە یـــە مـــداره و دەبـــر
فەییاضـێ ریاضـێ خـەلق و وە (الأمـر)
ئـەمرێ تـە ب لـەفظێ (کـن) دو عالـەم
مـــەوجوود کـــرن غـــەرەض چ ئـــادەم
ئـــادەم ب خـــوە یـــەک ژ هەردوانـــە
یـەک حـەرف ژ ئـەمرێ (کـن فکـان)ە
ئـــەو حەرفـــە حەقیقـــەتا موحەققـــەق
هـەم ئـەمرە ب قودرەتـا تـە هـەم خـەلق
ئەشـــباح مورەســـــەمن ژ ناســـــووت
ئـــەرواح موەســـــەمن ب لاهـــووت
ئـەڤ رووح و جسـەد ب جـەبر و نکراهـ
تـــەزویج بـــووین ب ئـــەمرێ ئەللاهـــ

ناسـووتی ئەگـەر چ ڕەنـگ سـوفالە
لاهـووتی ژ پەرتـەوا جەمالـە

حـەرفا کـو مـە گۆتی نەقشێ هـوورە
لـێ مەقصـەد و مەعنـەیا وێ کـوورە

ظـاهر تـە ئەگـەر نومایـە صـوغرا
بـاطن ئـەوە نەقشـێ خامـە کـوبرا

مـەوجوودە د وێ شـەهادەت و غـەیب
مەشـهوورە د وێ سـیادەت و عـەیب

ئنسـان ب خـوە هـەم ظەلامـە هـەم نـوور
ئـادەم ژ تـە هـەم قەریبـە هـەم دوور

هنـدی وەکـو جنسـێ عالەمینـە
ئـەو تـابعێ نـەوعێ ئادەمینـە

ئەڤ ڕەنگە فەلـەک هـەمی موعەظظـەم
ئـەڤ چەنـدە مەلـەک هـەمی موەکـەڕڕەم

ئـەڤ کارگـەها عەظیمـە دەووار
ئـەڤ بارگـەها بەدیعـە سـەییار

ئـەڤ چەنـدە زەمـین د گـەل عەناصـر
ئـەڤ ڕەنگـە عـەرەض د گـەل جـەواهر

ئـەڤ چەندەهـە نعمـەت و نـەفائس
ئـەڤ ڕەنگەهـە مەئکـەل و مـەلابس

ئـەڤ چەندەهـە موددەعـا و مـەطلووب
ئـەڤ ڕەنگەهـە موشـتەها و مـەحبووب

حـــەیوان و مـــــەعادن و نـــــەباتات
مـــەطلووب و مەقاصـــد و مـــورادات
(بالجملـــە) ژ بـــۆ مـــە ڕا ل كـــارن
(فـــي الجملـــە) ژ بـۆ مـــە بـــور دبـارن
حـەققا كـــو تـــو خـوەش نظـــام و ڕەونـــەق
تـــەرتیبكرن ژ بـــۆ مـــــە ئەلحــــەق
ئـــەم غافـــل و عاطـــــل و گونـــەهكار
مایینـــــە د قەیـــدێ نەفســـێ ئـــەممار
نیـــنن مـــە د قـــەلبی فكـــر و ذكـــرەك
ناكـــەین ب زەبـــانی حەمـــد و شـــوكرەك
خـــانی كـــو نـــەهـــن ب قـــەلبێ ذاكـــر
بـــاری بـــده وی زەبـــانێ شـــاكر

## تعداد نعمت شماری، و تکرار شکرگوذاریيا باری و صوورەتێ ئایینداری و پەردەبرداریيا پەروردگاریدا د گل اختتاما ب موناجاتەک موختەصەر کردەواری

ئـەی شـوکرێ تـە جەوهـەرێ زەبـانی
وەی ذکـرێ تـە صـەیقەلا جـەنانی
ئـەی واحـدێ بـێ شـەریکێ یـەکتا
وەی واجـدێ بـێ نـەظیر و هـەمتا
ئـەی بـاقییێ بـێ زەوالـێ دائـم
وەی هـادییێ بـێ فـەنایێ قـائم
ئـەی خـالقێ ئـەرض و ئاسـمانان
وەی خـالقێ جوملـە ئـنس و جانـان
مولـک و مەلـەک و فەلـەک ب جـارەک
(بالجملـە) تـە چێکـرن تـەبارەک
(سـبحانک کلمـا خلقـت)
(أحسـنت فکیـف مـا فلقـت)
هـەرچی کـو تـە چێکـر ئـەی نکووکـار
هـەر یـەک د حـەدێ خـوە دا سـزاوار
ئـەڤ نەهـ صـەدەفێد پـڕ مـراری
دوڕ و شـەڤەیێـد شـەفاف و طـاری

حەفتێد مثالێ دوڕڕێ غەلطان
هەر شەش جهەت و چهار ئەرکان
هەر سێ وەلەدێد پڕ مەوالید
غەبرا و سەما د گەل مەقالید
لەوح و قەلەم و ثەوابت و عەرش
حەیوان و نەبات و مەعدەن و فەرش
ظاهرکرن ئەڤ قەدەر صەنایع
پەیداکرن ئەڤ قەدەر بەدایع
هەر یەک ژ عەدەم کرن تە پەیدا
ئیداعکرن تە بێ هەیوولا
(في الجملە) چ ئەووەل و چ ئاخر
(القصە) چ موئمن و چ کافر
هەر یەک ژ تە ڕا وە بوونە مەظهەر
ئەو ڕەنگ د وان تو بوویی موضمەر
بێ حوسنێ تە نینە وان ووجوودەک
بێ نووری تە نینە وان نوموودەک
حکمەت ئەوە باطنی و ظاهر
قودرەت ئەوە غائبی و حاضر
نینن تە تەحەییوز و تەمەککون
ئەمما وە د وان دکەی تەوەططون
گۆیا هەمی جسمەکن تو جانی
گۆیا هەمی شەهرەکن تو خانی

حوسـنا تەیـە زینـەتا حـەبیبان
ڕەشـکا تەیـە غیرەتـا ڕەقیبـان
مـەیلا تەیـە عاشـقان دکێشـت
دەردێ تەیـە دل ژ بـەر دئێشـت
شـیرین تـە کـرە شـەکەر ل پـەرویز
فـەرهاد ژ ڕشـکێ ئەشـکە خـوونریز
لـەیلا تـە کـرە بـەلا ل قەیسـی
ڕامـین ب تـە رام بـوو ل وەیسـی
یووسـف تـە چـرا نومـا زولـەیخا
وامـق تـە کوسـا گهانـدە عـەذرا
شـەیخێ وەکـو پێنجـە حـەج بـژاری
دیـن کـر تـە ژ بـۆ کـەچا کوفـاری
نەیلۆفـەرە نازیـەروەری کـر
ئـەو ژی تـە ل مهـرێ موشـتەری کـر
بـالایێ بلنـد تـە دایـە سـەروان
پابەنـدێ بـەلا تـە دا تـەذەروان
سـۆرگول تـە کـرن ژ خـارێ پەیـدا
بولبـول تـە کـرن هـەزار شـەیدا
خـوەش ڕەنگـی تـە دا گیـایێ سـۆرگول
خـوەش دەنگـی تـە دا نـەوایێ بولبـول
ڕۆنـاهی تـە دا سـەرێ شـەمالان
پـەروازکرن ب شـەوقێ تـالان

مـــەحبووب تـــە چێكـــرن د دلگـــەش
مەجـذووب تـــە پـــێ كـــرن موشـــەووەش
ئـــەڤ عشـــق و مـــەحبیـــەتا د دل دا
ئـــەڤ زولـــف و سەلاســـلێد ب مـــل دا
ئایـــا نـــە تـــە چێكـــرن موقابـــل؟
هـــەر یـــەک تـــە ب هـــەڤ كـــرن موعـــادل
ئایینـــــە تـــــە چێكـــــرن موكـــــەررەر
حوسـنا خـــوە د وان تـــە كـــر موصـــەووەر
ئایینـــە ل پێشـــی طـــووطیـــان گـــرت
داڤـــەک تـــە ل پێشـــی كـــووڤیـــان گـــرت
ئایینـــە ژ وان وەیـــە كـــو ئاڤـــە
ئـــەو عەكســـە ژ وان وەیـــە كـــو طاڤـــە
نەقشـــێ تـــە دبیـــنن ئـــەو د ئـــاڤێ
نـــاكن حـــەذەرێ ژ ئـــاڤ و داڤـــێ
لەبتەشـــنە طـەلـــەب دكـــەن زولالـــێ
وێ دانـــە و دام زولـــف و خـــالـێ
مەقصـــوود كـــو بـــوو ژ پێشـــڤە حاضـــر
دێ قـەصـدێ بكـــەن جـــەمیعێ نـــاظر
طـــووطی ب خـــوە مـــا شـــەكەر درێـــژن
هـــەرچی دبهـــن ئـــەوی دبێـــژن
وێ مەقصـــەدێ موختەصـــەر دبینـــن
پابەنـــد دبـــن گەلـــەک دمینـــن

مەقصوود و موورادێ دل تو شایی
ئەمما تو (تضل من تشا)یی
هەرچی تە دڤێ ببەی ضەلالێ
پابەند دکەی ب زولف و خالێ
هەرچی کو تو بینی سەر هدایەت
ڤێرا بکری بکەی عنایەت
حاضر وی دبەی مەقامێ مەعلووم
گەر خادمە وی دگێرِی مەخدووم
بێ سەجدە تە ئەی جەنابێ مەعبوود
ئادەم کرە قیبلەگاهـ و مسجوود
عیسا تە کوسا گهاندە ئەوجان
ئایا ب چ تە حەباندە ئەو جان
دەرسا کو ب خەف تە گۆتە ئدریس
ئەلبەتتە دچوو مەقامێ تەقدیس
ئبلیسێ فەقیرێ بێ جنایەت
هندی تە هەبوو د گەل عنایەت
هەر رۆژ دکر هەزار طاعەت
لەورا کو تە دا وی ئستطاعەت
وی سەجدە نەکر ب غەیری مەعبوود
گێرا تە ژ بەر دەرێ خوە مەردوود
یەک سەجدە نەبر ل پێشی ئەغیار
قەهرا تە کرە (مخلد النار)

(القصــــه) ژ حکمـــەتا تـــە ئاگاهـــ
فـــەردەک م نـــەدی (تبـــارک اللـــه)

عرفـــان طەلەبێـــد صـــاحب ئـــدراک
دەر حـەققێ تـە گۆتی: (مـا عرفنـاک)

خـــانی ب نـــەزانییا خـــوە دەر حـــەق
گومراهـــ ببـــت نـــە دووره ئەلحـــەق

ئلـــلا کـــو مەگـــەر مـــوعین خـــودا بـــت
یـــا ڕاهبـــەرێ دی موصـــطەفا بـــت

یـا رەببـی ب حـەققێ موصـطەفا کـەی
خـــانی ب خـــوە ڕا تـــو ئاشـــنا کـــەی

## د نعتا قەلەمێ مەصنووعات و سەردەفتەرێ مەوجوودات
## و عەقلێ مەعقوولات و پێشدەستێ مەخلووقات
## حەضرەتێ سيد السادات محمد المصطفى عليه أفضل الصلوات

ئەشـيا ب حسـەب دەلـيـل و بورهـان
نـابن چـو مـەگـەر ووجـووب و ئمكـان
واجـب يەكـە ذاتـێ كبريايـە
مـومكن پـڕە جـەمعێ ماسـوايە
وی واجبـێ مومكنـاتێ بەرقـەع
مـومكن وی ژ بـۆ خـوە كرنـە مەطلـەع
يـەعنی ئـەوی ڤـێ ببـت موبەرهـەن
حوسـنا وی بدەركـەڤت ژ مەكمـەن
گەنجينـەیێ سـرڕێ وی ببـت فـاش
ثابـت ببـتن ژ نەقشـی نـەققاش
لـێ صـنعەتێ وی حـەكيمێ دانـا
نەقشـێ ئـەوی قـادرێ توانـا
نـەدبوو كـو نـەبت ئـەوی روسـوومەك
لائـق ئـەوی دێ هـەبت روقوومـەك
هـەرچی وەكـو بوونـە بـێ رەقـەم بـوو
لـەو ئـەووەلێ مـا خەلـەق قەلـەم بـوو

ئـەڤ ئـەووەل و رووح و عـەقلێ ئـەووەل
هەرســـێنە ب ئـــەووەلی موئـــەووەل
ئـەمما مەکـە وان ژ هـەڤ تـو تـەفریق
ئـەڤ ڕەنگـە ئـەوان بگێـڕە تـەوفیق
بـــێ شـــەیئەکی واحـــدن ب جـــارەک
تەعـــداد و تەعـــەددود ئعتبـــارەک
ئـــەووەل بـــەرقی ژ حوســـنێ ســـەرمەد
نـــوورەک بوویـــە مـــەعنییا موحەممـــەد
ئـــەو نـــوور ب ئـــەمرێ (عـــالم الغیـــب)
بـــوو مەنشـــەئێ فەیضـــێ عالـــەما غـــەیب
ئـــــەرواح ژ مەعنـــــەیا پەیەمبـــــەر
چێبـــوون مەثـــەلێ نـــەبات و شـــەککەر
بـــوو ئەصـــلێ ئوصـــوولێ جوملـــە نەفسـان
نەفســا ســـوعەدا و نەفســـێ نـــەحسـان
هـــەمیان ژ وی دیتنـــــە تەفـــەرروع
هـــەمیان ب وی گرتنـــە تەمـــەتتوع
هێـــژا نـــە زەمـــین و نـــە ســـەما بـــوو
ئـــەو ســـەروەرێ جوملـــە ئـــەنبیا بـــوو
خـــەلقا فەلـــەکان ژ بـــۆ وی ڕا بـــوو
ســـەجدا مەلـــەکان ژ بـــۆ وی ڕا بـــوو
ئـــەو ڕەحمـــەتێ جوملـــە عالـــەمین بـــوو
ئـــادەم د میـــانێ مـــاء و طـــین بـــوو

پێغەمبەرێ جەمعێ جوزء و کول بوو

ئادەم ب خوە هێژ ئاڤ و گل بوو

ئەو پەنجەرەیا جەمالێ باری

شەمسا فەلەکا دلێ د تاری

گاڤا کەتە صوورەتێ جەهانی

پێغەمبەرێ ئاخرێ زەمانی

وی بەرزەخێ مومکناتێ واجب

وی پادشەهێ ل شەکلێ حاجب

مەنسووخکرن وی دین و مللەت

مەعلوولکرن وی عەلیل و عللەت

فەکری کو جەهان جەمیع کوفرە

کێشا ژ نوبووەتا خوە سوفرە

خەلقێ کو هەبوون ل ڕوویێ عەردی

تەکلیف کرن هەمی ب مەردی

خاقان ب خوە هندوێ کەمین بوو

فەغفوور ژ خوانێ کاسە چین بوو

قەیصەر ب قوصووریا خوە قاصر

حاضر گەڕیا د عەینێ باصر

شاهێ عەرەبی عەلەم کو ڕاکر

کسرایێ عەجەم عەجەب دوتا کر

ڕۆم و حەبەش و فڕەنگ و تاتار

هەر چ کو نەکر ب دینی ئقرار

ناچـــار گەلـــەک ب شـــیر فـــەنابوون
حـــەتتا کـــو هنـــەک ب دیـــن تـــەبابوون
بوتخانـــــــە ب ئـــــــاگری دشوشـــــــتن
ئاتەشـــــکەدە جوملـــەکی ڤەکوشـــــتن
گاڤـــا کـــو وی دیـــن کـــر ئاشـــکارا
داوودی و ســـــــبطی و نەصـــــــارا
تـــەورات وان ژ بـــەرکـــر ئەکثـــەر
ئنجیـــل و زەبـــوور چـــوون ژ ئەزبـــەر
عیســـایی دەمـــا دخوەنـــد ئنجیـــل
بـــەحثا وی دکـــر ب وەحـــی و تـــەنزیل
گـــۆ: مـــوژدە ددەم رەســـوولێ ئەمجـــەد
دێ پـــاش مـــە بێـــت ب نـــاڤێ ئەحمـــەد
دەعـــوا خـــوە دکـــەت ب دەســـت و ئـــەزمان
دەســـتێ وی ب ســـەیف و دەڤ ب قورئـــان
خـــوەش خلقەتـــە هـــەم رەســـوولە هـــەم میـــر
پـــڕ حکمەتـــە هـــەم کتابـــە هـــەم شـــیر
ناخوەنـــدە ســـەبەق مودەررســـێ عـــام
بـــێ مـــال و منـــال و صـــاحب ئنعـــام
بـــێ خـــەیل و حەشـــەم ب خـــوە جـــەهانگیر
بـــێ طـــەبل و عەلـــەم جـــەهان صـــەداگیر
هـــەرچی تـــە ددی مەگـــەر هـــەر ئـــەو بـــوو
لەشـــکەر ل جونـــوودێ (لـــم تـــرو) بـــوو

بـــێ خەیمـــە و بارگاهـــ و ئـــەیوان
عــەوران ڤـــەددا ل ســـەر وی ســـەیوان
هنـــدی کـــو ژ پێشـــڤە بـــا خەبـــەر بـــوو
ئـــەو چەنـــد ژ پاشـــڤە بـــا بەصـــەر بـــوو
سهـــــ دا نەدکـــەت ژ وی ل عـــەردان
ڤێکـــرا دبهســـت ســـەد خەبـــەردان
گۆیەنـــدە دبـــوون د گـــەل جـــەمادات
پۆیەنـــدە دبـــوون د گـــەل نـــەباتات
یـــەک نـــەوع نـــەما ژ جنســـێ حـــەیوان
نـــەینا ب نوبووەتـــا وی ئیمـــان
ئـــیللا کـــو هنـــەک ژ ئبنـــێ ئـــادەم
بـــوون دەرخـــورێ ئاتەشـــێ جەهەننـــەم
ئەلقصصـــە د ئـــەرض و ئاســـمانان
حاصـــل د جـــەمیعـــێ ئـــنس و جانـــان
نیـــنن ب شـــەرافەتا وی تشـــتەک
نابـــت ژ وی زێـــدەتر مـــە پشـــتەک
ئـــەڤ بـــوو مـــەدەدێ د ئوممـــەتا خـــوە
مومتـــازکرن ب هممـــەتا خـــوە
وەرعـــا وی وە ڕەنگـــە دیـــن قـــەوی کـــر
شـــەرعا وی صـــراط موســـتەوی کـــر
عـــالم هـــەمی شـــوبهێ ئەنبیانـــە
عابـــد هـــەمی پێکڤـــە ئەولیانـــە

فـــەردەک ژ صـــەحابـــەئێ د کوببـــار

پانســــــــەد ژ دلاوەرێ د کوففـــــــار

ئـــەو جوملـــە د گـــەل یـــەکی سەراســـەر

نـــــەدبوون ب مەهابـــــەتێ بەرابـــــەر

خـــەلقێ هەیـــە شـــوبهەیەک د دینـــی

بـــەحثێ ب جـــەدەل بکـــەت ژ دینـــی

قورئـــــان و خەبـــــەر چ مـــــوعجزاتن

ئایـــــات و ســـــوەر چ بـــــەییناتن

بووبـــەکر و عومـــەر چ خـــوەش قـــەرینن

عوثمـــان و عـــەلی عەجـــەب گـــوزینن

ئـــــەی پادشـــــەهێ بلنـــــد پایـــــە

خورشـــید و فەلـــەک نشـــین ســـایە

نـــەعتێ تـــە ب علمـــێ مـــن مەحالـــە

مـــەدداح ژ بـــۆ تـــە (ذولجەلالـــە)

ئـــەز دێ چ ببێـــژم ئـــەی شەهنشاهــــ

وەصصـــافێ تەیـــە کـــەلامێ ئـــەللاهــــ

شـــاها ژ تـــە ڕا خـــوەش ئسمە (یاســـین)

طاهـــا ژ تـــە ڕا طلســـمە (طاســـین)

هـــەر ئەڤ بەسە ئـەی حەبیبێ موختـــار

بـــاری ژ تـــە ڕا ب ژی تـــە سووند خـــوار

ســـەد جـــار ب ژی تـــە ئـــەی کـــەرەمکار

گـــەر دێ مـــە هـــەبن گونەهــ دوســـەد بـــار

سەد مەرتەبە گەر چ ئەم خەرابن

ئەمما ژ تە نائومێد نابن

حەتتا بگەهیتە خانییێ ژار

ناپاک و پەلید و (واجب النار)

ئەو ژی ب خەرابی و صەیینی

دەعوێ دکەتن ب ئوممەتینی

وی بەدعەمەلێ وەکی کلابان

باری بکە پەیرەوێ صەحابان

## ئستدعایێ شەفاعەت و ئستشفاعێ مەغفرەت
## ژ جەنابێ صاحبێ سەریرێ شەفاعەت
## د صوورەتێ معراجێ دا ب بال حەضرەتێ عززەت عظم شانه

ئـەی واسـطـەئـێ ووجـوودێ کەونـەین
شایسـتـەئێ قـوربێ قابـە قەوسـەین
شاهنشـەهێ تەختەگـەهـێ مەدینـە
مـوعجز ژ تـە ئـەو قـەدەر مـە دینـە
سـەیرا فەلـەکان ل نـک تـە گاڤـەک
فـەخرا مەلـەکان ژ تـە سـلاڤەک
(شـق القمـر)ا تـە یـەک ئشـارەت
(زاغ البصـر)ا تـە یـەک عبـارەت
ئـەی پادشـەهێ سـەریرێ (لـولاک)
ڕابـە هـەر ئاسـمانی چـالاک
حاضـر ژ تـە ڕا بـوراق و ڕەفـرەف
شـاطر ب تـە ڕا فرشـتە صـەف صـەف
دا ڕەفـع بـبن ژ بـەر تـە پـەردە
بـێ پـەردە د گـەل خـودێ خەبـەر دە
بێـژێ: تـو قـەدیر و (ذو الجـلال)ی
بێـژێ: تـو قـەدیم و (لا یـزال)ی

ئــەم فــانییێ ژار و موشــتە خــاکین

هــادی تــو نــەبی خــۆ ئــەم هــەلاکــین

ئــەووەل تــە ژ بــۆ ج دا مــە تــەعظیم

دانـــی ل ســەرێ مــە تــاجێ تــەکریم

تەشـــریفێ خلافـــەتێ تـــە دا مـــە

گاڤـــا تـــە ئەمانـــەتێ خـــوە دا مـــە

مــەعلوومی تــە بــوو کــو ئــەم نــەزانین

قـــەدرێ وی ئەمانـــەتی نـــزانین

هــەرچی تــە ژ بــۆ مــە کــر ئــرادە

یــەک ذەررە مــە لــێ نــەکر زیــادە

حاشـــا ژ کـــەمالێ رەئفـــەتا تـــە

دووره ژ جـــەمالێ رەحمـــەتا تـــە

کـــوفر و گونـــەهان بکـــەی بەهانـــە

لایقـــێ تـــە بـــتن ئەڤـــە شـــەهانە

یەکرِوونـــە ل نـــک تـــە کـــوفر و ئیمـــان

یەکســـوونە ل نـــک تـــە خولـــد و نیـــران

قــەهرا خــوە بکــەی ئەگــەر تــو ظــاهر

جەننـــەت ل مـــە دێ ببیتـــە ئـــاگر

وەر فەیضـــێ بکـــەت ســەحابێ رەحمــەت

دۆزەخ ل مـــە دێ ببیتـــە جەننـــەت

گــەر کــافر و گــەر گوناهکــارین

(بالجملـــە) ژ تـــە ئومێـــدەوارین

کـــەس نینـــە ژ کـــافر و عوصـــاتان
مـــەظهـــەر نـــەبتن ژ بـــۆ صـــفاتان
کـافر بـووین ئـەم ب ئـسمێ قـەهار
غـــەففارە کـــو ئـــەم کـــرین گونـــەهکار
کـوفرێ تـــو مەگـــەر نشـــێی ببەخشـــی
گـــەر دێ گونـــەهان ل مـــە نەبەخشـــی
دێ شـــاد بـــبن ل مـــە شـــەیاطین
مســـروور بـــبن گەلـــەک مـــەلاعین
قـــەط غیرەتـــە ئـــەی پـــەناهێ عالـــەم
قـــەط لائقـــە ئـــەی شـــەبانێ ئـــادەم
ئـــەڤ گـــورگێ لـــەعین و بـــەد سـەرەنجام
ژێکـــرا بکـــەتن مـــە شـــوبهی ئـــەغنام
ئـەلقصـە یـەکێ کـو دێـو و سـەرکەش
تـــەنها و ب تـــەنێ بچیتـــە ئاتـــەش
(في الجملە) مە جوملە خاص و عامان
عاصـــی و شـــەقی و ناتـــەمامان
تێکـــرا ب شـــەفاعەتا خـــوە خـــاص کـــە
ڤێکـــرا مـــە ژ ئـــاگری خـــەلاص کـــە

## ئەشعارا مەدیحەتا طەوائفێد کوردانە
## ب شەجاعەت و غیرەتێ ئظهارا بەدبەختی و بێ طالعییا وانە
## د گەل هندە سەماحەت و حەمییەتێ

سـاقی تـو ژ بـۆ خـودێ کـەرەم کـە
یـەک جورعـەئێ مـەی د جـامێ جـەم کـە
دا جـام ب مـەی جهـان نومـا بـت
هـەرچی د ئـرادەیـە خویـا بـت
دا کەشـف بیـت ل بـەر مـە ئـەحوال
کـانێ دبـتن مویەسسـەر ئقبـال
ئـدبارێ مـە وێ گهـا کـەمالێ
ئایـا بوویـە قـابلی زەوالـێ
یـا هـەر وەهـە دێ ل ئسـتوا بـت
حـەتتا وەکـو دەورێ مونتـەها بـت
قـەط مومکنـە ئـەڤ ژ چەرخێ لەولـەب
طـالع ببـتن ژ بـۆ مـە کەوکـەب
بـەختێ مـە ژ بـۆ مـە ڕا ببـت یـار
جـارەک ببـتن ژ خـوابێ هشـیار
ڕابـت ژ مـە ژی جـەهان پەناهـەک
پەیـدا ببـتن مـە پادشـاهەک

شـــیرێ هونـــەرا مـــە بێتـــە دانـــین
قـــەدرێ قەلـــەما مـــە بێتـــە زانـــین
دەردێ مـــــە ببینـــــتن علاجـــــێ
علمـــــێ مـــــە ببینـــــتن رەواجـــــێ
گـــەر دێ هـــەبوویا مـــە ســـەرفرازەک
صـــاحب کەرەمـــەک ســـوخەن یـــەوازەک
نەقـدێ مـە دبوویـە سـککە مەسـکووک
نـەدما وەهـە بـێ رەواج و مەشـکووک
هـەر چەنـدی کـو خـالص و تـەمیزن
نەقـــدەین ب ســـــککەئێ عـــەزیزن
گـــەر دێ هـــەبوا مـــە پادشـــاهەک
لائـــق بـــدیا خـــودی کولاهـــەک
تـــەعیین ببویـــا ژ بـــۆ وی تەختـــەک
ظـــاهر ڤـــەدبوو ژ بـــۆ مـــە بەختـــەک
حاصـــل ببویـــا ژ بـــۆ وی تاجـــەک
ئەلبەتتـــە دبـــوو مـــە ژی رەواجـــەک
غـــەمخواری دکـــر ل مـــە یـــەتیمان
تینانـــە دەرێ ژ دەســـت لـــەئیمان
غالـب نـەدبوو ل سـەر مـە ئـەو رۆم
نەدبوونـــە خەرابـــەئێ د دەســـت بـــۆم
(محکـــوم علیـــە)ی و صـــەعالیک
مـەغلووب و مـوطیعێ تـرک و تاجیـک

ئـەمما ژ ئـەزەل خـودێ وسـا کـر
ئـەڤ رۆم و عەجـەم ل سـەر مـە ڕاکـر
تەبعییـــەتێ وان ئەگـــەر چ عـــارە
ئـــەو عـــارە ل خـــەلقێ نامـــدارە
نامووســـە ل حـــاکم و ئـــەمیران
تـــاوان چیـــە شـــاعر و فـــەقیران
هـەرچی بـرە شـیرێ دەسـتێ هممـەت
ضـەبط کـر ژ بـۆ خوە ب میـری دەولـەت
لـەورا کـو جـەهان وەکـی عەرووسـە
وی حـوکم د دەسـتێ شـیرێ ڕووسـە
لـێ عەقـد و صـداق و مـەهر و کـابین
لوطـف و کـەرەمن عـەطا و بەخشـین
پرسـی ژ دنـێ مـن ئـەڤ ب حکمـەت
مـەهرا تـە چ؟ گۆتـە مـن کـو هممـەت
حاصـل کـو دنـێ ب شـیر و ئحسـان
تەسـخیر دبـت ژ بـۆ وی ئنسـان
ئـەز مامـە د حکمـەتا خـودێ دا
کرمـــانج د دەولـــەتا دنـــێ دا
ئایـا ب چ وەجهـی مانـە مـەحرووم
(بالجملـه) ژ بـۆ چ بوونـە مـەحکووم
وان گـرت ب شـیری شـەهرێ شـوهرەت
تەســخیر کــرن بــلادێ هممـــەت

هـەر میرەکـێ وان ب بـەذلـێ حاتـەم

هـەر مێرەکـێ وان ب رەزمـێ روسـتەم

بفکـر ژ عـەرەب حـەتا ڤـە گورجـان

کرمانجییـە بـوویی شـوبهی بورجـان

ئـەڤ رۆم و عەجـەم ب وان حـەصـارن

کرمـانج هـەمی ل چـار کـەنـارن

هـەردو طـەرەفان قـەبیلێ کرمـانج

بـۆ تیـرێ قەضـا کرینـە ئامـانج

گۆیـا کـو ل سـەر حـەدان کلیـدن

هـەر طائفـە سـەددەکن سـەدیدن

ئـەڤ قـەلـزەمـێ رۆم و بـەحرێ تاجیـک

هندی کـو دکـن خـورووج و تـەحریک

کرمـانج دبـن ب خـوون مولـەطـطـەخ

وان ژێـک ڤـە دکـن مثـالێ بـەرزەخ

جـامێری و هممـەت و سـەخاوەت

مێرینـی و غیـرەت و جـەلادەت

ئـەو خەتمـە ژ بـۆ قـەبیلێ ئـەکراد

وان دانـە ب شـیر و هممـەتێ داد

هنـدی ژ شـەجاعەتێ غـەیوورن

ئـەو چەنـد ژ مننـەتێ نوفـوورن

ئەڤ غـەیرەت و ئـەڤ عولـووێ هممـەت

بـوو مـانعێ حـەمل و بـارێ مننـەت

لــەو پێکڤــە هەمیشــە بــێ تفــاقن

دائـــم ب تەمـــەررود و شـــقاقن

گـــەر دێ هـــەبویا مـــە ئتتفاقـــەک

ڤێکـــرا بکـــرا مـــە ئنقیـــادەک

رۆم و عـــەرەب و عەجـــەم تـــەمامی

هـــەمیان ژ مـــە ڕا دکـــر غـــولامی

تـــەکمیل دکـــر مـــە دیـــن و دەولـــەت

تـــەحصیل دکـــر مـــە علـم و حکمـــەت

تـــەمییز دبـــوون ژ هـــەڤ مـــەقالات

مومتـــاز دبـــوون خـــودان کـــەمـــالات

## سەبەبێ نەظما کتابێ ب ڤی ئەزمانی
## د صوورەتێ شەکوایا ژ دەورانی و گلییا ژ ئەنبائێد زەمانی
## کو ل بال وان یەکسانە هونەردانایی د گەل عەییا نادانی

خانی ژ کەمالێ بێ کەمالی
مەیدانێ کەمالێ دیت خالی

یەعنی نە ژ قابلی و خەبیری
بەلکی ب تەعەصصوب و عەشیری

حاصل ژ عناد ئەگەر ژ بێ داد
ئەڤ بدعەتە کر خلافێ موعتاد

صافی شەمراند ڤەخوار دوردی
مانەندی دوری لسانێ کوردی

ئینایە نظام و ئنتظامێ
کێشایە جەفا ژ بۆیی عامێ

دا خەلق نەبێژتن کو ئەکراد
بێ مەعرفەتن ب ئەصل و بنیاد

ئەنواعێ ملەل خودان کتێبن
کرمانج تەنێ د بێ حەسێبن

هەم ئەهلێ نەظەر نەبێن کو کرمانج
عشقێ نەکرن ژ بۆ خوە ئامانج

تێکـدا نـه د طـالبن نـه مـطلووب
ڤێکـرا نـه مـوحببن ئـەو نـه مـەحبووب
بـێ بـەهره نـەبـن ژ عشـقبازی
فـارغ ژ حـەقیقی و مـەجازی
کرمـانج نـه پـڕ د بـێ کـەمالن
ئـەمما د یـەتیم و بـێ مـەجالن
(بالجملـه) نـه جاهـل و نـەزانن
بـەلکی د سـەفیل و بـێ خـودانن
گـەر دێ هـەبویا مـه ژی خودانـەک
عـالی کەرەمـەک لەطیفـه دانـەک
علـم و هونـەر و کـەمال و ئـذعان
شـعر و غـەزەل و کتـاب و دیـوان
ئـەڤ جنس ببـا ل بـا وی مـەعموول
ئـەڤ نەقـد ببـا ل نـک وی مـەقبوول
مـن دێ عەلـەما کـەلامێ مـەوزوون
عـالی بکـرا ل بـانێ گـەردوون
بیناڤـه روحـا مـەلێ جـەزیری
پـێ حـەی بکـرا عـەلیێ حـەریری
کەیفـەک وە بـدا فـەقیهێ طـەیران
حـەتتا ب ئەبـەد بمـایی حـەیران
چ بکـەم کـو قـەوی کەسـاده بـازار
نیـنن ژ قوماشـی ڕا خەریـدار

خاصما کو د ڤی عەصر دا هەمیان
مەحبووب و حەبیبە بۆ مە هەمیان
یەعنی ژ طەمەع دراڤ و دینار
هەر یەک ژ مە ڕا وە بوونە دلدار
گەر علمی تەمام بدەی ب پوولەک
بفرۆشی تو حکمەتێ ب صوولەک
کەس ناکەتە مەیتەرێ خوە جامی
ڕاناگرتن کەسەک نظامی
وەقتێ کو مە دی زەمانە ئەڤ ڕەنگ
(في الجمله) ل سەر دراڤی بوو جەنگ
حەزکر مە ببینە کیمیاگەر
گاڤا کو مە دی نەبوو مویەسسەر
نصفییە مە پیلەکی عەمەل کر
تەصفییەئێ جەوهەری دەغەل کر
قەلبێ مە نەکر قەبوولێ حیلە
قەط بوو غەرەضێ نەبوو وەسیلە
دین چوو وان نەکەت ب دەست مە دینار
پاشی ژ نەچاری بوینە صەففار
سفرێ خوەئێ خەف مە ئەشکەرا کر
قرطاسیە بوو مە لێ دوعا کر
دەعوەت گەریا ب صدق ئجابەت
بوو واسطەئێ قەضایێ حاجەت

ئــەڤ پــوول ئەگــەر چ بــێ بوهانــە
یەکرِوونــە و صــاف و بــێ بەهانــە
بــێ حیلــەء و خــوردەء و تــەمامن
مــەقبوولێ موعامــەلا عــەوامن
کرمانجییــە صــرفە بــێ گومانــە
زێــرِ نینــە ببــێن: ســپید مانــە
ســفرێ مــە ئــێ ســۆرە ئاشــکارە
زیــڤ نینــە ببــێن کــو کــەم عیــارە
نەقــدێ مــە ببێــژە کــەم بهایــە
بــێ ســککەئێ شــاهێ شــەهرەوایە
گــەر دێ ببویــا ب ضــەربێ مــەنقووش
نــەدما وەهــە بــێ رەواج و مەغشــووش
مەحبووبــە ب کــەس نــە نــامزادە
لــەو بــەخت سیاهــ و نــامورادە
قرطاســیەیا مــە بــێ پــەناهان
بــێ ضــەرب و قــەبوولێ پادشــاهان
مەعلوولــە ل بــا گەلــەک عــەلیمان
مەقبوولــە ل بــا گەلــەک حــەکیمان
لــێ حــاکمێ وەقتــێ مــەعرەفتناک
مەســمووع نــەکر ب ســەمعێ ئــدراک
میــرێ کــو ب نــاڤێ میرزایــە
مەحضــا نەظــەرا وی کیمیایــە

قەلبێـــد زەغـــەل دكـــەت بلـــۆری
پۆلێـــد دەغـــەل دكـــەت فلـــۆری

سـەد بـار هـەبن فلووسـێ ئەحمـەر
دەر حـال دكـەت ب یـەک نەظـەر زەر

ئـەعلایی دكـەت ب قـەهرێ ئـەدنا
ئـەدنایی دكـەت ب لـوطفێ ئـەعلا

پاشـــان دگـــرت وەكـــی ئەســـیران
ئـــازا دكـــەتن وەكـــی فـــەقیران

هــــەر رۆژ هــــەزار بــــێ نــــەوایان
هـەر لەحظـە ب لـوطفێ سـەد گـەدایان

زەنگـین دكـەتن ب دەسـتێ همەـەت
حكمـەت ئەڤـە ناكـەتن چـو مننـەت

گـەر دێ وی نەظـەر بـدا مـە جـارەک
ئكسـیرێ تـەوەججوها مویـارەک

ئـەڤ قـەول هـەمی دكرنـە ئەشـعار
ئـەڤ پـۆل هـەمـی دبوونـە دینـار

ئـەمما نەظـەرا وی زێـدە عامـە
لـەو خـاص نەظـەر ژ دل نـەدا مـە

ئـەو رەحمـەتێ عامـە بـۆ عـەوامێ
یـا رەب بـدە وی تـو هـەر دەوامێ

## فهرستێ سەرئاغازێ کتابێ ئەخبارە
## و ئەشعارێ نەعتێ ئەلقاب و ئاثارە
## د صوورت ئعتراف و ئقرارێ
## ب عەجز و ئنکسارێ د گەل ئعتذارێ

ساقی بکە جامێ ئاسمانی
راحا وەکو رووحێ جاودانی

دا ئەم بکرین دماغێ جان تەڕ
یەک لەحظە ب راحێ رووح پەروەر

ساقی تو برێژە جامێ مینا
ئاڤا کو دکەت ضەمیری بینا

شاداب بگێرە قەلبێ مەحزوون
مەدهووش بگێرە عەقلێ مەجنوون

ساقی بکە کاسەیا موجەوهەر
وی شیرەئێ مەعصەرا موطەهەر

یاقووتێ موذاب و لەعلێ سەییال
وی دوررێ خوەشاب و خەمرێ حەلال

دوردانەئێ خوە برێژە ناڤێ
یەعنی عەرەقا وەکی گولاڤێ

دەم دەم بدە دەستێ مەیپەرەستان
خەلقێ کو هنەک ژ دل د دەستان

دا جـــامێ دلان ببـــت مورەصصـــەع
بـــەزما طـــرەبێ ببـــت موصـــەننەع
ڤـــێ مەجلســـێ مـــەیخوران مـــودامی
مەســـتانە بکـــە ژ نـــوو مـــودامی
مـــومکن کـــو ژ فەیضـــێ بـــێ نهایـــەت
یـــەک قـــەطرە ببـــت ل مـــن هدایـــەت
نەشـــئا قـــەدەحا مـــەیا مـــورەققـــەق
کـــەیفا عنـــەبێ ڕەزێ ب ڕەونـــەق
ئـــەو ڕەنـــگ بکـــەت د نەفســـێ تـــەئثیر
حاصـــل ببـــتن د قـــەلبی تەشـــویر
یـــەعنی بکەڤیتـــە جـــانی شـــەوقەک
حـــەتتا بگەهیتـــە قـــەلبی ذەوقـــەک
تـــەئثیرێ نەفـــەس ببـــت ژ بـــۆ مـــن
تەشـــریحێ قەفـــەس ببـــت ژ بـــۆ مـــن
تەصـــفییەئێ دل ببـــت مـــە حاصـــل
هەڤـــدەنگ بـــبم د گـــەل عـــەنادل
مـــورغێ دلـــێ مـــوردە بێتـــە پـــەرواز
بـــێ پـــەردە ببـــت ترانـــە پـــەرداز
دەم شـــوبهەتی بولبـــولان بنالـــت
گەهـــ شـــوبهی عـــەنادلان بکالـــت
ئاهـــان کـــو ڤـــرێ بکـــەت سەحەرگاهـــ
هـــەموارە د گـــەل نســـیمێ هەمراهـــ

سـەد غونچـەئێ دل ژ بـەر بکـەر بـن

سووسـن ب زەبـان و بـا خەبـەر بـن

بشـکوژە ببشـکڤن ژ خـاران

خـوونرێژە بـبن دمـێ هـەزاران

سـۆرگول بگـرین ب ئەشـکێ شـەبنم

بولبـول بکـەنن ل رەغمـێ هەمـدەم

سـاقی بـدە مـن شـەرابێ گولگـوون

بـێ دەنـگ و دەف و صـەدا و قـانوون

دا شـەحنە و موحتەسـب نـەبینن

شـاهی بجـەڤن چ غـەم نـەمینن

تەشـویش بچـن ژ قـەلبێ مـەحزوون

دیسـان بـبم ژ نـوو دگـەرگوون

مـەخموور بـبم بکرمـە لافـان

سـەرخوەش بـبم بکـەم گوذاڤـان

بـێ کـەیف نەشـێم چ ئـەز ببێـژم

دیوانـە بـبم دوڕان برێـژم

بـەدحال بـبم سـوڕان ب دەر دەم

بـێ قـال ژ بـاطنی خەبـەر دەم

تەشـبیهی نـەیێ بکـەم تـەرەننوم

طـووطی صـفەتێ بکـەم تەکـەللوم

دا کەشـف بـبن ژ مـن کـەرامات

مەشـهوود بـبن ل مـن مـەقامات

شوعبە ژ مەقامێ دل ب ئاواز
گول گەشش بکەن کەوەشت و شەهناز
بێ دەنگ ژ غەورێ دل ب ئاهەنگ
سەد ڕەنگ صەدا بدەم وەکی چەنگ
مانەندی ڕەبابێ بێ کەمانچە
دەنگ بێ ژ دەفا مە بێ طەبانچە
زوهرە ببهت نەوایێ عوششاق
ڕەققاص ببت ل ئەوجێ نوهـ طاق
سازێ دلێ کول ب زیر و بەم بت
سازندەئێ عشقێ زین و مەم بت
شەرحا غەمێ دل بکەم فسانە
زینێ و مەمێ بکەم بەهانە
نەغمێ وە ژ پەردەئێ دەرینم
زینێ و مەمێ ژ نوو ڤەژینم
مەعلوول بوویین حەبیب و عاشق
ئیرۆهە وەکی طەبیبێ حاذق
دەرمان بکەم ئەز ئەوان دەوا کەم
وان بێ مەدەدان ژ نووڤە ڕاکەم
دەردێ د دلێ مەمێ جگەرڕێش
زینا ژ دەروونێ دل جەفاکێش
وێ پەردەگییا عەفیفە مەستوور
وی بێ گونەهێ ژ توهمەتێ دوور

مەشـهوور بكـەم ب طـەرز و ئوسـلووب

مومتـــاز بـبن موحبــب و مـــەحبووب

ئـەو ڕەنـگ بكـەم ژ نـوو سـەرئەفراز

دا بێنــــه تەماشــــەيێ نەظـــــەرباز

دلبـــەر ل مــــەمێ بكـــەن گرينـــێ

عاشـــق بكـــەنن ب دەردێ زينـــێ

هەمـــدەرد بكـــەن ب وان صــــەفــايێ

بـــێ دەرد بكەڤنــــه (حـــەلوەلايێ)

خـــەلقێ كـــو ژ سـينه و ژ دل صـــاف

پـــاكيزە سورشــت و ئـــەهلێ ئنصـــاف

(بالجملـه) بكـەن ژ بـۆ مــه تەحسين

بێـژن كــو ب قــەنجی هاتــه تــەدوين

خــــەلقێ ژ (يحـــبهم) دگــــەرگوون

هــەرچی ژ ئـــەزەل بـــوويی (يحبـــون)

دا بـــێن و بكـــەن حكايـــەتێ گـــۆش

هنـــدەک بكـــەرن خـــوه پـــێ فـــەرامۆش

هنـــدەک بكـــەرن ب جـــان ســـەماعێ

هـــن پـــێ بكـــەرن ژ دل وەداعـــێ

لـــێ هيڤـــی دكـــەم ژ موســـتەعيدان

حـــەرفان نـــەگرن ل موســـتەفيدان

ئـەڤ نامــه ئەگــەر خرابــه گــەر قــەنج

كێشـايه مــه وێ د گــەل دوســەد ڕەنـج

نووبارەیـــــە طفلـــــە نوورەســـــیدە

هــەر چەنــدە نــەهین قــەوی گوزیــدە

لــێ مــن ژ رەزان نــەکر تەمــەتتوع

مانەنــدێ دزان ب کــەس تەتــەببوع

نووروســـــتێ حەدیقـــەئێ فوئــــادە

مەعصــــوومە عەفیفــــە خانــــەزادە

نــەوبارە ئەگــەر شــرینە گــەر طــال

مەطبووعــە ژ ڕەنگــێ طــەبعێ ئــەطفال

مــن هیڤــی هەیــە ژ ئــەهلێ حــالان

تــەقبیح نەکــەن ئــەڤان طفــالان

ئــەڤ مێــوە ئەگــەر نــە ئابــدارە

کرمانجیــە ئــەو قــەدەر ل کــارە

ئــەڤ طفلــە ئەگــەر نــە نازەنینــە

نــەوبارە ب مــن قــەوی شــرینە

ئــەڤ مێــوە ئەگــەر نــە پــڕ لــەزیزە

ئــەڤ طفلــە ب مــن قــەوی عــەزیزە

مــــەحبووب و لبــــاس و گووشــــوارە

مــولکێ د مــنن نــە موســـتەعارە

ئــــەلفاظ و مــــەعانی و عبــــارات

ئنشــــاء و مــــەبانی و ئشــــارات

مەوضــووع و مەقاصــد و حکایــات

مــــەرمووز و مــــەناقب و درایــــات

ئوسلووب و صفات و مەعنە و لەفظ
ئەصلەن نەکرە مە یەک ژ وان قەرض
(بالجملە) نەتائجێ د فکرن
دووشیزە و نەو عەرووس و بکرن
یا رەب مەدە دەستێ خەلقێ ناساز
ڤی شاهدێ دلروبایێ طەنناز
ئومێد ئەوە ژ ئەهلێ عرفان
ئەو دێ نەگرن ل من چو حەرفان
تەشنیع نەکەن وەکی غەیووران
ئصلاح بکەن ل من قوصووران
ئەصحابێ کەمالێ پەردەپۆشن
ئەربابێ غەرەض د پڕ خورۆشن
مەئموول ئەوە ژ ئەهلێ رازان
ئەو دێ نەکرن ب من طنازان
ئەز پیلەوەرم نە گەوهەریمە
خودرەستەمە ئەز نە پەروەریمە
کرمانجم و کۆهی و کەناری
ڤان چەند خەبەرێ د کوردەواری
ئمضا بکەن و ب حوسنێ ئەلطاف
ئصغا بکەن ئەو ب سەمعێ ئنصاف
ئەصحابێ غەرەض کو گوهـ بدێرن
عەیبان ب کەرەم ل من ڤەشێرن

ئاڤـــا ڕویـــێ شـــاعری نـــەڕێژن
گــەر مومکنـــە یێکــە قــەنج ببێــژن
سـەهو و غەلـەطان نەکـەن تەعـەجوب
تــەئویل بکــەن ژ بــۆ تەعەصــوب

## مەبدەئێ مەقالەئێ نەعتا حاکمێ بوهتانێ خودان ئقبال (أمیر زین الدین بن أمیر أبدال) د گەل وەصفا هەردو هەمشیرەئێد وی و صاحب جەمال زین و ستییێ د بێ مثال

نەققاشـێ صـەحیفەئێ حکایـەت
نـەققادێ سـەبیکەئێ روایـەت

کێشا ب ڤـی طـەرحی رەسم و ئـایین
لێدا ب ڤـی طـەرزی ضەرب و تـەزیین

گـۆ: پادشـەهەک زەمـانێ سـابق
رابـوو د حوکومـەتا خـوە فـائق

ئەجناسـێ مللـەل موطیـع و مونقـاد
نەسـلا وی عـەرەب ئـەمیرێ ئـەکراد

تـەختێ وی جزیـر و بـەختێ مەسـعوود
طـالع قـەوی و مـەقامێ مـەحموود

رۆم و عـەرەب و عەجـەم د فـەرمان
مەشـهوور ب نـاڤێ میـرێ بوهتـان

ئابـائێ عظـام و جـەدد و والـد
مەنسـووب و موسەلسـەلێد خالـد

جـەبباری فەلـەک ژ وی حـەذەرکار
مەسـلوول ژ سـەللێ سـەیفێ جـەببار

زیبەنــدەئێ مولــک و زەینــێ دیــن بــوو
نــاڤێ وی ئــەمیری (زەینــەدین) بــوو
میــری ژ وی ڕا ب زەیــن مووەصــەف
زینــەت ژ وی ڕا ب دیــن موعــەررەف
ئاثــارێ شــەجاعــەتا وی شــاهی
داگرتــی ژ مــاهێ تــا ب مــاهی
ماهییــەتا وی مــەدارێ دونیــا
شــاهییەتا وی شــعارێ عوقبــا
موحتــاجێ ســەخاوەتا وی حاتــەم
مــەغلووبێ شــەجاعەتا وی روســتەم
حاتــەم ژ کــەمالێ هممــەتا وەی
طوٚمــارێ ســەخاوەتا خــوە کــر طــەی
عــەقل و هونــەر و ســەخا و مەیــدان
ضــەبط و نەســەق و نظــام و دیــوان
دینــداری و دەولــەت و دیانــەت
ســەرداری و صــەولەت و صــیانەت
مەشــحوون ژ هــەر یــەکی خەزینــەک
مــەکنوون ژ هــەر یــەکی دەفینــەک
بــێ عوســر ژ بــوٚ وی ڕا مویەســەر
بــێ خوســر ژ بــوٚ وی ڕا موقــەددەر
ئــەنواعێ نــەوادر و جــەواهر
ئــەلوانێ نــەفائس و زەواهــر

مەجمووعـەئێ مومکنـات و مەقصـوود
واجـب کربـوون ل نـک وی مـەوجوود
حاصـل ب وی موددەعـا و مـەطلووب
واصـل ب وی موشـتـەها و مـەحبووب
صـــەحنا حـــەرەمێ ژ نازەنینــــان
جەننـــەت تـــژی بـــوو ژ حوورعینـــان
حـووری د وێ جەننـەتێ گەلـەک بـوون
غلمـان وی د حەضـرەتێ مەلـەک بـوون
لـــێ زادەئـــێ دوودەمـــانێ دەولـــەت
نـــەوبادەیێ بۆســـتانێ رفعـــەت
شـەهزادە دو بـوون ل نـک وی شـاهی
خورشـید دو بـوون ل نـک وی مـاهی
یـــەعنی کـــو ژ وی نـــەژادێ عـــالی
هەمشـــیرە دو بـــوون د (لا أبـــالي)
یـەک سـەروێ ریاضـێ ڕاسـتی بـوو
وێ نـاف ب ڕاسـتی سـتی بـوو
یـــا دی ژ دل و هنـــاڤێ میـــر بـــوو
وێ نـاف ژ نصـفێ نـاڤێ میـر بـوو
راوی وهـە گۆتـە مـن موعـەمما:
ئـەو حـوور ب نـاڤێ زیـن موسـەمما
یـەک زێـدە شـرین زیـادە مـەحبووب
یەک رووحێ قولووب و حوورێ مەقلووب

یەک ئسمەر و یا دویێ زەری بوو
یەک حووری و یا دویێ پەری بوو
ئەو حوور و پەری د بێ بەدەل بوون
لەورا کو ژ نووریێ (لم یزل) بوون
حوسنا روخێ وان چو کەس نەدی بوو
زیرا ژ جەمالێ سەرمەدی بوو
لەب لەعل و سەمەن عوزاریێ گولروخ
رەونەق شکەنێ بتانێ خوللوخ
زولفەین مثالێ طایێ سونبول
خەددەین ژ ڕەنگێ ڕوویێ سۆرگول
ئەو سۆرگول و سونبولێ د ئازاد
بشکفتی ل قەددێ سەروێ شمشاد
سۆرگول ژ خوە ڕا ل سەر هەروستی
سونبول ب خوە پێکڤە داهەڕستی
حوسنا خەطێ روخ ژ خەططێ یاقووت
چاها ذەقەنێ ژ سحرێ هارووت
گۆیا کرِوو ژ مشک بیزی
رەممالێ فەلەک نوقاطێ ریزی
خال و نوقەط و بەیاض و حومرە
بەیت و حەجەر و طەواف و عومرە
ئەبروو ژ کەمانێ قەوسێ ئەفلاک
موژگان ب مثالێ سەهمێ سەماک

سـەرمايیە وەحشـەتا جونوونـان
مـەرمووز د دەهشـەتا عويوونـان
مـەبهووت د بـوون د (طرفـة العـين)
كەششـافێ رومـووزێ (حكمـة العـين)
جەبهـەت د نومـا ژ طـەرفێ ئكليـل
گۆيـا ل ئوفـوق جـەناحێ جبريـل
وەسـطايە ل ئسـتوايێ دايـم
خورشـيد د خدمـەتا وێ قـايم
هـەرچى بـديا روخ و بنـاگۆش
(فـي الحـال)ى ب دەردا ژ بـۆ هـۆش
گـەردەن تـە دگـۆ د دەسـتێ سـاقى
قاروورەيـە پـوڕ شـەرابێ بـاقى
يـان شـوبهەتى شيشـەيا نـەباتێ
يـان مەنبـەعێ كاهنييـا حـەياتێ
سـەرپەنجە و نـاخونى موحـەننا
رەنجەنـدەئێ خـاطرێ موهـەننا
خـەلقێ كـو ددیـتن ئـەو كەمەرگاهـ
حاضـر دكـرن ژ غـەورێ دل ئاهـ!
ظـاهر دكـرن كـو زەنـد و بـازن
ئێـدى نـەدما گلـى و گـازن
هەر چەندە كو هەردو شوبهى جان بوون
ئەو هەردو ب حوسنێ تەوئەمان بوون

هـەر چەنـدە سـتی وە نـازەنین بـوو
لـێ زیـن ژ مشـالێ حـوورێ عـین بـوو
هـەر چەنـدە سـتی سـتارە وەش بـوو
لـێ زیـن ب روخـان هەییڤـە گـەش بـوو
هـەر چەنـدە سـتی وەکـی قەمـەر بـوو
زیـن مهـر صـفەت زیادەتـەر بـوو
ئـەو هـەردو وەکـی دو شـەب چراغـان
گاڤـا دمەشـینە بـاغ و راغـان
نـالان دکـرن جـەماد و حـەیوان
تـالان دکـرن نـەبات و ئنسـان
کـۆفی ژ جـەواهران موکەللـەل
کۆترکـە ژ نـەترکـان موسەلسـەل
سـەربەند و قەصـەب ددا جـەبینێ
عاشـق دمـرن ب دەردێ زینـێ
ئەڤ زینەت و خەمل و قەشت و چەنبەل
ئـەز پـێش و پـەس و یـەمین و قەنبـەل
گاڤـا دمەشـین پـەری د گـەل وان
والهـ دکـرن وەلـی د خـەلوان
گـەر شـەیخە و گـەر مـەلا و میـران
دەرویـش و غـەنی وە گـەر فـەقیران
کـەس نینـە نـە طـالبێ جـەمالێ
کـەس نینـە نـە راغبـێ وصـالێ

هــــن راغبــــێ حوســــنێ لا یــــەزالن
هــــن طــــالبێ قــــالبێ بــــەطالن
لــێکن هــەمیان یەکــە یــەقین دۆســت
فــەرقا کــو هەیــە ژ فــەرقێ تــا پۆســت

## تەحسینا قوماش و کالایێ والایێ حوسنا حەبیبانە عومووما
## تەقریضا جەوهەرێ بێ بهایێ جەمالا ستی و زینانە مەخصووصا

هنـــدی کـــو د قەصـــەرییێ دونیـــا
ڤێکدانـــە خـــودی مـــەتاع و کـــالا
مـــەجمووعێ خەزانـــەئێ د قەیصـــەر
حـــەتتا ڤەکـــە دەخمـــەیا ســـکەندەر
دوڕڕێ د دەفـــــائنێ د خاقـــــان
لـــەعلا کـــو د خاتـــەما ســـولەیمان
هـــەر چەنـــدە زیـــادەتر بـــەهـــا بـــن
(بالجملـــە) ب جـــوزئێ حوســـنێ نـــابن
حوســـــنا ل روخـــێ ســـتی و زینـــێ
بـــەحرا کـــو ژ ئاتەشـــێ ئـــەڤینێ
پـــێلا کـــو دگرتـــە پێـــل و مـــەوجان
ڕۆژا دکەتـــــە حەضـــیض و ئـــەوجان
ســـەد جـــان و دل و جیگـــەر دســـۆتن
خـــەلقی بـــێ مثـــل ژ وان دگـــۆتن
شـــەمس و قەمـــەران قرانـــە پێکڤـــە
لـــەو موشـــتەری ئـــەڤ جـەهانـــە پێکڤـــە

صـــەبیادێ جـــەمالێ وان غـــەزالان
صـــــەبیاتێ صـــــەدایێ وان دەلالان
دەلـــلال و صـفەت گەلـەک صـفەت شێر
ژ ئـــەفغان و ژ نالیـــان نـــەبوون تێـــر
ڕۆژان و شـــەڤان گەلـــــەک دنـــالین
حـــەتتا کـــو د گـــەل مەلـــەک دکـــالین
حوســـنا نـــەبتن چـــو حـــەدد و غایـــەت
نابـــت ژ خـــوە عاشـــقا نهایـــەت
لـــێ عاشـــق و (بوولهـــەوەس) جودانـــە
هـــــن فائـــــدەخواز و هـــــن فدانـــــە
جانـــان طەلـــەبن هنـــەک ژ بـــۆ جـــان
هـــن جـــان طەلـــەبن ژ بـــۆیی جانـــان
هـــن وەصـــلحەبین ژ ڕەنگـــێ تاجـــدین
هـــن دەردگـــوزین وەکـــی مـــەم و زیـــن

## عطفێ عنان و لجامە
## ب سەرئەنجامێ کەلامە

دا بێنە ب سەر حکایەتا پێش
خەلقێ کو ژ دەردێ عشقێ دلرێش
هەر چەندە کو بێ حەد و قیاس بوون
عامی و خەوادم و خەواص بوون
لێکن ژ خەوادمێ د مومتاز
سەد لاوێ سەهی قەد و سەرئەفراز
هەر یەک د مەقامێ حوسنێ ڕۆژەک
هەر یەک ب کەلامی سینە سۆژەک
هەر یەک ب کەمالێ بەدرێ ماهەک
هەر یەک ب جەمالێ صەدرێ شاهەک
ئەو ژی هەمی عاشقن د طالب
ئەو ژی هەمی طالبن د راغب
لێکن نە ب دیتن و شەهادەت
بەلکی ب بهیستن و ریوایەت
(بالجملە) د خذمەتا ئەمیر بوون
(في الجملە) ژ سررێ هەف خەبیر بوون

سەرحەلقەئێ وان پەری مشالان

سەرتاجێ ئەوا مەلەک خصالان

تاجدین دگۆتنێ جوانەک

گۆدەرزێ زەمانە پەهلەوانەک

نەسل و نەسەب و حسەب عەیان بوو

سەردەفتەر و سەروەرێ کوڕان بوو

بابێ وی دگۆتنێ سکەندەر

لێکن عەرەبان دگۆ غەضەنفەر

لەورا کو ب شیری شوبهی شێر بوو

ڕۆژا شەڕی ئەو هەزارە مێر بوو

تاجدین دو برا هەبوون د قەللاش

مانەندی دو شاهبازێ جەمماش

دائم دلێ دوژمنان دسۆتن

یەک عارف و یەک چەکۆ دگۆتن

ئەمما وی ژ جوملە خاص و عامان

ژ ئەو چەندی برا و باب و مامان

لاوەک کریوو برا ژ بۆ خوە

نێ ئەز غەلەطم چرا ژ بۆ خوە

ڕۆژا کو ئەوی برا نەدیتا

تەشبیهی شەڤا چرا نەدیتا

دونیا ل وی تێک دبوویە تاری

ڕۆژ بوو کو ل وی دکر تەواری

ئـەنبازێ فـەرەح شـەریکێ غـەم بـوو
سەرگەشـتەئێ غـەم ب نـاڤێ مـەم بـوو
مـەم ژی ل وی عاشـقەک تـەمام بـوو
نـە شـوبهی بـرا و بـاب و مـام بـوو
هـەر چەنـدە برایـێ ئـاخرەت بـوو
تـە دگـۆ کـو دنـی و ئـاخرەت بـوو
تاجـدین وەلـەدێ وەزیـرێ دیـوان
مـەم ژی خەلـەفێ دەبیـرێ دیـوان
ئـەو هـەردو جـوان وە لێـک د عاشـق
ئـەو هـەردو بـرا وە پێکڤـە صـادق
یـەک قەیسـێ زەمانـە یێـک لـەیلا
یـەک وامقـێ عەصـر و یێـک عـەذرا
یـارێ ژ دلـی نـە سەرسـەری بـوون
رەهـ شـوبهەتی مهـرێ موشـتەری بـوون
یـاری و برایـی و موئاخـات
نابـت ب ریـایی و مـەقالات
یـاری نـە هێسـانییە جەفایـە
مەقصـوود ژ یـارییێ وەفایـە
ئـاخر تـو ئەگـەر نەکـەی وەفـایێ
ئـەووەل مـەدە بـەر خـوە وێ جـەفایێ

## داستانا بەیانا نەورۆزا سولطانی
## تسمیەیێ مەوسمێ سورورو و شادمانی
## ب مەرسومێ قەدیمێ کوردستانی کو وان دگۆتێ: سەرسال عەد دکرن ب عیدێ وصال

خـەللاقێ جـەهان ژ فەیضــێ فطــرەت
هەیئاتــە فەلــەک ب وەجهــێ قــودرەت
بــێ قالــب و بــێ مــوحیط و مقیــاس
بــێ ئالــەت و بــێ مــەشیر و مقــراص
ئــەڤ چەنــدە موعەظظــەم و مــودەووەر
ئــەڤ ڕەنگــە موصــەننەع و موکــەررەر
ئینانـــــە ب مەعرەضـــا ووجـــوودێ
کێشـــانە ب مەنظـــەرا شـــوهوودێ
حکمــەت ئــەوە ئــەڤ هــەمی ل کــارن
هنــدەک د پــەیا و هــن دســـوارن
هنــدەک د بــەطیء و هــن ســەریعن
هنــدەک د مــوعین و هــن مــەنیعن
هــن مــودبرن ئــو هــەنــەک مــودەببر
هــن مــوقبلن ئــو هــەنــەک موقــەددر
هــن کــاتبن ئــو هــەنــەک د ئوســتاد
هــن مــوطربن ئــو هــەنــەک د جــەللاد

هـــن رۆژپەرەســـت هـــن شـــەب ئـــەفرووز

هن غوصصە دەفین و هەم غـەم ئەندووز

هنـــدەک د مثـــالێ زیـــن زەرینـــە

هـــن شـــوبهێ مـــەمێ دموشـــتەرینە

(بالجملـــە) موصـــەیقەل و مـــونیرن

هـــن پادشـــەهن هـــەنـــەک وەزیـــرن

هنـــدەک ژ تەحـــەرروکا طـــەبیعی

ئـــەو تێنـــە ب نوقطـــەیا رەبیعـــی

تەجدیـــد دکـــن ژ ماهـــ و ســـالێ

گاڤـــا وەکـــوو تێنـــە ئعتـــدالێ

دانـــایێ موعـــەممـــرێ کوهـــەن ســـال

ئـــەڤ ڕەنگەهـــە کـــر ژ بـــۆ مـــە ئـــەحوال

گـــۆ: عـــادەتێ پێشـــیێ زەمانـــان

ئـــەڤ بـــوو ل هـــەمی جـــی و مـــەکانان

وەقتـــێ وەکـــوو شەهســـوارێ خـــاوەر

تـــەحویل دکـــر د مـــاهێ ئـــازەر

یـــەعنی کـــو دهاتـــە بـــورجێ سەرســـال

قـــەط کـــەس نـــەدما د مســـکەن و مـــال

(بالجملـــە) دچوونـــە دەر ژ مـــالان

حـــەتتا دگەهشـــتە پیـــر و کـــالان

ڕۆژا کـــو دبوویـــە عیـــدێ نـــەورووز

تـــەعظیم ژ بـــوو دەمـــا دل ئـــەفرووز

صـــەحرا و چەمـــەن دکرنـــە مســـکەن
بەیـــدا و دەمـــەن دکرنـــە گولشـــەن
خاســـما عـــەزەب و کچـــێ د بـــاکر
(القصـــــه) جـــــەواهرێ د نـــــادر
تێکـــدا د موزەییـــەن و مولەببـــەس
ڤێکـــرا ل تەفـــەرروجێ مورەخخـــەص
لـــێکن نـــە ب توهمـــەت و ب مننـــەت
بـــەلکی ب طـــەریقێ شـــەرطێ سوننەت
لـــەورا کـــو ئـــەوان غـــەرەض ژ گەشـــتێ
مەقصـــوود ژ چووینییـــا ب دەشـــتێ
ئـەو بـوو کـو چ طالـب و چ مـەطلووب
یەعنی دو طـەرەف موحبب و مـەحبووب
ئـەڤ هـەردو جەلـەب کـو هـەڤ ببیـنن
کـوفئێ د خـوە ئـەو ژ بـۆ خـوە بیـنن

## ب دەرکەتنا شەهریانە ب دەشتێ
## ژ بۆ سەیران و سەرسال و گەشتێ

دەورا فەلـــەکێ ژ بـــەختێ فـــەیرۆز
دیســـان کـــو نومـــا ژ نووڤـــە نـــەورۆز
مـــەبنی ل وی عـــادەتێ موبـــارەک
شـــەهری و ســـپاهییان ب جـــارەک
بـــاژێر و کـــەلات و خـــانی بـــەردان
تەشـــبیهی ب نژدەیـــان و جـــەردان
صەف صەف دمەشینە کووهـ و دەشتان
رەف رەف دخشـــینە ســـەیر و گەشـــتان
ئەصـــنافێ ئومـــەم صـــغار و کوبـــار
قـــەطعا قـــە نـــەما د شـــەهری دەییـــار
هنـــدەک ب پـــەیایی چوونـــە باغـــان
هنـــدەک ب ســـواری چوونـــە راغـــان
هنـــدەک ب تـــەبایی و ب کثـــرەت
هنـــدەک ب هـــەڤالی و ب وەحـــدەت
ڕابوونـــەڤـــە خـــانم و خـــەواتین
وان ژی تـــژی گـــول کـــرن بـــەســـاتین

حووران کره مسکەنێ خوە جەننەت

بێ پەردە و بێ مەلال و مننەت

دۆشیزە و دوختەر و روالان

پاکیزە عوزار و زولف و خالان

ئەتراب و کەواعبێ د عەزرا

مووردان و مووراهقێ د زیبا

ئەصحابێ قوماش و لوطف و روخسار

ئەربابێ مەتاع و حوسن و دیدار

وان لێک دکرن مەتاع یەک عەرض

تەخمین دکرن ب (طول و العرض)

سەوداگەرێ عشقێ بوون د بازار

هەم بایعێ حوسن و هەم خەریدار

سەرسالی و باکر و روالان

سەدسالی و لاو و پیر و کالان

سەرسال ل رەسمێ راهێ مەعهوود

گێڕان د جهـ و مەقامێ مەحموود

## مورەخخەصبوونا وشاقانە ب گولشەنا سەرسالێ
## رەغبەتکرنا وانە ب بازارا حوسن و جەمالێ

قەنـــدیلێ مـــونیرێ دیـــرێ ئـــەزرەق
مشـــکاتێ حەمـــەل کـــو کـــر مـــوەررەق

سەرســـال کـــو بـــوو ژ نووڤـــە مـــەعموور
میـــر دایـــە کـــورێ د تـــازە دەســـتوور

دەســـتوور کـــو بـــوو ژ بـــۆ وشـــاقان
ڕابـــوون هـــەمی شـــوبهەتی عوشـــاقان

تێـــک چوونـــە ب مەعرەضـــا مـــەزادێ
دلـــدادەئێ مەقصـــەد و مـــورادێ

ئـــیللا ب تـــەنێ مـــەمۆ و تاجـــدین
وان دانـــە خـــوە دوختەرانـــە تـــەزیین

یـــەعنی د دەمـــا کـــو بوویـــە تـــەحویل
ئـــەو هـــەردو بـــرا د جامـــە تەبـــدیل

ئســـتەبرەق و سوندســـن د بـــەردا
چەنـــد معجـــەر و مەقرەمـــە ب ســـەردا

کـــاکول کربوونـــە طـــوررە هەرســـوو
پەرچـــەم کربوونـــە زولـــف و گیســـوو

وان لــەو كربــوو لبــاس تەصــريف
دا قــەط نــەبتن ل وان چــو تــەكليف
پۆشــــيده لباســـێ دلبـــەرانی
ســـەيران دكـــرن ب ســـەرگرانی

## مولاقيبوونا تاجدين و مەمێيە ب ستی و زينێ
## موستەغرقبوونا وانە د بەحرا عشق و ئەڤينێ

وان هـەردو كـوڕێ د جامـە تەبـديل
وەقتـێ دكـرن د شـەهری تـەحويل
ناگاهـ و عەجايـەک نمـا وان
يـەک جـوزئێ ژ عـەقلی قـەط نـەما وان
ديـتن د مەحەللـە و زوكاكـان
هـەر كووچـەء و غورفـە و شـباكان
سـەد تـازە جـوان ژ ڕەنگـێ سـەروان
ديبـا ئـو حـەرير و خـەز د بـەر وان
پانسـەد ژ كـەچ و كـوڕ و روالان
ئـەو چەنـد ژ قسـمێ پيـر و كـالان
ئـەنواعێ موذەككـەر و موئەنـەس
هنـدەک د بـەرەهنـە هـن مولەببـەس
هنـدەک د ئـەعالی و ئـەكابر
هنـدەک د ئـەدانی و ئەصـاغر
پێخـواس هنـەک هنـەک د سـەركۆل
كاشـۆ ژ پييـان و سـەر وەكـی هـۆل

سەرمەست هنەک هنەک د سەرخوەش
دەم بەستە هنەک هنەک د دەم خوەش
گۆیەندە هنەک هنەک د خامووش
پۆیەندە هنەک هنەک د مەدهووش
هن جامە دوریدە هن د سەرخوەش
هن عەقل رەمیدە هن موشەووەش
هندان دکرن فغان و فریاد
هن بوویی ژ قەیدێ عەقلی ئازاد
هەر یەک د مەقامەکی دگەرگوون
هەر یەک ب جەفایەکێ جگەرخوون
ئەو هەردو دەمەک ڤەمان تەحەییور
بوون غەرقەئێ لوجەئێ تەفەککور
تاجدین سەککنی و پرسیار کر
پرسا خوە ب ئێکێ ئختیار کر
گۆ: ئەی خەضرێ رەهێ هدایەت
بێژ ئەڤ چ بەلایە بێ نهایەت
وی گۆت دو شەهلەوەندێ شەدداد
ئیرۆ ل ڤی خەلقی بوونە جەللاد
هەر چی کو دبینن ئەو دو سەرخوەش
(في الحال)ی دکەن وها موشەووەش
وان گۆ: تە نەدی کو ئەو چ ڕەنگن
وی گۆ: دو کوڕن زیادە شەنگن

وان گۆ کـو ب شـیر و شەشـپەڕن ئـەو
یانـــە ب خـــەدەنگ و خەنجـــەرن ئـــەو

وی گـــۆ کـــو ب غـــەمزە و ب بـــاور
خـــەلقی دکـــوژن وەکـــی ب کـــەیبور

وان پـــڕس دکـــرن کـــو گـــەر ببیـــنن
دا بـــۆ خـــوە ب مـــەردی دەســـت هلیـــنن

هـــەردو د وی کـــاری بـــوون کـــو ناگاهـــ
دیـــتن کـــو ژ مەحضـــێ (قـــدرة اللـــه)

ئـــەو هـــەردو پوســـەر وەکـــی دو پەیکـــەر
تابەنـــدە ب شـــەکلێ شـــاهێ ئەختـــەر

یـەک هەیئـەت و شـەکل و یـەک لباسـن
ئـەمما د وی شـەهری ڕەنـگ نەناسـن

ســـیرەت مەلـــەکن صـــوەر پەرینـــە
نـــە بـــائعن ئـــەو نـــە موشـــتەرینە

ڤـان هـەردو بـران کـو ئـەو دو ئـەوباش
دیـــتن دل و جـــان وە دان ب شـــاباش

ئـەو ڕەنـگ گـەڕیان جونـوون و والهــ
ئێـدی قــە نـەبوون ژ عـەقلی ئاگەهــ

نـە فـەهم و خرەد نـە عـەقل و نـە هۆش
کەتبوونـە ل سـەر زەمینـێ مـەدهووش

(في الجملـه) ژ عـەقل و جانی تێربـوون
(في الحـال)ی ژ دوورڤـە هەردو گێربـوون

وان هـــەردو فریشـــتەئ د کوبـــار
دیـــتن دو مەلـــەک زیـــادە دلـــدار
مەهپارەنـــە لێـــک ئافتـــابن
دلدارەنـــە لـــێ جگـــەر کـــەبابن
تەشـــبیهی ب صـــەیدێ نـــیم بســـمل
بـــێ شـــوبهە گهانـــە حـــالێ موشـــکل
ناچـــارە بەزینـــە ســـەر شـــکاران
فکرینـــە روخـــێ د وان نگـــاران
زانـــین کـــو نـــە صـــەیدێ سەرســـەرینە
ســـەرخەیلێ ســـپاهێ دلبـــەرینـــە
وەســـتان و نەظـــەرکرن ب دققـــەت
وان هاتـــە ب قـــەلبی رەحـــم و رققـــەت
(القصـــە) ژ حوســـنێ ڤـــان غـــەزالان
رەحمـــەک کەتـــە قـــەلبێ وان رەوالان
ســـررا دلـــی کـــر ب هـــەڤ تەعـــەللوق
نـــوورا روخـــی کـــر ب هـــەڤ تەعششـــوق
مەکشـــووفێ طـــەریقێ ئاشـــنایی
رووحـــان قـــە نـــەکر ژ هـــەڤ جـــودایی
یـــەک ڕەنگـــی صرف د عالـــەما غـــەیب
ظـــاهر دکـــر ئتتحـــادێ لا رەیـــب
حـــوببێ وە کـــرن ب هـــەڤ گرفتـــار
حوســـنێ وە کـــرن ب هـــەڤ طەلـــەبکار

تـه دگـۆ كـو چ قالـب و چ مـﻪقلووب
هـﻪر چـار چ طالـب و چ مـﻪطلووب
بـێ شـوبهه یـﻪكن چ تـﻪن چ ئـﻪرواح
ئـﻪو موتتهحـدن چ جـان چ ئشـباح
حوبـــا د دلان وه كـــر عـــﻪداوهت
بوغضـــا د دلان وه كـــر حـــﻪلاوهت
نسـبهت ب مـه حـادثن عـﻪدیمن
لـــێكن ژ حهقیقـــﻪتا قـــﻪدیمن
لـﻪورا كـو جونـوودێ جـان موجهننـﻪد
چێبوونـه د علمـێ حـﻪق موخهللـﻪد
هـن موئتـﻪلفن هنـﻪك موخـالف
هـن موختـﻪلفن هنـﻪك موئـالف
وان موئتـﻪلفان ب یهكڤـه ئولفـﻪت
ئاخر وه كـرن نـﻪما چـو كولفـﻪت
یـﻪعنی كـو ئـﻪوان كـورێ د خوونخـوار
گاڤـا وهـه دیـتن ئـﻪو برینـدار
ئـﻪو هـﻪردو ب سـﻪد دلان حهبانـدن
روونشـتن و هـﻪردو وهرگهڕانـدن
گاڤـﻪك سـﻪییرین ل بـﻪژن و بـالان
پێلـﻪك حـﻪییرین ل زولـف و خـالان
گـۆتن: عهجـﻪب ئـﻪڤ كچـێ د كێنـه؟
یـان هـﻪردو مهلائیكێـد خودێنـه؟!

ئـەڤ مێـوە ل کـی جهـی گهاندنـە
ئـەڤ گـول د چ گولشـەنێ نومانـە؟

سـەروێ د چ جوویبارەکێنـە
طـەیـرێ د چ مورغزارەکێنـە؟

مـاوەرد ژ هێسـترێ د گولگـوون
رهـتن ل روخـێ د وانـێ پڕ خـوون

عشـقێ کربـوون وسـا نـەهشـیار
قـەطعـا نـەدبوون ژ خـوە خەبـەردار

ئـاخر کـو کـرن ب خامـەیا عشـق
حوسنا خـەطـێ وان ل لـەوحێ دل مەشق

وان ڤـێ کـو بـزانن ئـەو چ ئەصـلن
لـەورا کـو نـزانن ئـەو چ نەسـلن

ئەنگوشـتەرییێ د وان جوانـان
کێشـان ژ ئەصـابعێد خودانـان

خاتـەم ژ ئەناملێـد خـوە کێشـان
دانینـە جهـان ژ بـوویی نیشـان

یـاقووت ب موهرییـان گوهـۆڕین
ئـەلماس ب شووشـەییێد بلـۆرین

سەرسال و خوەشی ژ دەست ب دەر دان
عەیشـێ خـوە بـەدەلکرن ب دەردان

ناگاهـ ئەجانبـەن خویـا بـوون
ناکـام کـرن وەداع و ڕابـوون

مــان هــەردو بــرا وەكــی دو صــەیدان
پابەســـتێ سەلاســـلان و قەیـــدان

رابــوون كــو شــەڤەك سیاهــ و طــاری
شــەمس و قەمــەران كــری تــەمواری

رەهــ شــوبهەتی مــورغێ نــیم بســمل
بــێ قــووەت و بــێ تــوان و بــێ دل

سەرســام و دەوار و صــەرع و مــەجروور
ســەودا و فوئــاد و خــەبل و مــەخموور

ســــەد جــــار دكەتنـــە ئاســــتانان
حــەتتا كــو گهاندنـــە ئاشـــیانان

هــەر چەنــدە كــو گەهشــتنە مــەقامان
ئــەمما كــو ل وان دو تــەلخێ كامــان

رۆژ و شــەڤ و وەقتــێ صــوبح و ئێڤــار
یەكســـان د نمـــا ل وان ب یـــەكجار

## هشیارییا مەمێ و تاجدین نە ژ بێ هۆشی
## و مەخمووریيا شەرابا عشقێ ئاگاهی و خەبەردارییا
## وانە ژ سەبەب و واسطەئێ هیڤیێ

ئەو دووختە چەشمێ هەردو شاهین
ئەو سووختە پەرێ مەمۆ و تاجدین
خوەش چوونە شکارێ کەبک و قازان
ناگاهـ ب سەرڤە شوبهێ بازان
نوورەک فتلی ل وان ژ ناگەهـ
ئێدی قە نەما ئەوان چو ئاگەهـ
هندی کو د هەفتییا حەمەل بوون
ئەو زێدە د وەحشی و خەبەل بوون
ئەو هەفتە ل وان کو بوویە سالف
خوودکەردەئێ عشقێ بوون موئالف
ڕابوونەڤە ڕۆژەکێ ب یەک ڤە
فکرینە ب ڕەنگ و ڕوویێ یەک ڤە
عشقێ کربوون وەسا مویەددەل
وان یێک و دو ناس نەکر ژ ئەووەل
ئەووەل دکرن ژ هەڤ تەغەرروب
پاشی کو کرن ب هەڤ تەقەرروب

دیـــتن خـــوه ب پاچەبەنـــد و زەنگـــل
پـــەرواز و فـــڕین مـــەحال و موشـــکل
ئوســـکووفەکە ظولمـــەتێ ب ســـەر دا
جلفوویەکـــە ئولفـــەتێ ب بـــەر دا
بـێ طوعمـە و بـێ شـەراب و بـێ چاڤ
بـێ مەقصـەد و بـێ مـراد و بـێ گـاڤ
مەســـتانە ژ ڕەنگـــێ چەشـــمێ دلـــدار
مـــەخموور و سیاهــ و مەســت و بیمـار
مانەنـــدێ دەهـــانێ یـــارێ دلتـــەنگ
نـــالین ژ ڕەهـــا دلـــی وەکـــی چـــەنگ
گۆتن: عەجـەب ئـەم کـوو بوونـە بیمـار
یـــا بووینـــە وەکـــی شـــێرێ برینـــدار
یانـــە وەهـــە ئـــەم چـــڕا نکـــارین
مـــەجرووح و زەعیـــف و دلفکـــارین
ئـــەڤ ڕەنگەهـــە وان دکـــر تەفـــەححوص
ماهییـــەتێ حـــالێ خـــوە تەجەسســـوس
تاجـــدین فکـــری د دەســـت برایـــی
تەیســـت گوهـــەرەک وەکـــی چرایـــی
یاقووتەکـــە مثلـــێ دانـــەئێ نـــار
مەشـــعەل صـــفەتە ژ بـــۆ شـــەڤا تـــار
مانەنـــدێ شـــەمالێ ئـــەو تەییســـی
حـــەککاکی ب نـــاڤێ زیـــن نڤیســـی

دەستێ خوە درێژکرێ کو بینت

دا قەنج نەظەر بکەت ببینت

مەم ژی فکری د دەستێ تاجدین

ئەلماسەکە بێ بها و تەخمین

لێ ئسمێ ستی کری کتابەت

ئوستادەکی صاحبێ مەهارەت

صەرراف ئەگەر ببیتە بوقراط

تەخمین بکەتن ب وەزن و قیراط

بازار بکەت ژ بۆ فەلاطوون

مەجموعێ خەزائنێ د قاروون

ثومنا ثەمەنێ د وان نگینان

نابت ب ووقووفێ دووربینان

مایین د تەعەجوب و تەحەییور

دامان و گەلەک کرن تەفەککور

زانین کو صەواحبێد نگینان

هەر چی کری کر ستی و زینان

ڕۆژا وەکوو بوویی عید و تەحویل

ئەو ژی گەریان ب جامە تەبدیل

چاوا خەملینە ئەڤ کەچانی

ئەو ژی گەریان ب جل کوڕانی

ئەو بوونە کو مە د رووژێ نەورووز

مثلێ مەهـ و مهرێ عالەم ئەفرووز

ئـەو هەردونـە یـێ د دەسـت ڤەمشتن

ئـەو هەردونـە یـێ د خـەل دکوشـتن

ئەو بوونـە د شـەهری بـۆ مـە جـەللاد

ئەو بوونـە کـو خـەل ژ دەست ب فـەریاد

ئـەو بوونـە ل ڤـان جەگـەر کەواندن

ئـەو بوونـە کۆڤـان ب دل حەباندن

وان هـەردو بـران ب عـەقل و تـەخمین

بـێ شـائبە قـاتلێ خـوە زانـین

تاجـدینی ل نـک هـەبوو شـوعوورەک

عشـقێ د وی هشـتبوو قوصـوورەک

گـۆ: ڕابـە بـرا ژ نـاڤ بڤینـان

بـەس ئـاهێ بکـە ژ بـەر برینـان

ئـەم شـێرن و ئـەو د خـوە غـەزالن

پـوڕ عەیبـە کـو ئـەم ژ دەسـت بنـالن

مـەم پوختـەئێ عشـقێ بـوو تـەمامی

گـۆتی کـو بـرا مەگـەر تـو خـامی

دا ظـەن نـەبری موجەسسـەمم ئـەز

سـەر تـا ب پییـان موقەسسـەمم ئـەز

ئـەڤ جسـم ل مـن بوویـە موخـەططـەط

ئـەو خـەط هـەمی بووینـە مونەققـەط

تـەئثیر وە ڕەنگـە عشـق و وەمقـان

(بالطول) د طـوول و عـەرض و عومقان

یەک نوقطە نەهن ژ دەردی خالی
هێژا تو دبێی: چڕا دنالی؟!
دل بوویە مەحەللێ عشقێ حالا
ڤی حالی و ڤێ مەحەللێ ڤالا
نینە عەجەب ئەر ببم حولوولی
من مایە ژ صوورەتێ هەیوولی
شاهینشەهێ عشقێ بێ غەرەض هات
جەوهەر ڤەشری دەما عەرەض هات
ئەڤ حال و مەحەل و جسم و جەوهەر
عشقێ ژ خوە ڕا کرن موسەخخەر
جان و جەگەر و دل و هناڤان
دەست و سەر و پێ و پشت و چاڤان
وەللاهی یەکی نەمایە راحەت
بللاهی یەکی نەمایە طاقەت
بزداندنە وان ژ من عەلائق
(بالجملە) دبێن کو: (نحن عاشق)
ناپورسی ل حالێ من تو ظالم
هێژا تو دبێژی ئەز نەنالم؟!
ئەڤ ڕەنگەهە وی کو کر تەظەللوم
تاجدینی نەما ژ بێ تەکەللوم
ئەو مان و د گەل ئەڤان برینان
بەحثا مە ل سەر ستی و زینان

## موعاوەدەتا ستی و زینێ ژ سەرسال و گشتێ
## ئستطلاعا دایێ ل ماجەرایێ و سەرگوزەشتێ

ئـــەو ژی ڤەگـــەڕین ب وی لباســـی
حاضـــر شـــەلیان كـــو كـــەس نەناســـی
هـــەر چەنـــدە كـــرن لبـــاس تەبـــدیل
ئـــەمما نـــە دبـــوون ژ حـــالی تـــەحویل
عشـــقێ كربـــوون ووســـان موبـــەددەل
ئێـــدی نـــە دچوونـــە حـــالێ ئـــەووەل
قـــەط كـــەس نـــەدگۆ ســـتی و زینـــە
خـــەلقـــێ وە دزانـــی ئەجنەبینـــە
دایینەكـــە وان هـــەبوو زەمـــانی
تەشـــبیهی بـــەلایێ ئاســـمانی
زالا فەلـــەكێ ل بـــەر زەبـــوون بـــوو
وێ نـــاڤ ژ پیـــری حـــەیزەبوون بـــوو
ئـــەو هـــات ژ غەفلـــەتێ ب ســـەر دا
فكـــری كـــو جلـــێ د وان د بـــەر دا
ڕوونشـــتنە بـــێ مـــەذاق و مەشـــرەب
ونداكرنـــە ذەقـــەن د غەبغـــەب

یـــەعنی د تەحـــەییور و مـــەلالن
مەهــــ پــارە د حالـــەتێ وەبـــالن
چولـــوا بـــوویی چـــەوچـــەمێ دتـــازە
ڕەنگـــێ ســـەمەنێ ب جـــایی غـــازە
کـــافوور مەثـــەل عـــوذارێ قـــانی
ســـۆرگول گـــەڕیایی زەعفـــەرانی
زانـــی کـــو پـــەری د بـــێ لباســـن
مـــەجلووبێ مەحەبیـــەتێ ئوناســـن
گـــۆ: ئـــەی هەوەســـا دل و هناڤـــان
هـــەر یـــەک ژ وە ڕوهنییـــا دو چاڤـــان
حـــافظ ژ وە ڕا مەگـــەر خـــودا بـــت
جـــانێ م ژ بـــۆ وە ڕا فـــدا بـــت
هـــوون هنـــدە موقەییـــەدن د قەیـــدێ
ئیـــرۆ ب تنـــێ کـــو چوونـــە صـــەیدێ
وە زوو شـــەمراند ژ بـــۆ چ سەرســـال
هـــوون ڕاســـت بێـێن کـۆ بوویـە ئـەحوال
بێـــژن کـــو موقەددمـــە چ ڕەنگـــە
ئـــەڤ حیرەتـــە یـــا خیالـــە بەنگـــە
هـــوون بـــۆ چ حـــەزینن ئـــەی مـــەطایـــا
نیـــنن چـــو نەتیجـــە بـــێ قـــەضـــایا
هـــوون بێژنـــە مـــن کـــۆ بـــوو قـــەضـــییە؟
کـــەنگی ل مـــە خـــەف دبـــت خەبییـــە

ئـەز دێ نوهــە ڕەملــەکێ بڕێــژم
ئـسـمێ د ضــەمیــری ئــەز ببێــژم
یــان شووشــە و مەنــدلا خــوە دانــم
ماهییــــەتێ حـــالی دێ بـــزانم
وان گۆتنـــە دایـــەئێ نهـــانی:
ئـم صـوبحێ کـو چوونـە دەر ژ خـانی
هــەرچی ل مــە بــوو دوجــادۆ پەیــدا
حاضــر گــەڕیا جونــوون و شــەیدا
ئـاخر کـو ژ حـەددی چوویـە دەر جـەور
جــەورێ ل مــە عاقبــەت نــەما دەور
ئـەم ژی گـەڕییان مـەلوول و مـەغبوون
هاتینەڤـە ئـەم خـەفیف و مـەخبـوون
دایـــین ب تەئـــەننی و تـــەوەللا
چـوو پالڤـــە دایـــە وان تسـەللا
گـۆ: هـوون ب جـەمالێ شـەهریارن
هــەر یـەک ژ وە شاهــ و خونــدکارن
کـی بـت کـو نـەبت موطیـع و موحتـاج
کی بت کـو نـەدت وە بێ طـەلـەب بـاج
هــەرچی وە حەبانــدی ئــەی پــەریزاد
حوســنا وە دکــەت ژ بـۆ وە مونقــاد
خاسـما د ڤـی شـەهری بـت وە دلـدار
ئــەز دێ وی بکــەم نهــا خەریــدار

بێـــژن کییـــە؟ دا بچـــم ببیـــنم
حاضـــر بگـــرم ژ بـــۆ وە بیـــنم

وان گۆتنـــە حـــەیزەبوونێ ســـاحر
دەردێ ل مـــە ئـــەی طـــەبیبـــێ مـــاهر

بـــێ شـــوبهە دەوا ژ دەســـت تـــە تێـــتن
تـــەقریر ئەگـــەر ژ دەســـت مـــە بێـــتن

تـــــەقریر و ئـــــەداکرن مەحالـــــە
تـــــەدبیر و دەواکـــــرن بـــــەطالـــــە

هنـــدی هەنـــە کیـــژ و کـــوڕ د بوهتـــان
بەلکـــە د جـــەمیعی بـــەژن و بوهتـــان

کەس نینە ب لوطف و حوسنێ مەشهوور
ئـــیللا کـــو د دەفتـــەرا مـــە مەســـطوور

یـــەعنی هـــەمی ڕوو ب ڕوو مـــە دینـــە
هنـــدی د ڤـــی شـــەهری ئادەمینـــە

ئیرۆهـــە دو کـــەچ غـــەریق شـــیبا
ســـەر تـــا ب قـــەدەم دەبیـــق و دیبـــا

زیبەنـــدە ژ شـــەکلێ شـــاهێ خـــاوەر
تابەنـــدە ژ ڕەنگـــێ مـــاهێ ئـــەنوەر

ناگەهـــ ل مـــە بـــوون دوجـــار و ظـــاهر
گێڕیـــوون ژ دوورڤـــە هـــەردو نـــادر

ئـــەم چوونـــە ب ســـەر بنێـــن کـــو کینـــە
فکـــرین نـــە وەکـــی مـــە ئادەمینـــە

تـەحقیق مەلـەک وە یـا پـەری بـوون
لـەورا کـو ژ ئـاف و گـل بـەری بـوون
گاڤـا کـو مـە دیـتن ئـەو پـەریزاد
ئـەم ژی گـەڕیان ژ عـەقلی ئـازاد
ئـەو هـەردو وەکـی د جـامێ جەمشـید
ئـەم هـەردو مثـالێ ماهـ و خورشـید
گاڤـا وەکـوو پێکڤـە بـوون موقابـل
مصـباح و زوجـاج بـوون موعـادل
قـارووره ژ نـەجمێ مونعـەکس بـوو
نـوورەک مـە ب قـەلبی موقتـەبس بـوو
قەنـدیل و فەتیلـە گـەر ژ وان بـوو
ئـاگر ژ روخـێ مـە هـەر دووان بـوو
زەیتـێ مـە و ئـاگرێ مـە دیسـا
بـەربوو مـە وە دل مـە پـێ ئـەییسـا
سـوهتن خـوە ب خـوە بـزان چ حالـە
هشـیارییە خەونـە یـا خەیالـە

## تەکرار ئستخبارا دایێ ژ کونهێ ماجەرایێ
## تەصریح و تەقریرێ ئەوانە ژ کەیفییەتا تەئثیرا هەوایێ

دایـــین حـــەییری ژ ماجـــەرایێ
گـــۆ: ئـــەی روح و قـــالبێ د دایـــێ

هـــوون چوونـــە تەفـــەرروجا روالان
فـــارغ ژ تەعەششـــوقا غـــەزالان

شـــەکلێ کـــو وە دیتـــی بـــێ مەثالـــە
مـــەیلا وە ب قســـمێ ژن مەحالـــە

مـــەیلا بەشـــەری بەشـــەر دڤێـــتن
ئـــەمما وە کچـــان پوســـەر دڤێـــتن

کـــەچ قـــەط ل کـــەچـان دبـــن خەریـــدار؟
بـــێ نەقـــدێ کـــوڕان مەحالـــە بـــازار

کـــوڕ ئایینـــەئێ جـــەمالێ ذاتـــن
کـــەچ مـــەظهـــەرا پەرتـــەوا صـــفاتن

بـــێ ذات و صـــفەت عـــەرەض مثالـــە
جەوهـــەر نـــەبتن عـــەرەض بـــەطالـــە

قـــائم دبـــتن عـــەرەض ب جەوهـــەر؟
بـــێ شـــەمس قەمـــەر دبـــت مونـــەووەر؟

مـــەیلا ژ روحـــێ کـــوڕان بـــەری بـــت
ســـەد جـار کـــو حـووری و پـــەری بـــت

ئەو مـەیل كۆ دێ بكـەت وە مـەفتوون؟
ئەو لـەیل كۆ دێ بكـەت وە مـەجنوون؟
مـەجنوون كـو نـەبت عـەدیلێ لـەیلێ
لـەیلێ كـۆ دكـەت ب لـەیلێ مـەیلێ؟
گـول قـەط ل گـولان دبیتـە عاشـق؟
عـەذرا خـوە ب خـوە دبیتـە وامـق؟
خوسـرەو نـەبووا سـوارێ شـەبدیز
شـیرین ل شـەكەر دبوویـە پـەرویز
فـەرهادی چـەوا سورشـكێ پـوڕ خـوون
نەینانـەددی سـوارێ گولگـوون
ژ ئـەو چەنـدەها عالـەما رجـالان
بـەگزادە و سـادە و روالان
دل قـەط وە نـەبت ب كـەس ڤـە مائـل
قیـزێ د ئـەدانی و ئـەراذل
بـێ نـام و نشـان و غـەیری مـەعرووف
قەلبێ وە ب وان كۆ بوویـە مەشغووف؟
ئـەڤ ئـەمرە ب مـن قـەوی مەحالـە
ئـەڤ خەونـە وە دیتـی یـا خیالـە
زینـێ كـو بهسـتن ئـەو مـەعانی
ئـەڤ نەغمـە ژ پـەردەئی دەرانـی
ئـەڤ ڕەنگەهـە گۆتـە دایـەیا پیـر
غالـب تـە نەمایـە عـەقل و تـەدبیر

تــه دكــۆ كــو ب دەعــوەت و عــەزائم
حــالێ كــو خــەفی بــتن دزانــم
شــەكلێ كــو مــە دی نــە بــێ مەثالــە
تــەحقیق نــە خەونــە نــە خەیالــە
وان گــەر مەلــەک و ئەگــەر بەشــەر بــوون
گــەر قســمێ نســاء و گــەر پوســەر بــوون
ئەنگوشــــــتەرییێ د وان ئەڤانــــــە
ئینانــــە مــــە ئــەو ژ بــۆ نشــانە
رەملــێ تــو ب ڕاســت ئەگــەر دزانــی
خاتــــەم ئەڤــــە دێ بــــزان خــودانی
وێ شــــەهلەیێ حیلــــەكارە جــــازوو
گــۆ: بێنــە ژ بــۆ مــە خاتــەمان زوو.
دا ئیشــــەڤە رەملــــەكێ بڕێــــژم
حــەتتا ســوبە صــاحبان ببێــژم
حاضــــر ســـتییێ نگـــین دەرانـــی
دا دەســــتێ عــــەجووزەیا زەمــــانی
زینـــێ وهــــە گۆتــــە حــەیزەبوونێ:
مــن دل بوویــە وەرطــەیــەک ژ خــوونێ
گاڤــا وەكــوو وەرطــە تێتــە جووشــێ
وەقتــێ كــو دكــەت بكــەت خورووشــێ
تســكین دكــەت ئــەڤ نگــین دلــێ ژار
دەم دەم كــو ددم د چشــمێ خوونبــار

زنهـــار ئەگـــەر دبـــەی نگینـــێ

زوو بینەڤـــە بـــۆ م دل حـــەزینێ

لـەورا ب وییـە مـە صـەبر و سـامان

ئـــەو بـــو منـــە خاتـــەما ســـولەیمان

## تەفەححوص و تەفائولا دایێ ژ رەممالی
## ژ کشفا حەقیقەتا وێ ئەحوالی

وێ دەللـــەئێ بـــێ فەصـــال و موحتـــال
صـــوبحێ خـــوە گهانـــدە پێشـــی رەممـــال
زێـــرەک دبـــرن د دەســـت خـــوە بـــۆ پیـــر
ئـــەڤ رەنگەهـــە کـــر ضـــەمیر تـــەقریر
گۆ: مـــن دو کـــوڕەک هەیین د مەعصـــووم
بـــێ بـــاب و یـــەتیم و ژار و مـــەحرووم
رۆژا وەکـــوو بوویـــە عیـــد و سەرســـال
ئـەو ژی ب طـەریقێ طـەبعێ ئـەطفال
ڕابوونەڤـــە هـــەردو چوونـــە گەشـــتێ
غـــۆلان غەلـــەطانـــدبوون ل دەشـــتێ
ئیرۆهـــە دەمـــا کـــو بوونـــە پەیـــدا
دیـــنن تەلـــســـن جونـــوون و شـــەیدا
هاتینەڤـــە بـــێ لبـــاس و طـــازی
گەهـــ گەهـــ دکـــرن فغـــان و گـــازی
بـــێهش دکـــەڤن گەلـــەک دمیـــنن
گاڤـــا وەکـــوو ڕادبـــن ددیـــنن

ئـــەڤ خاتەمەنـــە ئـــەوان د دەســـــتن
گۆیـــا تـــو دبێـــی ب ڤـــان د مەســـــتن

ئـــەی واقفـــێ رەمـــز و کاشـــفێ راز
بێچارەمـــە ئـــەز تـــو چـــارە پـــەرداز

ئحســـان بکـــە قـــەنج ژێ خەبـــەر دە
کـــانێ صـــــەبییێد مـــــن چ دەردە

مەجنوونییـــــە صـــەرعە یـــــا هەوایـــە
چـــاوا مـــــەرەضـــە چ بـــۆ دەوایـــە

ئـــەی مورشـــد وپێشـــەوایێ موقبـــل
حـــەللالێ عوقـــوود و حـــەللێ موشـــکل

ســـررەک هەیـــە وێ د ڤـــان نگینـــان
پەیدایـــە ل نـــک وە دووربینـــــان

ئەصـــــحابێ نگـــین ببێـــژە کینـــە
جننینـــــە پەرینـــــە ئادەمینـــــە؟

## دەلالەت و تەقريرا رەمماليیە ژ بۆ پیرێ
## موافقێ (ما في الضمير) و موخالفێ تەقریرێ

ئــــەو وارثــــێ علمــــێ دانیـــــالی
گاڤـــا فکـــری د شـــەکلێ فـــالی
(فـــي الحـــال) د رەحمـــێ ئومـمـــەهاتان
بـــێ وەضـــعێ تەوولـــدا نـــەباتـــان
لـــەحیان و نـــەقی ب پێکڤـــە دیـــتن
تاجـــدین و ســـتی ب پێکڤـــە دیـــتن
شـــەکلێ فـــەرەحێ د گـــەل غـــەمێ دی
بـــێ پـــەردە وی زیـــن د گـــەل مـــەمێ دی
ئـــەڤ ڕەنگەهـــە گۆتـــە قاصـــدا پیـــر:
مەقصـــوود ب مـــەکر و کـــذب و تـــەزویر
مـــا قـــەط دبـــتن ژ بـــۆ تـــە حاصـــل؟
بـــێ ڕاســـترەوی مەحالـــە مـــەنزل
تـــە دگـــۆ کـــو کوڕێـــد مـــن ددیـــنن
نابێژییـــە مـــن ســـتی و زیـــنن
ڕۆژا وەکـــوو چوونـــە گەشـــت و ســـەیران
وان دینـــە ل ڕێ دو دیـــدە حـــەیران

یـەعنی کـو دو کـوڕ د سـەرو قامـەت
ڕابوویـــە ل وان کـــوڕان قیامـــەت
(فـــي الحـــال) ئـــەڤان دو ئافتابـــان
دل چوویـــە ڤـــە بـــال دو ماهتابـــان
ئـەو بوونـە ژ عشـقێ ڤـان د بـێ هـووش
ئـەڤ بوونـە ژ حوسـنێ وان د مـەدهووش
ئـــەو شـــیفتەئێ بـــەلایێ عشـــقن
ئـــەو تەشـــنەئێ کەربـــەلایێ عشـــقن
ئـــەڤ خاتەمەئێـــد وان کـــوڕانن
ڤـــان ژی دو نگـــین د دەســـتێ وانـــن
چـــاوا خەملینـــە ئـــەڤ کـــوڕانی
ئـــەو ژی گەڕیانـــە جـــل کـــەچانی
پیـــرێ وهـــە گۆتـــە شـــەیخێ ڕەممـــال
مـــن شـــوبهە نـــەما د کەشـــفێ ئـــەحوال
لـــێکن تـــو ببێـــژە ئـــەو چ ئەصـــلن
قـــەنج کەشـــفێ بکـــە کـــو ئـــەو چ نســـلن
بەگزادەنـــە ئـــەو عـــەلی مـــەقامن
جنـــدی نســـەبن وە یـــا عـــەوامن؟
شـــەیخ گـــۆ کـــو د دینـــێ عشـــقبازی
بەیعـــەک هەیـــە ئـــەو دبـــێن تەراضـــی
بـــێ شـــەرطێ کەفائـــەتێ ڕەوایـــە
شـــەرطێ موتەعاقـــدان ڕضـــایە

خاسما کو کوڕێ د وان بژاری
دوڕدانەیە یەک و یەک مراری
بەگزادەیە یەک ژ نسلێ میران
یەک ژی ب نەسەب کوڕێ دەبیران
وێ ساحرەئێ ژ بۆ نشانە
دیسان خەبەرەک کرە بەهانە
گۆ: عاشق و موبتەلا و دینان
مەفتوونێ ژ بۆ ستی و زینان
ئەو نابنە قابلێ حسابان
ناگەنجنە دەفتەر و کتابان
شەیخم تو دزانی ئەڤ جەزیرە
تێکدا کوبەرا و کوردە میرە
ئحسان بکە پەردەئی هلینە
ئەو هەردو مەلەک ببێژە کینە
عەهدا مە وە بت تەنێ ببینم
چل زێری بچم ژ بۆ وە بینم
شەیخ گۆ: تو هەرە ببین وشاقان
تەفتیش بکە جهـ و وثاقان
هەرچی کو دبێژن ئەو عەلیلە
ئەو عللە ژ بۆ تە ڕا دەلیلە
بنمێ خوە ب صوورەتێ طەبیبان
بێ پەردە دبینی وان حەبیبان

گاڤا کو تە دیتن ئەو مەلەک وار
کەشفە ژ قوماشی ژی خەریدار
خاسما کو د دەستێ وان نگینن
مەنقووش ل وان ستی و زینن
ڕابووڤە عەجووزە شوبهی لوقمان
سەر تا ب قەدەم دەوا و دەرمان
قاروورە و حوققە نشتەر و کیس
هلگرتن ئەوا خەبیشە تەلبیس
دانی بەغلا خوە چەند کتێبەک
دنما ب حەکیمەکێ عەجێبەک
حاضر خوە گهاندە پیشەکاران
(في الحال) بوویە نەدیم و یاران
وان گۆ: تو ژ کووڤە تێ چ پیری؟
غالب تو ژ علمەکی خەبیری!
گۆ: گەر چ کو ظاهری حەکیمم
زێدە ب دو عللەتان عەلیمم
زائل دکم ئەز قەوی دو ژانان
دەردێ بەدەنان و دەردێ جانان
وان گۆ: تو ژ بۆ مە ڕا خەبەر دە
دەردێ کو ل جانی بت چ دەردە؟
وێ گۆتی مەگەر کو هوون نەبینن
وی دەردی عەلامەتن نەهینن

ئـەو دەردەکـی زێـدە بـێ مەجالـە
صـحەت ژ وی دەردی ڕا مەحالـە
دوور بـت ژ وە ئـەو گـەلی روالان
ئـەو بەرقـە د صـوورەتێ شـەپالان
گاڤـا ڤـەددەت وەکـی برووسـکە
بـێ شـوعلە و پێـت و بـێ چرووسـکە
بـێ جەرحـە و قەرحـە و برینـە
نـاڤێ ل وی دەردی هـەر ئەڤینـە
ئـەمما وە دسـۆژتن هناڤـان
خوونـا دلـی تـێ ژ هـەر دو چاڤـان
وان گۆتنـە وێ کـو خـەیری مەقـدەم
حـالا نەخوەشـن ژ مـە دو هەمـدەم
ئحسـان بکـە هـەردووان دەوا کـە
دەرمـان کـە ب نەوعـەکی تـو ڕاکـە
هـەر چـی تـو دبێـژی ئـەم وەسـا کـین
هـەر چـی تـو دخـوازی ئـەم ئـەدا کـین
پیـرێ خـوە گهانـدە نـک مەریضـان
وەقتـێ فکـری د وان عـەزیزان
وێ گۆتـە ب هەمـدەم و دەلـیلان:
تـەنها مـە بهـێلن و عـەلیلان
دا ئـەز بکـەرم وی دەردی تەشـخیص
پاشـی بکـم ئـەز دەوایـی تـەلخیص

هــەڤڕێ هــەمی چوونــە دەر ژ بــا وان
پیــر مــا و تــەنێ د گــەل دو لاوان

## هەمصوحبەتییا وشاڤان ب هەملحووڤییا مشتاڤان
## و واڤتییا وتییە ل سەر وەڤتێ عوشاڤان

بیمـــــار ب دەردێ عشـــــقێ بــــەدحال
ناگەهــ فکـــرین کــو چوونــه هاڤــال
ڕوونشـــتی ل پێشـــی وان ڤــه زالــەک
قامـــەت جڤیـــایی ڕەنـــگ هلالـــەک
ئاهســـــته کەلامــــەکی دبێــــژت
دگــــریتن و هێســـتران دڕێـــژت
گــۆتن چ کەســـی تـــو ئـــەی دلارام
بــۆ چ دگــری وهـــا ب ناکـــام؟
وێ گــۆ: ب ســـەرێ ســـتی و زینـــێ
مەحضــــا ژ وه ڕا دکـــــەم گرینـــێ
مەخصـــووص ژ نــک ســتی و زینـــان
هـــاتم ل وه خــوەش بکـــەم برینـــان
ئەنگوشـــــــتەرییێد وه ئەڤانــــــــه
ئینانــــــه م وی ژ بـــــۆ نشـــانه
هـــوون هلگـــرن و بـــدەن نگینـــان
بـــەدنام مەکـــەن ســـتی و زینـــان

ئەز قاصد و هوون ژ بۆ م مەقصوود
هوون من مەکەن ئەی موراد مەردوود
ئەڤ موژدە دەما ئەوان کرن گووش
یەکجار ژ شاهییان نەما هووش
هشیار کو بوون دەمەک نەوەستان
(في الحال) بەزینە پێ و دەستان
تەکرار ل دەست و پێ و داوان
سەد بووسە ددان ئەوان دو لاوان
داین حەیری ژ ئشتیاقێ
بەردا گرییێ ژ ئفتراقێ
گۆ: غەم مەخۆن ئەی موراد و مەقصوود
مزگینی ژ وە ڕا ب حەققێ مەعبوود
تەوفیقێ رەفیق بتن ژ باری
ئەز دێ وە بکەم ب سحرکاری
هوون جوملە ل عەردەکی جەما بن
هەر چار ب مەقصەدا خوە شا بن
نام و نسەبا خوە هوون عەیان کەن
سرڕا دلی بۆ م ڕا بەیان کەن
دا ئەز ڤەگەڕم ب ڤان نگینان
تەسخیر بکەم ستی و زینان
تەعجیل بکەم ژ بۆ ثەوابێ
زوو بێمەڤە ئەز د گەل جەوابێ

تاجــدینی نگــین ژ دەســت دەرانــی

دا دەســـتێ عـــەجووزەیا زەمـــانی

مـەم تـێ فکـری کـو بـێ نگینـێ

کـەنگی دکـەتن مـەدار و ژینـێ!؟

گـۆ: دایـە تـو مـن بگێـڕە مەعـذوور

کـی جانی ددت ژ دەست خوە دەستوور

ئـەڤ خاتەمـە ئسـمە گـەر طلسـمە

مـن جـان ئـەوە قـالبێ م جسـمە

ئـەی دایـە تـو قاصـدێ حـەبیبی

بـێ شـوبهە ل دەردێ مـن طـەبیبی

صـەدقە سـەرێ (ذي الجمـال)ێ زینـێ

مەسـتینە ژ دەسـتێ مـن نگینـێ

گاڤـا تـو دچـی ڤـە ئـەی وەفـادار

ئـەڤ ڕەنگـە ژ مـن ببێـژە دلـدار

ئـەو شـاهە ئەگـەر چ ئـەز گەدامـە

ئـەلطافێ شەهنشـەهانە عامـە

ئـەز بەنـدە نـە لائقـێ وصـالم

خورسـەندە ب صـوورەتێ خـەیالم

راضـیمە ژ ئـەو قـەدەر جـەمالێ

مـن بینتـە خـەلوەتا خـەیالێ

هـەر گاهـێ ژ ئـاهێ دل بترسـت

گەهـ گـاهێ ل حـالێ مـن بپرسـت

## ئەگەرپانا دایێ ڤ باڵ دلداران
## ئاگەهکرنا وانە ژ ئسم و رەسمێ برینداران

ئـەو هـەردو نهـالێ عەرعـەرا شـەنگ
ڕوونشـتی مثـالێ غونچـە دل تـەنگ
جڤیـــایی ب فکـــر و سەرنشـــیڤی
هـــەر لەحظـــە ژ دایـــەێ ب هیڤـــی
مـــەخمووری غـــەبووقێ بـــێ نهایـــەت
موشـتاقێ صـەبووحێ بـوون ب غایـەت
دیـــتن کـــو ژ ناگـــەهی طـــەبیبـــە
وێ هـــات ب صـــوورەتەک عەجیبـــە
زیـــن و ســـتییا ژ عشـــقێ مـــەدهووش
وان دایـــە کـــرن رەوان دەر ئـــاغووش
گـــۆتن: ب خـــودێ کـــەی ئـــەی دلارام
ئایـــا تـــە کـــۆ دینـــە ئـــەو مەلـــەک رام
رەمـــلا تـــە چ گـــۆ؟ پـــەری تـــە زانـــین؟
یـــان هـــەردو د شووشـــەیێ تـــە ئـــانین؟
تیـــرا ل مـــە کـــون کـــری ســـوەیدا
ئایـــا تـــە بـــەیان نـــەکر کـــو کـــەی دا؟

وێ گۆ: ب سەرێ وە ئێ موبارەک

سەد جار قەسەم دکەم نە جارەک

ئەز هاتمە ڤی دەمی ژ با وان

ئەمما گونەها مە تێ ب لاوان

هەردەم کو ستی و زین دبێژن

سەد ڕەنگ سرشکێ خوون دڕێژن

قوربانێ وە بم ب ڤێ کەمالێ

ئەو هەردو بەشەر ب وێ جەمالێ

چاوا وە بژارن ئەو دو مومتاز

زیبەندەئێ وصلن ئەو سەرەفراز

وەللاهی قەسەم دکەم ب باری

ئەو هەردو دوڕێ د وە بژاری

نابن د چو بەرر و بەحر و کانان

نینن وە مەلەک د ئاسمانان

ئەو هەردو ژ بۆ وە ڕا سەزانە

میرزانە ئەگەر وە گەر گەدانە

ئەو دەللە ب دل وە بوویە دەلال

دلدادە ژ پێشڤە مان دەمەک لال

زین و ستییان نەما د دل هووش

گاڤا کو ئەوان کر ئەڤ خەبەر گووش

(القصە) ژ کونهێ ماجەرێ

هشیاری کو دایەئێ ددایێ

ئـــاگر تـــە دگـــۆ گهانـــدە نـــەفتێ
پێـــت ژێ دچـــوو ئاســـمانێ حـــەفتێ
عشـــق ئـــاگرە تـــەن چیـــایێ طـــوورە
دل ئـــەو شـــەجەرا ب نـــار و نـــوورە
مشـــکاتە قەفـــەس قەبـــەس چرایـــە
جـــان زەیتـــە فـــەتیلێ وێ خەفایـــە
دل شووشـــەیە ئـــەو چـــرا د ناڤـــە
ســـورر جوزئـــە د کـــوللێ دا بەلاڤـــە
(بالکـــل) ژ ســـەری حـــەتا ب ئەقـــدام
ســـــوهتن ب وی ئـــــاگری دلارام
گـــۆتن: ژ مـــە ڕا تـــو دل نـــەوازی
ئـــەی دایـــە ژ بـــۆ مـــە چارەســـازی
دهقـــان تـــویی ئـــەم وەکـــی نهـــالین
ئـــەزمان تـــویی ئـــەم ب خـــوە دلالـــین
گـــەر لەحظـــەیەکێ نـــەکی تـــو گوفتـــار
گـــەر ســـاعەتەکێ نـــەبی تـــو غـــەمخوار
ئـــەم دێ وەکـــوو خـــار و خـــەس هـــەبا بـــن
ئـــەم دێ وەکـــوو بـــەرگێ بەرهـــەوا بـــن
ئـــەی واقفـــێ واقعـــاتێ دێـــرین
ئـــەم غـــەیری تـــە مـــەحرەمان نـــەدێرین
تاجـــدین و د گـــەل مـــەمێ تـــە گـــۆتی
پەروانەنـــە پـــەڕ ل وان مـــە ســـۆتی

ئـــەو ژی نهـــە پـــورِ د ئنتظـــارن
بـــەلکی ژ مـــە زێـــدەتر نـــەچارن
رِابـــە هـــەرِە زوو ببێـــژە تاجـــدین
گـەر دێ تـە سـتی بڤـێ مـەمێ زیـن
مـــزگین ژ وە رِا مـــە هـــوون قـــەبوولن
ئـــەم ژی ژ وە زێـــدەتر مـــەلوولن
عشـــقا وە جلـــەو ژ مـــە رەڤایـــە
مـــانع ل مـــە پـــەردەیا حەیایـــە
ئـــەو پـــەردە ژ بـــۆ وە رِا عەدیمـــە
بـــێ پـــەردە ژ بـــۆ وە رِا قەدیمـــە
خـــوازگینی وەســـائط و وەســـیله
هـەر چـی کـو ژ بـا وە بـێن جەمیلـە
ئـــەڤ رِەنگـــە ببێـــژە وان حـــەبیبان
مـــەجموعێ مـــەوالی و خـــەطیبـــان
هنـــدەک ژ وە رِا بـــبن رجـــاچی
هنـــدەک ژ مـــە رِا بـــبن دوعـــاچی
بـــەلکی کریـــت خـــودێ موقـــەددەر
وەصـــلا مـــە و وە ببـــت مویەســـەر

## شفابەخشییا طەبیبێ ل دەردێ عەلیلان
## ب شەفقەت و مەرحەمەتا میر ل حالێ ذەلیلان

خـوەش وەقتـە ژ بـۆ عـەلیلێ موشـتاق
خاسـما کـو ژ بـۆ قـەبیلێ عوششـاق
دەرمانـــەکی صـــححەت و شـــفایێ
مـــزگین و بەشـــارەتا وەفـــایێ
ناگەهــــــ بگەهیتــــــە وان ژ دەردان
ئـــازادە بکــــەت ئــــەوان ژ دەردان
ئــەو دایــە ژ ڕەنــگ ئەرســتەطــالیس
ســەر تــا ب قــەدەم لباســێ تــەلبیس
دیســان کــەتی صــوورەتێ طــەبیبــان
حاضــر خــوە گهانــدە نــک حــەبیبان
ئــەو مــوژدە وەکــی مــە گــۆتی گــۆتن
ئــەو ســۆتێ وەکــی نــە ســۆتی ســۆتن
ئــەمما ب وی ئــاگری وە گــەش بــوون
تە دگۆ قە نەخوەش نەبوون دخوەش بوون
گۆیــا کــو ئــەوان ژ دەســت فــەلاطوون
خــوارن ب یــەقین دەوا و مــەعجوون

ڕابوونەڤـــە چوونـــە نـــک هـــەڤالان
چەنـــــدەک ژ مـــــەحارم و روالان
ئاگـــــاهکرن ژ ماجـــــەرایی
ڕابـــوون ب تەعەصـــوب و تـــەبایی
گاڤـــا کـــو ئـــەوان بهیســـت مـــزگین
هایـدان ب تـەبایی خـەلق و خـوازگین
هنـــدەک عولـــەما و هـــن د عـــادل
هنـــدەک ئومـــەرا و هـــن د جاهـــل
ڕابوونەڤـە جوملـە چوونـە نـک میـر
ئـەڤ ڕەنگـە کـرن قـەضـییە تـەقریر
کـای والییێ مولـک و مـال و مللـەت
وەی حـامییێ داد و دیـن و دەولـەت
تـــو ســـایەئێ لـــوطفێ کردگـــاری
ئیـــرۆ ل مـــە شاهـــ و خونـــدکاری
شـــاهی نـــەظـــەرا تـــە کیمیایـــە
مـــاهی ئەثـــەرا تـــە پـــوڕ ضـــیایە
هـــەرچی تـــە ڤەخوەنـــد ئـــەو عـــەزیزە
هـــەرچی تـــە نەخوەنـــد بـــێ تـــەمیزە
هـــەرچی تـــە کـره چـراغ و گـەش کـر
گـەر حـالێ خەرابـە ژی تـە خـوەش کـر
تاجـــدین ئەگـــەر چ میرزایـــە
نسـبەت ب تـــە بەندەیـــە گەدایـــە

هـــاتین کـــو بکـــەین ژ دل دوعـــایێ
(فـــي الجملـــە) دکـــەین ژ تـــە رەجـــایێ
تاجـــدین ســـتییێ ژ تـــە دخـــوازت
ئـــەو قـــول ب چراغییـــێ دنـــازت
ئـــەو بەندەیـــە وی بگێـــڕە ئـــازاد
زیبەندەیـــــە وی بـــــدێرە دامـــــاد
میـــر گـــۆ کـــو هـــەچی وە دیتـــی لائـــق
ئەلبەتتـــە ژ بـــۆ مـــە ڕایـــە فـــائق
هـــەرچی کـــو وەکیلـــە بێـــت و ڕوونـــت
مـــەولا کییـــە خوطبـــەئـــێ بخوونـــت؟
عەقـــدا ســـتییێ مـــە کـــر ل تاجـــدین
ئیجابـــە ئەڤـــە قەبوولـــە ئـــامین
(فـــي الحـــال)ی چـــەکۆ بەزییـــە پـــێ میـــر
تـــەقبیل کـــر و قـــەبوول و تـــەقریر
مـــەجمووعێ مـــەلا و شـــەیخ و میـــران
ئاغـــــا و ئـــــەکابر و فـــــەقیران
ڤێکـــرا ب دەڤـــێ خـــوە وان ثـــەنا کـــر
تێکـــدا ب دلـــێ خـــوە وان دوعـــا کـــر
میـــر گـــۆ: بقـــوتن دەف و رەبابـــان
بیـــنن هـــەمی شـــەربەت و شـــەرابان
دا بەزمەکـــــە شـــــادمانە دانـــــین
ئیرۆهـــە کـــو صـــوبحە ئـــەم نـــزانین

دێ شوبهەتی ڤـی دەمـی د خوەش بـین
یـا دێ بمـرین وە یـا نـەخوەش بـین
حوبلانـە لـەیالی ئـەی مـەوالـی
کـانێ چ دزێـن (علـی التـوالي)
ئـەڤ شـیوەن و شـاهی تەوئـەمانن
ئـەڤ چـەرخ و فەلـەک د بـێ ئـەمانن
گەهـ نـوور نومانـە گاهـ موظلـەم
گەهـ سـۆر نومانـە گاهـ مەئتـەم
گاڤـا کـو دبینـی وەقتـێ عشـرەت
دا فـەوت نـەکی زەمـانێ فورصـەت
لـەورا کـو زەمـان مثـالێ شـیرە
نـابێژتن: ئـەڤ مەلایـە میـرە؟!
ئیرۆهـە ژ بـۆ رضـایێ تاجـدین
مـن ژی ژ خـوە عـەد بکـەن ب خـوازگین
ئـەڤ چەنـد زەمانـە ئـەو غولامـە
دائـم د غـولامییێ تەمامـە
ئـەو هنـدە د خدمـەتا مـە دا بـوو
عـومرێ وی د بـەر مـە دا فـەنابوو
شـەرطە د شـەریعەتێ وەفـایێ
ئـەم ژی ژ وی را بخـوێن جـەفایێ
ئیرۆهـە ب خدمـەتا وی رابـین
(بالـذات) د خدمـەتا وی دا بـین

میرێ وەکێ بتن کو جانی
شاباش نەدەتێ ب شادمانی

گەر من هەبتن هەزار و یەک سەر
وان جوملە د رۆژەکێ ب دەفتەر

گەر ئەز نەکەرم فدا ب جارەک
میرینی ل من نەبت موبارەک

تاجدین کو د خدمەتا ئەمیر بوو
چەشنا وی د دەست و چەشنەگیر بوو

(القصە) ب شەوکەتا خوە ئەو میر
رابوو ب خوە بوویە چاشنەگیر

کێشا وی ب مەجلسا خوە خوانەک
گۆیا کرە فەرشێ ئاسمانەک

قورصێ مەهـ و مهرێ ئاسمانی
ئینان تە دگۆ ب جایێ نانی

ئەڤ لەنگەرییێ د زیڤ و زێرین
شوبهەت فەلەکێ د ژۆر و ژێرین

هەر صەحنێ مەزن مثالێ بورجەک
سەرپۆش ل سەر ژ رەنگێ دورجەک

هەر تەپسی و کاسەئێ د فەغفوور
یەک ئەختەرێ پڕ ضیایێ پڕ نوور

جەدی و حەمەلێ د ئاسمانی
بوریان و کەبابێ میهمانی

هـەر كاسـە وتـەپسـييەک يـەک ئـەنبار
سەرشـار شـەبيهی نەفسسـیٖ ئـەممار
ئـەنواعیٖ طـەعـامیٖ چـورب و شـیٚرین
ئـەلوانیٖ غـذاء و نـوقلیٖ ڕەنگـين
ڤـان مشـرەبە وو ئـەياغیٖ چينـی
دەوران دکـــرن ب نـــازەنينی
سـەييارە صـفەت بگەشـت و سـەيران
هـەرچی کـو ددی دمـائی حـەيران
نـارەنج و تـورنج و نـار و ليمـوو
نووبـاوەء و شاخسـار و مينـوو
فانيـذ و نـەبات و قەنـد و شـەککەر
مـاوەرد و زوبـاد و مسـک و عەنبـەر
هنـدان دکـرن مەعيـدە غـازە
هنـدان دکـرن دمـاغ تـازە
مەجمـەر گـەڕيان ب عـوود و عەنبـەر
بـوون جوملـە مەشامیٖ جان موعـەنبـەر
راموشکەر و خوەش نەوا و خوەش دەنگ
شايەستە و خوەش قوماشیٖ خوەش ڕەنگ
هەڤـدەنگ هنـەک ب صـەوت و سـازان
هـەمڕەنگ هنـەک ب فـەخر و نـازان
مـوغنی و کەمانجـە عـوود و طـەنبـوور
چـەنگ و دەف و زوورنـا و صـەنتوور

عوششـــاق و نـــەوا عراقـــی و ئـــەوج
ڤێکـــڕا دکـــرن ب ڕاســـتیێ زەوج
ئـــاوازە و شـــوعبە و مـــەقامات
بـــێ پـــەردە ب مـــوعجز و کـــەرامات
ظـــاهر کـــو دبـــوون ژ نـــاییێ گـــەردان
غـــارەت دکـــر عـــەقل و دیـــن و ئیمـــان
ســـاقی شەوشـــین ب ئـــابێ ئـــەنگوور
مـوطرب هەرشین ب صەیتێ صەنتوور
قـــەووال و موغـــەننی و غـــەزەلخوان
مـەخموور و سیاهـ و مەست و سـەکران
(القصـــه) ل رەغمـــێ ســـەبعێ شـــەدداد
دانـــین ب وی رەســـمی عـــورس بنیـــاد
خەططاطێ فەلەک ژ دەست قەلەم کەت
جـەللاد دکـر کـو وی قەلـەم کـەت
ناهیـــد ب عـــەردی دا ددا چـــەنگ
مەهـ چوو ڤەشری د بـورجێ خەرچەنگ
کـــەیوان د دەلـــوێ دا نهـــان بـــوو
بـــەرجیس د حـــووتی دا نشـــان بـــوو
دونیـا هـەمی بوویـە عـەیش و عشـرەت
زالا فەلـــەکێ ژ کـــەرب و حەســـرەت
چـو ژ دەسـت نـە دهـات و مایـە عـاجز
ناچـــارە عـــەجووزە بوویـــە کـــادز

شـەیخووخشێ چـەرخێ ڕەنـگ سـەماوی
ڕەهـــوار ســـەماع کـــر رهـــاوی
عالــەم هــەمی بوویــە عشــرەت ئابــاد
شـــەهری و بـــەدەوی عـەبیـــد و ئـــازاد
موســـتەغرقێ نعمــەت و طــەرەب بــوون
موســـتەجمعێ شــاهی و لـەعـــەب بــوون
ڕابووڤــە کــو خــوان ژ بــەر خەواصــان
ســـاقی گـــەڕیان ب جـــام و کاســـان
میــر خوەندنــە پـێش مــەمۆ و تاجـدین
گـۆ: خـەرج ل مــن مــەمۆ تــو شوشـبین
ئــەو هــەردو کـرن تــەمام مــەلبووس
ڕابـوون ب ئـەدەب ئەتـەک کـرن بـووس
ڕرِوونشــــتن و پێکڤـــە وان ڤـــەخوارن
ئـــەو ڕۆژ ب یـــەک ڤـــە را بـــوارن

## عەرووسییا ستی ژ بۆ تاجدینی
## تەهیئەێ ئەسبابێ شاهییە ژ بۆ تەنییا غەمگینی

وەقتێ وەکوو نوو عەرووسێ خورشید
نوهـ قوببە مثالێ جامێ جەمشید
(في الجملـه) کرن ب روخ موجەللا
گۆیا کو کرن ب زەر موطەللا
مەششاطەء و دایە و پەرەستار
عشقێ کری جوملە گەرم بازار
چوون زەین بکەن ستی و زینان
نازەندە بکەن دو نازەنینان
ئەووەل فکرین د زولف و خالان
دیتن کو دلان دبەن ب تالان
گاڤا فکرین د قەوسێ ئەبروو
بوون شوبهەتی وەسمە ژێ سیەهـ ڕوو
فکرینە روخێ د وان د تازە
شەرمەندە دبوون ب جایی غازە
قادر نەدبوون ژ سورمەێ ڕەش
ئاهوویێ خوتەن بکەن موشەووەش

سـەر تـا ب قـەدەم ژ ڕەنگـێ شـانە
سـەد سـەعی کـرن ژ بـۆ بەهانـە
مەحضـا ژ دو ئاهویـان یـەک ئـاهوو
وان سەهـ نـەکرن حـەتا سـەرەک مـوو
ئـیللا سـەرێ موویـەکی مـەیان بـوو
ئەو ژی ب مـەثەل نـە تەن نـە جان بـوو
قـەطعـا ژ مـەخافـەتا شکەسـتن
قـەط لـێ کەمـەرەک نـەهاتـە بەسـتن!
کـەس دل نـە ددا چـو لـێ ببینـت
بـەلکی کـو ژ نـازکی شـکینت
مـا دەسـت ددا کـو دەسـت و پەنجـە
حـەننا بکـەتن ب ڕەنگـێ ڕەنجـە
نەقشـێ کـو خـودێ کـری موخەییـەر
کـی قـادرە وی بکـەت موغەییـەر
ئـاخر گـەریان ژ ڕەنگـێ مـەئیووس
ئـەو مـان و حـەنا و ڕەنـگ و پـابووس
زینـەت ژ قـەدێ د وان حـەبیبان
بەخشـینە زەمـین طـەلا و شـیبان
فەرخونـدە کـرن ب فـەرقێ ئەفسـەر
تابەنـدە کـرن ب تـاجێ گەوهـەر
سـەرلەوحەئێ صـەفحەئێ موصـەننەع
زیبەنـدە ب زیـوەری مورەصـەع

پیرایــــە ژ ڕەونــــەقا جــــەمالێ
بــوو هالــە ل خەرمــەنا هلالــێ
ئــــەلماس و زومــورڕود و مــراری
خــال و خــەط و طــوڕرەئێ د طــاری
مانەنـــــدێ کتـــابێ شـــاعرانە
مەوضــوعێ ب وەضــعێ خانــە خانــە
ئــەڤ ڕەونــەقێ عارضــی و ذاتــی
بــوو نوســخەئێ ســحرێ مــوعجزاتی
ئــەبیات ب جــەمع بوونــە دیــوان
ئایــات ب صــونع بوونــە قورئــان
ئــەو صــونعەتێ ئووســتادێ موطلــەق
هــەر چــی کــو ددی دگــۆ: (هــو الحــق)
تــەزیین کــو تــەمام بــوو ل بووکــان
ئــایین کەتــە چارســوو و ســووکان
ئــەنواعێ تەجــەممول و مــەلابس
ئــــەلوانێ جــــەواهر و نــــەفائس
ســەد جاریــە و دوســەد بــەنی چــوون
زەریــەفت لبــاس و زەریــەنی چــوون
ناقــە ب قطــار و دەر ب قنطــار
یــاقووت ب بــار و زەر ب خــەروار
خــارج ژ تەعــــەددودا حســـابان
خــارق ل تەقــەییودا کتابــان

نەدهاتــە تەعــەققول ئــەڤ جهــازە
نــەدبوون موتەحــەمل ئــەو جــەمازە
ڤــێ دەبدەبــەئێ وە كرنــە عاشــق
بــوو زەلزەلــە ڕاكــرن خــەلائق
شــەهرى ژ موذەككــەر و موئەننــەث
(فــي الجملــە) موزەييــەن و مولەببــەس
تەشــبيهى ب بــەحرێ پــوڕ تەمــەووج
جــونبش دكــرن غــەرەض تەفــەرروج
ناگەهــ گــەرييا ب جــوودێ مــەفتووح
دەرگــاهێ كــەرەم ل كەشــتييا نــووح
يــەعنى كــو عمــارەيــا ســتى تــێ
قەصــرا پــەرييا ب ڕاســتى تــێ
هــەر تەختــە ژ عــوود و صەندەلووســى
تەختــەك خەتــە بەنــد و ئابنووســى
عەرشــەك ژ جــەواهران مورەصصــەع
بــەلقيس جــەليس و لــێ مورەببــەع
دەســت بەســتى ژ پێشــڤە پيشــەكاران
زەرريــن كەمــەر و گوهــەر گوهــاران
صــەد ئاصــف و بــەرخييا وەكــى بــا
حــەمالى دكــر ب عەرشــێ دلشــا
هلگرتنــە ســەر ســەرێ خــوە ئــەو مەهــد
دەست دەست درەڤان ژ هەڤ ب سەد جەهد

ئـەو تـەخت رەوان وەکـی گـەمی بـوو
بـەحرا کـو ب سـەرکەت ئـادەمی بـوو
بـەحرەک ژ هـەوا کـو بێتـە جۆشـی
ناچـــار ژ دل دکـــەت خورۆشـــی
خـــەلقێ جهـــێ جوملـــە عاشـــقانە
پەروانـــــە و شـــەمع دەر مەیانـــــە
صـــووفی و مـــەلا و فـــەقیر و پاشـــا
ڤێکـــڕا ل تەفـــەرروج و تەماشـــا
خـەلقێ کـو ژ دەسـت غـەمان ب فـەریاد
فـەردەک قـە نـەما نـەبوویی دلشـاد
هـەر بـەر دەرەکـی شـەماتەیـەک لـێ
هـــەر مەجمەعـــەکی تەماشـــەیەک لـــێ
تـە دگـۆ کـو عـەرووس عـەینێ جانـە
لـــەو بوونـــە بـــەدەن ل پـــێ ڕەوانـــە
ســازان مـری حـەی کـرن وەکـی صـوور
کـووس و دەف و کـەررەنـا و نـاقوور
شـــاباش و صـــەدا و کـــازە کـــازان
گوهـــدار غـــەنی کـــرن ژ ســـازان
ڤێکـرا کـو صـەدا ژ وان ب دەرکـەت
قەصـــرا فەلـــەکێ صـەدا ب سـەرکەت
ئـەڤ عـەیش و نشـاط و شـادمانی
نادیـــــدە ب دیـــــدەیا زەمـــــانی

فولکــا فەلــەکا مەلــەک د نــاڤێ

مــەوجان کــو ڕەڤــا د وەقــت و گــاڤێ

ئــەڤ طەنطــەنــە و شــعار و ئــايين

چــوون لەحظــەيــەکێ گهانــە تاجـدين

تاجــدين ب خــوە بوويــە پادشــاهەک

مــەم ژی ل تەنشــتێ شــوبهی ماهــەک

ڕوونشــــتی د شەهنشــــينێ عــــالی

جــەمعێ کــو ژ ئــەکابران حــەوالی

ڕابــــوون ل تەفــــەرروجێ ڤەوەســــتان

وان جوملــە طــەبــەق د هــەردو دەســتان

مانەنــــدێ طبــــاقێ ئاســــمانی

يــــاقووت وزومــــورردێ د کــــانی

ڕێهــــتن طــــەبــــەقێ د وێ نثــــارێ

ژۆردا ل عماريــــــا نگــــــارێ

ئــەمما طــەبــەقێ د وان هــەمی پــوڕ

زيـــــڤ و وەرەق و جــــــەواهر و دوڕ

يــەغما کــر و گــەنج بوونــە ماشــا

خيــزان هــەمی بوونــە ميــر و پاشــا

ســەد جــار ل هيڤيــا حەريصــان

خــارج ژ جــەڤاندنا خسيســان

فاضــــل ژ کەرامــــەتا کــــەريمان

زائــــد ژ خودانييــــا لــــەئيمان

خیــزان و گـــەدا وە بوونـــە مـــونعم
مـــوفلس بوونـــە زەنپەرەســت و مـــوغلم
خیــزان و گـــەدا غـــەنی و زەنگـــین
شـــادان و حـــەزین و شـــا و غـــەمگین
ئێـدی نـــەدبوون ژ هـــەڤ موشـــەخخەص
تـــە دگـــۆ هـــەمی میـــرەکـــن مورەخخـــەص
تێکـــــدا د موناســـــب و موافـــــق
ڤێکـــــڕا د موصـــــافح و موعـــــانق
حاصـــل کـــو ژ مەقصـــەدا سەرامســـت
بوون ئـەو دەر و بـان و ئـەو سـەرا مەست
هـــن مەســت و هنـــەک دیگـــەر د بـــەنگی
خوانەنـــدەء و بـــەذلـــەگـــۆ و چـــەنگی
هـــەر بـــەنگی و سەرخوەشـــێ د بوهتـــان
تێـــک هاتنـــە چـــەرخ و بـــاز و لۆتـــان
بیریتـــە ســـەما و ســـاز و گۆڤەنـــد
شـــێرینێ شـــەکەرلەب و شـــەکەرخەند
عـــــەذرا و رەوال و بکـــر و مـــــوردان
حـــوور و مەلـــەک و پـــەری و وولـــدان
گـــول پیرەهـــــەن و ســـــەمەن قـــــەبایان
شـــــەککەر دەهـــــەنان و قەنـــــدخایان
زەرریـــن کەمـــەران و کـــەج کولاهـــان
طـــەلعـــەت قەمـــەران و خـــەط ســـیاهان

سیمین بەدەن و سەمەن عوذاران
سیڤین ذەقەن و مەمک هناران
ئەڤ مووێ میان و مار و گیسوٚ
ئەڤ چاردە سال و چار ئەبروو
مووردان و موراهق و موجەررەد
لاوێ دگوٚ خەط وەکی زومەررەد
خوەش دەنگ هنەک هنەک د خوەش ڕەنگ
هن جەرگەبەزی و هن دیگەر لەنگ
(بالجملە) ل ڕەغمێ ڤێ عەجووزێ
یەعنی ل خیلافی پوشت کووزێ
قیزێ د سڤک کوڕێ د لاوین
مانەندی بەنات و مثلێ پەروین
هن دائرە بەند و هن د دەووار
هن سلسلە بەند و هن د سەییار
ئەنجوم صفەت ئەنجومەن فورووزان
هەفت شەڤ د تەمام و هەفت رووزان
بەزما ستییێ و جەمعێ تاجدین
گێران ب ڤی ڕەنگی زیب و تەزیین

## مەقالێ ئشتعالێ شەمعێ جەمالێ
## مەحبووبە مەقامێ ئنتقالێ ئشتغالێ وصالێ مەطلووبە

دامــانێ عەرووســێ پــاکێ گــەردوون
دامــاد کــو کــر ب مهــرێ گولگــوون
تــاریتی ب روهنییــێ کــو ڕاکــر
غــەم شــوبهەتی ظولمــەتێ فــەناکر
وەقتــێ ســەحەرێ ژ ڕۆژێ حــەفتێ
ئــاگر تــە دگــۆ گەهشــتە نــەفتێ
گەرمییــەتێ نــارێ قــوربێ مەقصــوود
ڕاکــر ژ ووجــوودێ عاشــقان دوود
جەمعییــەتێ خــاص و ئاتــەش و بــاد
ئەلبەتتــە دکــەت مرۆڤــی بــەرباد
ئــەڤ عشــق و هــەوا کــو بوونــە دلــداش
جــان و دلــی دێ بــدەن ب شــاباش
صــــەبرا شــــەوتاندی ئفتراقــــێ
تێــک ســوهت قــران و ئحتراقــێ
دەریــایێ مەحەبیــەت ئوشــتولوم کــر
ئــارام و شــەکیب و صــەبر گــوم کــر

مـەحبووب و موحـب ژ فـەرطێ تەشـوير
هــاتن كــو بــبن ب شــەوقێ تەقــدير
مەشـشـــاطە و مهربـــان و دايـــين
شوشـــبين و مـــەحارمێ د تاجـــدين
موســـتەوجبێ وەقتـــێ ديـــن مولاقـــات
بـەر مووجـب و موقتـەضـايێ عـادات
مــەجمووعێ موبــەخخرات و مــوعطر
مــەمزووجێ موفــەررحات و موســكر
جـــام و قـــەدەح و ئيـــاغ و مەخمـــەر
ئەڤ مسـك و زەباد و عـوود و مەجمەر
مــاوەرد و گــولاب و عــەطرێ شــاهى
(القصــه) ز مــاهێ تــا ب مــاهى
ئەسـبابێ نشـاط و عـەيش و عشـرەت
ئــالاتێ صــەفا و ذەوق و صــوحبەت
ئــەو چەنــد كــرن ئــەوان موهــەييا
مەحضــا مــرى پــێ دبــوون موحــەييا
ئاراســـــتە بــــوو عەرووســــــخانە
ديـــــوار و دەر و عورووشـــــخانە
ڕابوونـــە ڤـــە خاصـــەكى و خـــادم
هنـــدەك د ئـــەقارب و مـــــەحارم
شـــەمعەك ب تەمامـــەتێ موطـــەلـــلا
شەمســـەك ب جەمالـــەتێ موجـــەللا

هلگرتنــه ســەر ســەرێ خــوە ڕەققــاص
ئینانـــــه میـــانێ مەجلســـا خـــاص
شـــەمعێ ب زەبـانێ حـــال بـــێ قـــال
ئـــەڤ ڕەنگەهـــە کـــر بـــەیانێ ئـــەحوال
کـــای عاشـــقێ بـــێ قـــەرار و بـــێ تـــاب
گـــەر شـــوبهی منـــی خـودان تـــەب و تـــاب
ڕابـــە هـــەڕە حەجلـــەیا عەرووســـێ
پابەنـــــدە ببـــه ب پـــایێ بووســـێ
شـــــەمعا تـــه وەکـــی تـــه ئنتظـــاره
شـــەوقا تـــه ل جـــان و جســـمی نـــاره
ســـوهتن نـــه بەســـه مثـــالێ شـــەمعان
بـــەس شـــوبهەتی مـــن ببـــاره دەمعـــان
گـــەر عاشـــقی ڕابـــه شـــوبهی فـــەرراش
جـــانێ خـــوە بـــدە نثـــار و شـــاباش
ئـــەی ســـاعیێ مەقصـــەدا طـــەوافـــێ
وەی ســـالکێ مەنهـــەجا مـــەطـــافێ
ئـــەو قبلـــه و کـــەعبـــەیا تـــه مەقصـــوود
نێزیکـــی تـــه بـــوو ب ئـــەمرێ مـــەعبوود
بـــەیت و حەجـــەر و مـــەقـــام و حـــوجره
ســەعی و طـــەلـــەب و طـــەواف و عـــومره
بـــاری ژ تـــــه ڕا کـــــرن موقـــــەددەر
هـــا بوونـــه ژ بـــۆ تـــه ڕا مویەسســـەر

ئـاڤی تــو ڕەوان بــە پێشــی ســەلوێ
شـێرین تـو هـەمـان کـەرم کـە خـەلوێ
تاجــدینی ژ صـــوورەتێ شـــەمالێ
مـــەعنایێ مەحبیـــەتا شـــەپالێ
زانـــی ب تەئـــەممول و ب ئـــدراک
ڕابــوو ژ جهـێ خـوە چوسـت و چـالاک
یــارێ غــەم و شــاهییان مــەمێ ژار
ڤێـــڕا بوویـــە صــاحب و ســلەحدار
دەســتێ وی د دەســت و دل د دل بــوو
بــوو حـاجبێ دەرگـە شـیر ل مـل بــوو
تاجـدین ب ڤـی طـەرزی چـوو سـەرایێ
مــەم مـــا ل دەری د گـــەل دوعـــایێ
لـەورا کــو موخــەوف بــوو مولاقــات
مەلزوومــە ل عاشـــقان موعـــادات
گـەر قسـمێ موجـب و گـەر حـەبیبن
ئەلبەتتـــە ب دوژمـــن و ڕەقیـــبن
هــن دێــو و هنــەک ژ وان پەرینـــە
هنـــدەک د مونـــافق ئادەمینـــە

## ووصوولێ کەعبێ موراد و طەوافە
## و حوصوولێ مەرام و زفافە

زاڤا ب ئەدەب کو چوو ژ دەردان
شەمعا کو ل پێش حجاب و پەردان

رابوو کو ژ پێرڤە چو خرامان
کێشا ل زەمین ب ناز دامان

زولفێ د خوە کرنە پایێ ئەنداز
دەستێ د خوە کرنە فەرقێ پەرداز

دیتما کو ب نوورێ (بیت الأقصی)
قەندیلێ فەلەک ب وی تەییسا

مەخموورێ غەبووقێ دەردێ هجران
موشتاقێ صەبووحێ وەصلێ جانان

ژ ئەووەل ڤە ل عادەتێ موباحی
دەستێ خوە درێژ کرە صوراحی

نووشی ژ صوراحییا شەکەرلەب
نووشین قەدەحەک ژ مەی لەبالەب

مەخموور کو دەفع کر مەیا ناب
بهن کر گول و سونبولێ د سیراب

گەهـ نـەرگس و لالـە گاهـ سـۆرگول

رەیحـان و بنفشـە گاهـ سـونبول

تێـک تێکڤـە ددان و تێـک دبەسـتن

هـن بۆسـە ددان و هـن دگەسـتن

ئـەو چەنـد ب یـەکڤـە ڕادمووسـان

نەوبـەت نـە ددانـە هـەڤ ل بووسـان

ئـەلماس و گوهـەر جـەبین و دنـدان

تەبـدیل بـوویین ب لـەعل و مـەرجان

دەریـایێ مەحەببـەتێ وە کـر جـووش

دەست گەردەن و لەب ب لەب هەم ئاغووش

مـەدهووش بـوویین ب وێ مـودامێ

بـێهش وە کـەتن ژ سـەر قیـامێ

قـادر نـەدبوون بکـەن قوعـوودێ

گێـڕ بـوون ب یـەکڤـە بـۆ سـوجوودێ

تـەکرار ژ سـەجدەئێ کـو ڕابـوون

ئـەو چەنـد ب یـەک ڤـە هـەردو شابوون

شـەککەر ژ لـەبێ د یـەک ڕەڤانـدن

سـۆرگول ژ روخـێ د یـەک جڤانـدن

تـەرکیب کـرن ژ بـۆ خـوە گولقەنـد

تـەزویج کـو بـوون ب یـەک ڤـە دلبەنـد

سـێ ڕۆژ و شـەڤان ب دل پەیاپـەی

وان تەشـنە لـەبان ڤـەخوارن ئـەو مـەی

موستەسـقی و شـەربەتا مـەیا نـاب
ئـاخر کـو نـەبوون ب شـوربێ سـیراب

کەیفییـەتێ نەشـئەیا شـەرابێ
کێشـانە کـەمالێ ئضـطرابێ

صـافی ذقـەن و بـەدەن شـەفافێ
کـر مـەیل و مەحەبیـەتا زەفـافێ

سەرمەسـت و ب دەسـت تێـک هەرستن
بـوو گەلتـە و گـەلج و دابرسـتن

دەم لێـک بچیـان و دەم جـودا بـوون
گەهـ تێـک هژیـان و گەهـ دبـا بـوون

دەم ئـەو ددو بـوون و گاهـ یـەک بـوون
گەهـ جۆت و ب یەکڤە گاهـ تـەک بوون

تیـرا کـو ژ عـاجێ بـەر هـەدەف بـوو
ئامـاج ب صـەفوەتا صـەدەف بـوو

ئامـاج کـو بـوو مەحـەللێ پـەیکان
دوڕدانـە بـەدەل کـرن ب مـەرجان

نـەبل هاتەڤـە نەصـل مـا د وێ دا
نەسـلا خـوە ژ جـان و دل ب وێ دا

پەیوەسـتە ب ڕۆژ ئەگـەر ب شـەڤ بـوون
وان پـوڕ ژ مەحەبیـەتێ ب هـەڤ بـوون

هـەموارە دو سەرخوەشـێ د سـەرکش
ڤـالا دکـرن ل یـەک دو تـرکش

گەر ڕۆژ و وەگەر شەڤێ د ڕەش بوون
ئەو هەردو مەلەک وە پێک د خوەش بوون

گۆیا تە دگۆ دو کیمیاگەر
مەشغوول بوویین ب عقدێ جەوهەر

ئەو رووح و جسەد ب یەکڤە مونضەم
نەفسەیێن ب یەک ڤە بوونە مودغەم

ئنزالێ لەگەل نزوولێ ئبریق
تەصعید کرن ب قەرع و ئەنبیق

مەمزووج شەبیهی شیر و شەککەر
مەخلوط وەکی حەیات و کەوثەر

قەطعا چو نەبوو نە خور نە خوابەک
وان بیر نە دهات نان و ئابەک

ئەو هەفتە تەمام بوویە گەردەک
ئاگاهـ نەبوون ژ حالێ فەردەک

غالب گەڕیا ل دەردی صححەت
غەم چوون ڤەشرین ژ کەربێ وەصلەت

ئاگەهـ سەحەرێ ژ ڕۆژێ حەشتێ
رضوان مەشیا ژ نیڤ بەحەشتێ

مەم هێژ وسا ل بەر دەری بوو
دائم ئەوی سەر ل سەر بەری بوو

هێژا ئەوی مەسکەن ئاستان بوو
ڕۆژان و شەڤان وە پاسبان بوو

تاجدین کو ژ گەردەکێ بدەرکەت
ڕۆژەک تە دگۆ مەمێ ب سەرکەت
(في الحال) وە ڕەنگە شادمان بوو
هەم ئەفسەر و ئەوجێ ئاسمان بوو
یارەک تە هەبت مەگەر وە بیتن
گەر دێ وە نەبت مەگەر نەبیتن
یارێ ب تە ڕا بتن موافق
سەد خزمێ د خائن و مونافق
قوربان بکە قەط مەبێ مخابن
چ دکەی ب کسان کو بێ وەفا بن
قوربان بدە قەط مەبێژە کینە
بێ کێرە برا ئەگەر ب کینە
یارێ تە ژ بۆ تە ڕا برایە
هەم چاڤە ژ بۆ تە هەم چرایە

## حیلەپەروازی و فتنەئەنگیزییا بەکرە ژ حەسەدبرنا ل تاجدین کو بووی سەبەبێ میر نەدا مەمێ زین

گاڤا ژ عەدەم خودێ کر ئیجاد
ئەڤ کەون و مەکان ژ نووڤە بنیاد

مەجمووعێ موکەووناتێ عالەم
حەتتا ڤە خەلاصە نەوعێ ئادەم

ئەشیا ب حەسەب صفات و ئەفعال
ئینانە ووجوودێ موختەلف حال

مەوجوود کرن ب هەڤ موعەییەن
ئەضداد کرن ب ضد موبەییەن

ئەڤ ئەرض و سەما بەطیء و دائر
ئەڤ مولک و مەلەک موقیم و سائر

ئەڤ نوور و ظەلام و کوفر و ئیمان
ئەڤ خولد و سەقەر بەهەشت و نیران

ئەڤ بارد و حارر و رەطب و یابس
ئەڤ میر و گەدا غەنی و بائس

ئەڤ ئاخ و هەوا و ئاگر و ئاڤ
ئەڤ لەیل و نەهار و سی و سیطاڤ

ئەڤ هەجر و وصال و شاهی و غەم
ئەڤ مەوت و حەیات سورروور ومەئتەم
هن نوور مثال و هن وەکی نار
هندەک د حەلیم و هن د دژوار
ڤان صادق و ڕاست و خێرخواهان
ڤان قومصی و خوار و ڕووسیاهان
ڤان ئەهلێ جەهەننەم و عەذابان
ڤان لائقێ جەننەت و ثەوابان
نابینی کو پێکڤە جوملە ضددن
حکمەت چیە؟ بۆچی پێکڤە نددن؟
لەورا کو نەبت ئەگەر تەخالوف
تەمییز مەحالە هەم تەعاروف
(القصە) ب ئقتضائێ خلقەت
میرێ ب کەمال و عزز و رفعەت
ڕاگرت ژ بۆ خوە دەرگەڤانەک
فەتتانێ زەمانە صەی پصانەک!
دائم ل دەرێ وی قاپۆچی بوو
قەللاع و قەلاش و قەهوەچی بوو
ئەمما ب نسەب نەمەردێ بوهتان
بەلکی موتەوولدێ ژ بوهتان
ئەصلێ وی دبێن ژ مەرگەڤەڕ بوو
مەحضا وی بەشەر ب شۆر و شەڕ بوو

نــاڤێ وی مونــافقی بــەکر بـــوو
بەلکـــە ژ بـــەلووقیا بـــەتر بـــوو
مـــەنناع و موذەبـــذەبین و ئبلـــیس
خـــەدداع و خەبەربـــەزین و تـــەلبیس
شـــاگردێ شـــەئامەتا وی شـــەیطان
شـــەرمەندە ژ گوهتنـــا وی بوهتـــان
بـەد چـەهرە ژ ڕەنگـێ دێـو و کـابووس
بـــەد فعلـــێ ســـتیزەکار و ســـالووس
تاجـــدین دگۆتـــە میـــر عـــەیانی:
میـــرم بکـــە دەر ڤـــی دەرگـــەڤانی
ئـــەڤ لائقـــی دەرگـــەهێ تـــە نینـــە
ئـــەڤ کەلبـــە نهینـــدرە ب کینـــە
هـــەر چەنـــد صـــە و دەرگـــەڤان برانـــە
ئەکثـــەر صـــە ب مهـــر و بـــا وەفانـــە
ئـــەڤ ڕەنگەهـــە میـــر دگۆتـــە تاجـــدین:
فعلـــێ د بـــەکر مەگـــەر نـــزانین؟!
ئـــەم قســـمێ ئـــەمیر قســـمێ ئاشـــین
پـوڕ فـەتل و گـەڕیـن و پـێش و پاشـین
ناچـــارە ژ بـــۆ مـــە ئاشـــڤانەک
(لابـــوددە) ژ بـــۆ مـــە دەرگەڤانـــەک
هنـــدی ب حوکومـــەتێ دکـــین دەور
گەهـ عەدلـە ژ بۆ مـە کـار و گەهـ جەور

هـــەر چەنـــد بـــەكر وەلـــەد زنايـــە!
ئاشـــێ مـــە ژ وی ب فـــەتل و بایـــە
ئـــەڤ زومـــرە كـــو ظـــالم و عـــەوانن
سووباشـــی و شـــەحنە دەرگـــەڤانن
ئاشـــێ د مـــە ظالمـــان دگێـــڕن
دەخلـــێ د مـــە ظالمـــان دهێـــرن
ئاشـــێ مـــە ئەگـــەر چ وەقفـــێ عامـــە
گـــەوری تـــژی گارســـێ حەرامـــە
وی گارســـــی حارثـــــەک دچینـــــت
ئـــەڤ حارصـــە بـــۆ مـــە دێ هلینـــت
ئـــەڤ عادەتـــە نینـــە خاصـــێ میـــران
نـــابینی ل بـــەر دەرێ فـــەقیران
وان ژی هـــەمی پاســـبان ژ صـــانن
ئـــەو ژی هـــەمی قســـمێ دەرگـــەڤانن!
ســـولطانێ ســـەریرێ بـــێ نیـــازی
نـــابینی ژ بـــۆ وی چـــارەســـازی
هنـــدی ئـــەوی ڕاكـــرن ســـەلاطین
دەهـــ چەنـــد ئـــەوی چێكـــرن شـــەیاطین
حاصـــل د صـــەیێ خـــوە میـــر نـــەبۆری
تـــەعلیل ددانـــە بـــەر ضـــەرووری
میـــران هەنـــە ئـــەو صـــەیێ د تـــازی
نـــادن ب عەدالـــەتێ د تـــازی

ئــەو كينــەوەرێ خــەبيث و مــودبر

يـــەعنی بـــەكرێ ب دل مـــوزەوور

خـەوفا وی هـەبوو ب خـەف ژ تاجـدين

دائـــم د دلـــێ وی دا هـــەبوو كـــين

وەقتـــێ كـــو ب دەولـــەت و ســـەعادەت

ئـەڤ دەعوەتـە بـوو ب رەسـم و عـادەت

خـــەف ژ ئادەمييـــان وەكـــی عـــەزازيل

مەحضـا غـەرەضـا وی كـذب و تەسـويل

تـــەنها وهـــە گۆتـــە ميـــر د خـــەف دا:

ميـرم تـە سـتی قـەوی تەلـەف دا!

ئـەو جەوهـەرێ تـاج و تـاجێ جەوهـەر

ئـەو ئەفسـەرێ زيـب و زيبـێ ئەفسـەر

ئـەو رەنـگ سـەزايێ تـەخت و ئـەورەنگ

فەرزانـە ب عـەقل و فـەرر و فەرهـەنگ

كەســـرا ب كەســـەر ژ بـــۆ وێ دينـــێ

فـــەغفوور ب غـــەور بـــوو ئـــەڤينێ

قەيصـــەر ژ كـــورێ خـــوە ڕا بخوەســـتا

خاقـــان ژ پێشـــڤە دەســـت ب بســـتا

هێـــژا نـــەدبوو ئـــەوێ تـــو ئـــەرزان

ئـــەڤ رەنگەهـــە سەرســـەری بـدەی وان

ميـر گـۆ: قـە ددەم ئـەيا بـەد ئەختـەر

تاجـدين و مـەمێ ب تـەخت و قەيصـەر

ڕۆژا وەکوو بوویە جەنگ و پەرخاش
تاجدین و مەمێ دوسەد قزلباش
(بالجملە) ب زرهـ و زەند و بنپەڕ
ئینان ژ مە ڕا ب شیر و شەشپەڕ
خاقان چییە ئەز چ کەم ب فەغفوور
نادەم ئەز ئەوان ب روبعێ مەعموور
مەلعوونی کو دی نەبوو چو تەئثیر
ئەو مسئەلە وەرگەڕاندە تەزویر
گۆ: قەنجە حەقیقەتا هومامان
هەمسەنگێ صەداقەتا غولامان
ڕۆژا ڤەدخۆن شەرابێ بەلوا
گاڤا کو دخۆن کەبابێ سەلوا
چاوانە د شاهی و صەفایێ
ئەو ڕەنگە د تەنگی و جەفایێ
عارض نەبتن ل وان تەبەددول
ظاهر نەبتن ژ وان تەحەوول
مەحضا نەکەن ئەڤ قوصووریٚ خدمەت
قەطعا نەکەن ئەو فوتووریٚ هممەت
ئەو ذەوق و جەفا ببن موقابل
ئەو صدق و وەفا ببن موعادل
لێ ضائعە هممەتا کەریمان
دەر حەققێ نەلائق و لەئیمان

ناکەس نە سەزایێ گەنج و مالە
نوورەس نە موناسبێ جەلالە
مەنظوورەئێ نوورەسان شەرابە
مەخموورەئێ سەرخوەشان خەرابە
پوڕ عەقلی دڤێت و پوڕ تەحەممول
نوورەس ب مەیێ نەکەت تەحەموول
میرم تە نەدی کوڕێ سکەندەر
دایێ تە نەظەر ژ حەددی چوو دەر
ڕۆژا کو ستی تە دایە تاجدین
وی ژ ئالێ خوە دائییە مەمێ زین
میر گۆ: چ عەجەب ب من نەکر پڕس
یانە قە نەمایە وی ژ من ترس؟
گۆ: ما تو نزانی ئەو کوسانە
میرزایە جوانە پەهلەوانە
مەیدان دییە وی جلەو ڕەڤایە
هەرچی وەکوو ئەو بکەت ڕەوایە
ترسا من ئەوە ب کبر و کینێ
طوغیان بکەتن ژ پاشی زینێ
دەعوا نسەبێ بکەت ب خالد
قەصدا حسەبێ بکەت زەوائد!
میر گۆ: مە د دل هەبوو ب داخواز
زینێ ب مەمێ بکەم سەرەفراز

سووندێ دخۆم ئەز ب رووحێ والد

حەتتا بگەهیتە جەددێ خالد

مەحضا ب ذوکووریێ نەسلێ ئادەم

زینێ ب ژنینی ئەز قە نادەم

هەرچی ژ سەرێ خوە بوویە بێزار

ها زین و بەلا بیت خەریدار

میرێ ژ سەر و روحا خوە تێرە

بێ خەوف بخوازتن کو مێرە

حوککام ب باطن و ب ظاهر

بێ شوبهە موشابهن ب ئاگر

ظاهر د صەپاحی و ب نوورن

باطن ژ مەدارەئێ د دوورن

ڕەحمێ کو دکەن ژ ڕەنگێ ڕۆژن

قەهرێ کو دکەن جهان دسۆژن

زنهار نەکەی ب وان تو باوەر

گەر باب و پسی وە گەر برادەر

خاسما کو موقەررەبێ د بەدخواه

نێزیک ببن (نعوذ بالله)!

## نائومێدییا زینێیه ژ دەولەتا وەصلەت و حەسرەتێ
## دەردەمەندییا وێیه ژ کوربەتا فورقەت و حەسرەتێ

تاجدین و ستی کو بوون ب هەڤ شاد
وەصلێ کرن ئەو ژ هەجرێ ئازاد
مەم مایە د کونجێ وەحدەتێ فەرد
نە یار و نە هەمنشین نە هەمدەرد
هەمدەم کو نەبن ژ بۆ دەمان را
هەمدەرد نەبن ژ بۆ غەمان را
غەمگین ب چ دێ بکەن تەحەممول
شاهین ب چ دێ بکەن تەوەسسول
شاهی و غەمان دڤێت ئەنباز
دەردان و دەمان دڤێت دەمساز
ئونسییەتێ عاشقان سوکوونە
سەرمایەئێ وەحشەتێ جونوونە
ئاسوودە دبن ب یەک دو هەم قال
خاسما کو هەبن ب یەک ڤە هەم حال
زین و ستی و مەمۆ و تاجدین
ڤێکرا دکرن مەدار و تەسکین

زینـــێ کـــو دکـــر ژ دەردێ ئـــەفغان
دەنگـــێ ســـتیێ دبوویـــە دەرمـــان
گاڤـــا وەکـــوو مـــەم ب دل دنـــالی
تاجـــدین دبوویـــە حـــەکیم ل ئـــالی
ئـەڤ هـەردوو ژ هـەر دووان جودابـوون
چوون هەردو ب مەقصەدا خوە شابوون
مـــان زیـــن و مـــەمێ د بـــێ ســەرەنجام
بـێ مەقصـەد و بـێ مـوراد و بـێ کـام
چـل ڕۆژی نـــە خـــۆر نـــە خـــواب زینـــێ
ســـــەر ڕانـــــەدبوو ژ ســــەر گرینـــێ
خوونـــا دلـــی بـــوو غـــذا و خـــوارن
هێســـتر ب خـــوە شـــەربەت و ڤـــەخوارن
هـــەمواره ب ڕۆژ ئەگـــەر ب شـــەڤ بـــوو
وێ حـــال ژ فورقـــەتێ هـــەر ئـــەڤ بـــوو
ڕۆژان دگـــری ب شـــەڤ دکـــر ئاهـــ
ئـەو ڕەنـگ گـەڕیا ضـەعیف ئـەو ماهـ
بـــەدرا ڕوویـــێ وێ بـــووە هلالـــەک
طـــەلعـــەت د نومـــا وەکـــی خەیالـــەک
هــــەمزاد و هــــەڤال و هەمنشــــینان
هــــەمزار و ئــــەمین و نازەنینــــان
هـــەر لەحظـــە دگۆتنـــە وێ ب رقـقـــەت:
کـــەی ســـەروێ ریاضـــێ بـــاغێ رفعـــەت

سەرسـەبزی و تـازە بـەرگ بـاری

ئـەڤ چەنـدە چ هێسـتران دبـاری

هەمشـیرە ئەگـەر ژ تـە جودابـوو

خوەش چوو و ب هەمسەرێ خوە شابوو

وێ گرتییـە بـۆ خـوە صـەبر و تـەمکین

ئـەو شـایە ل وێ تـو لێـرە غـەمگین

(مـن بعـد) غـەمان ژ قـەلبی ڕاکـە

تەشـبیهی ب زولفـێ بـەر ڤەباکـە

چـین چـین بکـە طـوررەئێ د شـەبرەنگ

گـول گـول ڤەکـە عارضـێ د گـول ڕەنـگ

زولفـان ڤەکـە دا بـبن موسەلسـەل

ئکلیلـێ ل جەبهـەتێ موکەللـەل

بسـکان تـو ژ خومرییـان جـودا کـە

زولفـان شـەکە پێکڤـە بـەر هـەوا کـە

دا سـونبول و سـۆرگول ئاشـنا بـن

ڕەیحـان و بنەفشـە طـا ب طـا بـن

بسـکان بوەرینـە سـەر هـەلالان

سـەودا کـە د بەککـەئێ بـەلالان

دیسـان بکـە خـەمرییان قـەدەح نـۆش

جەعـدان ڤەکـە کەعبـە بت سیەهـ پۆش

تـا خـەلق ژ غـەرب و شـەرقێ تـا شـام

حوججـاج صـفەت ببیـنن ئحـرام

پەیوەندە کە پێکڤە بسک و خالان
شیرازە کە موصحەفا جەمالان
سەرلەوحێ دیم بیت موذەهەب
ئایاتێ خودێ ببن مورەتتەب
دا فرقێ کافر و موسلمان
تەصدیق بکەن ب نەصصێ فورقان
ڤان غەمزە و ئاورێ د خوونخوار
وان خەنجەر و کەیبرێ د دژوار
زنهار! مەدێ جەوازێ روخصەت
وان نینە ب کەس چو رفق و رەحمەت
مەئذوون بکە طوررەئێ د طەررار
دا حوکمی بکەن ل شاه و خوندکار
پەردێ تو ژ بەر گولان هلینە
پێ صەبرێ بولبولان ببینە
خەندان بکە غونچەیا دەهانی
نالان کە هەزار داستانی
سەرخوەش کە ل گەردەنێ گوهاران
سەرسەم کە جونوون و دین و هاران
مەیخوەر کە مەلان ب غونج و نازان
شەیخان بشهینە بەر بەرازان
دەستوور بدە بسک و زولف و خالان
ئاگاه بگێرە ئەهلێ حالان

دا مورشـد بـێ ل طـەریقـێ هـائم
سەرگەشـــتە بنـــێ وەکـــی بـــەهائم
ئەگـــار بکـــەت ضـــەلالـێ موطلـــەق
ئقـــرار بکـــەت ب صـــوورەتێ حـــەق
فـــارغ ژ تەجـــەللییا جـــەلالێ
قـــانع ب تەصـــەوورا جـــەمالێ
فـــانی بکـــەتن ئـــەوێ ووجـــوودێ
بـــاقی ببـــتن ب ڤـــێ شـــوهوودێ
ئـەڤ چەنـدە ئـەوان دگـۆتن ئـەڤ پەنـد
زیـن پـێ نـەدبوو صـەبوور و خورسـەند
بـــەلکی ب نەصـــیحەت و ب پەنـــدان
یـــەک جـــار دکەتـــە بـــەلا و بەنـــدان
عشـــق ئـــاگرە نەفخەیـــە نەصـــیحەت
سـڕ پەردەیـــە لەومەیـــە فـــەضـــیحەت
هنـــدی کـــو ئـــەوا دکـــر مەلامـــەت
وێ زێـــدە دبـــوو ژ وان نەدامـــەت
ئەشـــکان نـــەددانـــە چـــاڤی فورصـــەت
ئاهـــان نـــەددا دەهـــانی موهلـــەت
دا ئـــەڤ ب کەلامـــەکی خەبـــەر دەت
یـــا ئـــەو ب مەقامـــەکی نـــەظـــەر دەت
ناصـح فکـرین کـو وەعـظ و تـەقریر
ناکـەن ب چـو ڕەنگـی نـەفع و تـەئثیر

مــايين د تەعــەجوبێ كــو ئــەو ماهــ
ئــەڤ چــەنــدە ژ بــۆ چــڕا دكــەت ئاهــ
وان هــەر وە قيــاس دكــر كــو زينــێ
هــەر بــۆ ســتييێ دكــەت گرينــێ
ديــتن كــو خەبــەر هــەمى هــەوا بــوون
ناچـــار كـــرن ســـوكووت و ڕابـــوون
زيــن مــا ب تنــێ د گــەل غــەمان جــۆت
غــەم لــێ جڤيــان ژ بــۆ غــەمان گــۆت

## هەمدەمیا زینێ د گەل غەمان
## ب سەبەبێ نفاق و نائعتمادییا هەمدەمان

١

کـــای هەمنەفســـێ د بـــێ نـــەوایان
فەریادرەســـــێ د پـــورێ جـــەفایان
هەمـــــدەردێ دلـــێ د دەردەمەنـــدان
هەمپـــەردەئێ ســـررێ موســـتەمەندان
هـــــەمرازێ دلـــــێ د دل برینـــــان
هەمخوابـــــەئێ خـــــاطرا حـــــەزینان
هەمکاســـەئێ خـــوانێ بـــێ طـــەعامـــان
هـــەم مەشـــرەبێ راحـــێ تـــەلخ کامـــان
عاشـــق ب وە واصـــلێ جـــەمالن
ســـــالک ب وە نـــــائلێ جـــــەلالن
ویرانـــــەئێ دل وە مایـــــە خـــــالی
قـــەط غـــەیری وە کـــەس نـــەهن حـــەوالی
چـــاوا دکـــرن ژ بـــۆ خـــوە مـــەعموور
موطلـــەق ژ وە ڕا مـــە دایـــە دەســـتوور
دەولـــــەت ب وەیـــــە د دارێ دونیـــــا
رفعـــەت ژ وەیـــە ســـەرایێ عوقبـــا

غـەم لـەو مـە دڤـێن کـو بـا وەفانـە
نـابێن ئەڤـە تـەحل و یـان جەفانـە
ڕۆژا ڕەشـیانە یـاریَ جـانی
یـاریَ خوەشـیانە شـادمانی
کـەونین چ عاجـل و چ ئاجـل
غـەمخواری نـەبت کـوو تێتـە حاصـل؟
حاصـل ب وە خـوەش دبـت ل مـن دل
بـێ گـەنج غـەمان ژ دل چ حاصـل
گەهـ گـاهـێ دکـر سـتی موخاطـەب
ئـەڤ ڕەنگەهـە ئـەو مەلـەک موعاتـەب

## موعاتەبیا زینێ د گەل ستییێ
## گازندا حووریێ ژ پەرییێ

کـــای رووح و رەوانـــێ قـــەلبێ زینـــێ
نـــوورا بەصـــەرێ د یـــار و دینـــێ

هەمشـــادی و هەمجـــەفا و هەمـــدەم
هەم لـەحم و عـەظم و جلد و هـەم دەم

هەمشـیرە و هـەم جـەناح و هـەم سـەر
هـەم بیضـە هـەم ئاشـیان و هـەم پـەڕ

وەی طـەبعێ ب طـەبعێ مـن موطـابق
ئـیللا کـو ب بـەختی نـاموافق

سـەد شـوکر تـە بـەخت بوویـە یـاوەر
چـاوا تـە دڤـێ وە دا تـە داوەر

سـەد شـوکر تـە بـەخت بـوو موسـاعد
طـالع گـەرییا ژ بـۆ تـە سـاعد

بـەختێ مـن ئەگـەر چ زێدە ڕەش هـات
ئەڤ قسمەتە بۆ مە زێدە خوەش هـات

تەقسـیمێ غـەمان ژ بـۆ م ڕا بـوو
تەقـدیرێ ئـەزەل یـەقین وسـا بـوو

شــاهی ژ تــه ڕا و غــمم ژ بــۆ مــن
تاجــدین ژ تــه ڕا و مــمم ژ بــۆ مــن
غــمم چونکــه ل صــوورەتێ مەمێنــه
لــەو غــمم ژ مــه ڕا ل ســمر غەمێنــه

## موکالەمێ هەمرازێ شەمعێیە
## موداوەمێ خونرێژێ دەمعێیە

دەم شـەمع دکـر ژ بـۆ خـوە دەمسـاز
کـای هەمسـەر و هەمنشـین و هـەمراز

هـەر چەنـد ب سـوهتنێ وەکـی مـن
ئـەمما نـە ب گـوهتنێ وەکـی مـن

گـەر شـوبهەتێ مـن تـە ژێ بگوهتـا
دێ مـن ب خـوە دل قـەوی بسـوهتا

دەردێ مـن و تـە ژ یـەک ب فەرقـە
ئـەو فەرقـە ژ غـەربێ تـا ب شـەرقە

مەشـرق تـویی ئـاگرێ تـە ظـاهر
مـەغرب ئـەز و بـاطنێ مـن ئـاگر

دائـم دسـوژت مـە رشـتەئێ جـان
تـە ناسـوژتن ب غـەیری ئـەزمان

پێهـت مـن ل سـەری د دل پەرەنگـە
جـانێ مـە د گـەل پـەرەنگێ جەنگـە

شـەوقەک تـە ل سـەر سـەری دیـارە
سـەودایەکە سەرسـەری دیـارە

ئـــەو شـــەوق ژ بـــۆ تـــە ڕا زەبانـــە
ئـــەڤ پێهـــت ژ بـــۆ م ڕا زیانـــە
پێهتـــا ژ دلـــێ مـــە دایـــی ســـەر ســـەر
حـــوکمی دکـــەتن ل بـــایێ صەرصـــەر
هـــەر چەنـــد ب شـــەڤ دمینـــی بیـــدار
صـــوبحان دنڤـــی حـــەتا ڤـــە ئێڤـــار
ئێڤـــار و ســـەحەر ب ڕۆژ ئەگـــەر شـــەڤ
ئـــەز هـــەر دســـوژم وســـا ل ســـەر هـــەڤ
گەهـــ گاهـــ ژ دەســـت دلـــێ برینـــدار
ناچـــار دبـــوو ژ جـــانی بێـــزار

## بولبوليا زينتيه د گەل پەروانەێ
## پەروانييا وتيه د گەل ديوانەێ

پەروا نەدكر ب ئاتەشێ غەم

پەروانە دكر ژ بۆ خوە هەمدەم

كەی طائرێ ئاشيانێ فرقەت

وەی بولبولێ بۆستانێ حرقەت

ئەی حوججەتێ عاشقێ د صائب

وەی موبطلێ موددەعيێ كاذب

مەردانە دبەخشی جانی ئەرزان

حەيفا كو ب مەڕ كرانی لەرزان

ناوەستی دەمەك ل بەر هەوایێ

ناپوختە طەلەب دكەی فەنایێ

ئەو لەز ژ تە ڕا گەلەك قوصوورە

ئەو لەرزە ژ بۆ تە ڕا فتوورە

بێ صەبری و بێ سوكوون و بێ تاب

لەورا خوە دكەی ب زوويی پورتاب

ناپوختەیێ عەيبەكە تەمامە

مەطبووخ دبێژنێ كو خامە

پوختـــه دســوژن مەگــەر چــو جــاران
فـــانی قـــه دبـــن ب نـــوور و نـــاران
بـــاقی دگـــەڕن وەکـــی ســـەمەندەر
وان جســـم دبیتـــه جـــانێ ئـــەنوەر
یـــەک ذەرره ژ ئاســـمان و عـــەردان
نـــەدما کـــو نەکـــەت د گـــەل خەبـــەردان
وێ جســـم مونـــەووەرا مەلـــەک رووح
بەیضـــا قەمـــەرا موقابەلـــەت یـــووح
ژ ئـــەڤ ئـــادەمییێ د صـــاحب ئـــەغراض
مەحضـــا دکـــر ئحتـــراز و ئعـــراض
فکـــرا خـــوه دکـــر ژ ئـــنس و جانـــان
ســـرا خـــوه دگۆتـــه بـــێ زبانـــان
ســـەر تـــا ب قـــەدەم غـــەریقێ غـــەم بـــوو
نەقشـــێ دل و جـــان خیـــالێ مـــەم بـــوو

## مەجنوونییا مەمێیە ژ عشقا لەیلایێ
## وامقییا وییە ژ دەردێ عەذارێ

مەم ژی ژ خەیالێ ڕوویێ دلدار
یەعنی کو ژ ئارەزوویێ دیدار

بوو دینەکێ دلپەذیر و سەودا
مەجنوونەکێ بێ نەظیر و شەیدا

غالب گەڕییا ل عەقلی دەهشەت
موئنس گەڕییا ل قەلبی وەحشەت

نە قابلێ حەملێ داغ و دەردان
نە نائلێ سەیر و باغێ وەردان

حاصل کو نەبوو وصالێ زینێ
راحەت چو نەبوو ژ بەر برینێ

لەورا کو دو تەشنەلەب د بێ گاڤ
بێ تاب ببن ژ بۆ فڕەک ئاڤ

ناگەه ببڕژت ژ ئاسمانی
سەرچەشمەئێ ئابێ زندەگانی

یەک تەشنە مورادێ دل هەلینت
یەک سووختە هەر وسا بمینت

یەک کسبێ بکەت حەیاتێ سەرمەد
ئێ دی دچتە مەماتێ مومتەد
تاجدین کو ئەو وصال دەست دا
ئەو ڕەنگ ل مەمێ مەلال دەست دا
ئەصلا ژ غەمان نەبوو مواسا
مەحضا ب کسان نەبوو مودارا
قەطعا وی نەبوو ل جهـ قەرارەک
ئەصلا وی نەبوو ب کەس مەدارەک
ئەو وەقتێ وەکوو دچوویە پێش میر
تە دگۆ کو دوساغە پێ د زنجیر
هەر لەحظە ژ دەرد و ئاهـ و واهێ
ئاگر دگهاندە بارەگاهێ
گاڤا کو دچوویە پێشی تاجدین
ئەو ژارە د گەل دلێ ب نالین
نەدشێ بکەتن مەدار و صوحبەت
نەدبوو بگرت قەرار و ئولفەت
ناچار ژ هێشەتێ دچوو دوور
هەمدەرد دبوو د گەل شەطێ کوور

## موخاطـەبەیا مەمێیە د گەل شەطێ جزیرێ
## موحاوەبەیا ژ عشقا بێ نەظیرێ

کــای شــوبهەتی ئەشــکێ مــن رەوانــە
بـــێ صـــەبر و ســـوکوونێ عاشـــقانە
بـــێ صـــەبر و قـــەرار و بـــێ ســـوکوونی
یـــان شـــوبهەتی مـــن تـــو ژی جونـــوونی
قـــەط نینـــە ژ بـــۆ تـــە ڕا قـــەرارەک
غالـــب د دلـــێ تـــە دانـــە یـــارەک
هـــەر لەحظـــە تـــە ژێ چ تێتـــە بیـــرێ
سەرگەشـــتە دبـــەی ل ڕەخ جزیـــرێ
ئـەڤ شـەهرەیە گـەر ژ بـۆ تـە مـەحبووب
حاصـــل گەرِیایـــە بـــۆ تـــە مـــەطلـــووب
دائـــم د دلـــێ تـــە دایـــە مـــەنزل
دەســـتێ تـــە ل گـــەردەنێ حـــەمائل
هێـــژا ژ خـــودێ تـــو فکـــرێ ناکـــەی
هـــەر ڕۆژ هـــەزار شـــوکرێ ناکـــەی
ئـــەڤ چەنـــدە دکـــەی هـــەوار و گـــازی
ئێـــدی چ مـــورادەکێ دخـــوازی

بێهـووده چـڕا دکـەی تــو فـەریاد

ئــاواره دچـــی دیــاریٚ بەغــداد

گــەر ئــەز بگــریم و گــەر بنــالم

وەر ئــەز بمــرم و گــەر بکــالم

هــەرچی وەکــوو ئــەز بکم رەوایــە

مـــەعقوول ژ بـــۆ م ڕا فەنایـــە

جــارەک ل دلـــێ م ژی گــوذەر کــە

سەرچەشمەئێ چەشمێ مـن نـەظـەر کـە

دەردێ دلـــێ مـــن کـــو بـــێ دەوایـــە

چەشـــمێ تـــەڕێ مـــن چ ماجەرایـــە

دیوانەمـــە مـــن پـــەری ب دەردا

ئـــەز دجلەمـــە زەنبـــەری مـــە بـــەردا

وەســـطانی و نێرگـــزی و ســـەقلان

دەروازه و عوممـــــەری و مەیـــــدان

ڤـان سـەیرگەهان تـو لـێ دکـەی گەشت

ئـەز مامـە ژ بـۆ مـراد روو دەشـت

## مەباحثییا مەمێ د گەل بایی
## هەوادارییا د گەل هەوایی

گەهـ بـەحث دکـر د گـەل صـەبایی
شـەرحا غـەمێ دل دگۆتـە بـایی
کـای جسمێ لـەطیفێ شـوبهەتی رووح
دەرگـاهێ بـەدەن ل بـەر تـە مـەفتووح
ئـەز هیڤـی دکـەم کـو بـێ تـەوەققوف
رەنجیـدە قـەدەم ب بـێ تەکـەللوف
جـارەک هـەرە (سـدة السـعادت)
گاڤـەک هـەرە (سـدرة النهایـت)
ئـەووەل تـو ببۆسـە ئاسـتانێ
پاشـی هـەرە پێشـی دلسـتانێ
ئـەمما ب تەواضـع و ب تـەعظیم
سـەد مەرتەبـە ئحتـرام و تـەکریم
ئاهسـتە ژ بـۆ بکـە دوعـایێ
دابسـتەنێ وێ بکـە ثـەنـایێ
شایسـتە بکـە تـو ئحترامـێ
دەست بەسـتە ڤەوەسـت بکـە سـەلامێ

پاشـی حەرەکـەت کـە پێشـڤە چاپـک
ثقلـەت نـەکری ل طـەبعـێ نـازک
ئـەڤ نامـە کـو خـوونێ دل مـدادە
ئـەو صـەفحە کـو مەردومـەک سـەوادە
پـەردێ مـەلڤین ژ بـەر جـەمالێ
تـەنها بـدە دەسـتی عەرضـحالێ
زنهـار! دبانـەکی نقـابێ
گاڤـا کـو دخـوێنتن کتـابێ
بێـژێ ژ مـە ڕا کـو پادشـاهم
(بنـدەنن آکاسـویلە) قبلـەگاهم
لەو مـەطلـەعێ نـوورێ (ذو الجلال)ی
لـەو مەنبـەعێ کەوثـەرا زەلالـی
لـەو مەنظـەرێ مـەظهـەرا ئیلاهـی
ئـەم بـۆ تـە گـەدا تـو پادشـاهی
دا بـۆ مـە ب حـەققی موتتەصـف بـی
دەر حـەققێ مـە عـەدل و مونتەصـف بـی
دەر دیـدە ژ دیـدەئێ تـەوەللا
گەهـ گـاهی بکـەی ل دل تەجـەللا
ئـەو دەئبـێ قەدیمـە پادشـاهان
وان عامـە نـەظـەر ل پورگوناهـان
وەللاهـ گونـەهێ خـوە ئـەز نـزانم
ئـەمما مـە دلـەک هـەبوو دزانـم

ئـــەو دل پـــەريیان ژ مـــن ڕەڤايـــە
ئـــەڤ پێلەکـــە ئـــەو ژ مـــن جودايـــە
وەقتـــێ کـــو د گـــەل مـــن ئـــەو تـــەبابوو
صـــاحب هـــەوەس و خـــودان هـــەوا بـــوو
بەلکـــە کربـــت خـــەطـــا و عصـــيان
ئنســـان خولقينـــە ب نـــەقص و نســـيان
ســـەد جـــار کـــو زێـــدە پـــوڕ گوناهـــە
لـــێ ســـايەئێ زولفـــێ تـــە پەناهـــە
گـــەر قـــەهرێ بکـــەی ل وی جەزايـــە
وەر عـــەفوێ بکـــەی عەجـــەب عـــەطايـــە
ئـــەڤ ڕەنگـــە ببێـــژە ئـــەی صـــەبا تيـــز
(وانگـــاه زمـــين ببـــوس و برخيـــز)
ئـــەی بـــادێ صـــەبا ب حـــەققێ مـــەعبوود
گاڤـــا وەکـــوو تێـــی ژ پێشـــی مەقصـــوود
زنهـــار! هنـــەک ژ خـــاکێ دەرگاهـــ
بينـــە ژ مـــە ڕا د گـــەل خـــوە هەمراهـــ
تـــۆزا کـــو ژ ڕەنگـــێ تووتيايـــە
بينـــە ب خـــوە ڕا کـــو کيميايـــە

## موجادەلەیا مەمێیە ب دلێ کول ڕا
## موحارەبەیا پەروانەێ ب بولبول ڕا

گەهـ جـەنگ دکـر د گـەل دلـێ ژار:
کـای خـائنێ شەرمسـار و غـەددار
کان قـەول و قـەرار و عـەهد و پەیوەنـد
پـەیمان و قسـەم یـەمین و سـۆگەند
تـە دگـۆ کـو د گـەل تـە صـادقم ئـەز
تـە دگـۆ ب تـە ڕا مـوافقم ئـەز
تـە دگـۆ کـو د گـەل تـە یـەک دلـم ئـەز
تـە دگـۆ کـو خـودان تەحـەممولم ئـەز
حەیفـە کـو زیـادە بـێ وەفـایی
وەیـلا کـو نـە قـابلێ جـەفایی
قـەلبێ دەغـەلی ب دل نـە یـاری
پـوڕ چیـل و چـەپی خـەراب و خـواری
ئـەی طـووطییێ پـەروەرش شـرینی
وەی طفلـێ طوفـەیلێ نـازەنینی
یـارێ خوەشـیان بـوویی مەگـەر تـو
قەلسـێ ڕەشـیان بـوویی مەگـەر تـو

دلهـایێ کسـان دەروونـی تـەنها
ئنصـافە تـەنێ بهێلـی مـە تـەنها
ئـەڤ بولبـولێ جـان د مەحبسـا تـەن
مایـە ب تـەنێ مثـالێ بیـژەن
ئنصـافە بکـەی تـو جـانی بـدروود
دەروازەئـێ تـەن بگێـرِی مسـدوود
سـررا د تـە دا ژ فەیضـێ جانـە
نـوورا د زەمـین ژ ئاسـمانە
ئـەی دل مەچـە بـێ چراغـێ جـانی
ظولماتـە تـو کـوّرێ رِێ نـەزانی!
مەقصـوود ئەگـەر ژ بـوّ تـە جانـان
جانـان تـە د جـانی دانـە پونهـان
لـەورا تـو نموونـەدارێ ذاتـی
ئاینـەئێ صـوورەتێ صـفاتی
زنهـار! مەچـە ل دوو تـەوەلـلا
دا جـان نەکـەتن ژ تـە تەبـەررا
چوونـا تـە دبیتـە خارجییـەت
تـەرکا تـە دبیتـە رافضـییەت
خـارج مەبـە دا ببـی تـو داخـل
تـەرکێ مەکـە دا ببـی تـو واصـل
رەفضێ مەکـە تـو ب دل بـە سوننی
(ما بالـكَ ويحـكَ أنتَ مني؟!)

ثابت بـه کـو دا نـه ناخەلـەف بـی
دا واقفـێ سـرِرا (مـن عـرف) بـی
هەر چەند تو چوویی بەر دەرێ دۆست
لێ دۆست ل نک منە ل وی پۆست
قـەددا تـه حەبانـدی بـۆ تـه داره
زولفـا تـه چڤانـدی ئـەو قناره!
جـەذبا تـو رەڤـایی جـان ل بالـه
سـرِرا تـو فـدایی ئـەو خـوه مالـه
بـاوەر تـه نـەیـێ ل زولـف و خـالان
مـالی مـەده هنـدۆیان ب تـالان
پابەنـده مەبـه ب تـارێ گیسـۆ
سەرگەشـته مەبـه ب قەوسـێ ئـەبروو
هـەر چەنـد خـەلیلی ئـەی بەلاکـەش
گـولزار ل تـه دبیتـه ئاتـەش
تەشـبیهی تـه سـەد هـەزار بولبـول
سـەد جـار بکـەن فغـان و غولغـول
پەروانـه صـفەت ل پێشـی وەردان
هـەردەم دسـۆژم ب داغ و دەردان
ئـەی دل تـه خـوه دایـه بـەر هـەوایی
قەصـدا تـه ئـەوه بکـەی صـەفایی
ئـەمما ژ طـەبیبـێ عشـقێ صـادق
مـن زانیـه بـۆ تـه ڕا موافـق

پــەرهیز ژ قســمێ موشــتەهاتان
تەقوایــە ژ ڤـان مولــەذەذاتــان
هــەرچی کــو موخــالفێ هەوایــە
عــەینێ وی ژ بــۆ تــە ڕا شــفایە
مــن پوڕسیە بــێ گومــان ژ لوقمــان
خاصصــییەتێ شــەربەتان و لوقمــان
هــەرچی کــو شــرینە عــەینێ دایــە
هــەرچی وەکــوو طــەحلە ئــەو دەوایــە
ئــەو چەنــد ئــەوی د گــەل دلــی گــۆت
ناچــار دلـــێ دلـــی ب وی ســۆت
دووکـــەل ژ حـــەرارەتا ســـوەیدا
ڕابــوو تــژی بــوو مەحــەلل و ســەودا
ڕابووڤـــە ژ دل دوخـــان و یـــەحمووم
ڕەش کــر ل ســەری دەمــاغ و خەیشــووم
نــەینیکێ خــەیالێ بــوو موکــەددەر
ئایینــەئێ عــەقلی بــوو موغــەببــەر
عــەورەک تــە دگــۆ ژ ئەرضــی ڕابــوو
ئــەڤرازی ل ئاســمان جــەما بــوو
وی عــەوری ژ نیڤــەکا هناڤــان
خونبــاری دکــر ب هــەردو چاڤــان
ســەیلا جگــەرێ وســا ل گــوڕ هــات
گۆیــا کــو ب ســەر ئــەرەز ڤــە کــور هــات

(القصـــــه) ژ عللـــــەتا د دل دا
سـەیلەک وە دچـوو مـەمێ ب مـل دا
(شـط العـرب) و فـرات و جـەیحوون
هـەر سێ تـە دگۆ کـو پێکڤـە ڕابـوون
هـەر چەنـدە ژ هێسـترێ مـەمێ ژار
شین بـوون ل ڕەخێ شـەطـی سپیدار!
صـەحرا هـەمی بوونـە صـەحن و بوسـتان
سـاحل بوویـە گولشـەن و گولسـتان
وی بـێ دلـی هـەر ل وێ مـەکان گـرت
وی بولبـولی بـۆ خـوە ئاشـیان گـرت
ئـەو بولبـول ئەگـەر چ پـوڕ هـەوەس بـوو
زنـدانێ بـەدەن ل وی قەفـەس بـوو
ڤێکـڕا وەریـان ل وی پـەڕ و بـال
تێکـدا وەشـیان ژ وی خـەط و خـال
قـەددا وییـە شـوبهەتی صـەنوبەر
خـەم بـوو جڤیـا مشـالێ عەرعـەر
ڕوویـێ د وی گـەر چ هـەر د تـەڕ بـوون
مانەنـدێ خـوزامێ لێـک زەر بـوون
عـارض قـومی ل نـەینکێ ژەنـگ
ڕەونـەق چـو نـەما ل نەقشـێ ئـەرژەنگ
عشـقێ وە نـەخوەش کـر ئـەو بەلاکـەش
حـوببێ وە تەلـەس کـر ئـەو موشـەووەش

دێما وی نـەما چـو ئـاب و ڕەنگـەک
نوطقـا وی نـەما جـەواب و دەنگـەک
ژ ئەووەل ڤە ل رەخ شەطی نەخوەش کەت
چـل ڕۆژی تـەمامی شـوبهی لـەش کـەت
عـەقل و خـرەد و شـوعوورێ ئنسـان
حسـس و حەرەکـەت قـوایێ حـەیوان
قـەطعـا قـە نـەما ژ وان چـو ئاثـار
یـەک جـوزء ل نـک مـەمێ برینـدار

## چوونا میر زێدینه ب صەید و نێچیرێ
## ئازادییا مەم و زینە ژ قەید و زنجیرێ

صەییادێ شکارێ حوسنێ ئەخبار
کر بۆ مە کو سەرگوذەشت ئظهار

گۆ: ڕۆژەکە خوەش ب فەصل و ئەییام
دەورا فەلەکا فەنا سەرەنجام

مەششاطە صفەت جەهانە دێرین
تەزیین کربوو عەرووس ئایین

فەرراشێ قەضا ب صونعێ قودرەت
غەبرا کربوو مثالێ جەننەت

هەر یەک ژ نەوال و کۆهـ و دەشتان
رەهـ شوبهەتی گەوشەیێد بهشتان

هەر رەوضە ریاضێ خولدێ ئەکبەر
هەر چەشمە ژ عەینێ ئابێ کەوثەر

هەر کۆهـ ژ ڕەنگێ طووریێ مووسا
ژ ئەنوارێ تەجەللییێ تەییسا

هەر نەهرەک ژ ڕەنگێ ئەژدەها بوون
هەر سەبزە ب موعجزان عەصا بوون

هــــەر دار ژ فەیضـــــێ نەوبـــــەهاری

تێـــک شـــوعلە ددا ژ نـــووڕێ بـــاری

هــەر گــول ژ مثــالێ ئاتەشــێ طــوور

یەک مەشعەلێ بێ قوصووڕێ پوڕ نوور

هــەر مــورغ ســەحەر ب خــوە کەلیمــەک

هەر طــووطی و قــومری یــەک نەدیمــەک

هــەر نــەخلێ نــدا کونەنــدە هــەر گاهــ

تەشــبیهی شــەجەر دگــۆ: (أنــا اللــە)

خــەرگووش و غـــەزال و گــۆر و ئــاهوو

ئەڤ قــاز و قولنــگ و کــەبک و تــەیهوو

کەرکــەر د چــەرین ل کۆهـــ و دەشــتان

رەف رەف دفــڕین د نێـــڤ بهشـــتان

(القصـــــە) ب ئقتضـــــای زەمـــــانی

بــوو فورصــەتێ عــەیش و کامــەرانــی

فەصـــلا بگـــەڕن ل گەشـــت و ســـەیران

نێچیـــرێ بکـــەن ژ وەحـــش و طـــەیران

میــرێ کــو فەلــەک مــوطیعێ فــەرمان

گــۆ: صــوبحە نەبوویــە قــەومێ بوهتــان

ڕابەســـتی ســـلاح و گـــورز و شمشـــیر

(بالجملــە) د گــەل مــە بێنــە نێچیــر

حاضـــر نـــەبتن کەســـەک د صـــەیدێ

ئـــەو دێ بمـــرت د بەنـــد و قەیـــدێ

خـەلقێ کـو حـەتا ب صـوبحێ کـاذب
حاضـــر کربـــوون بســـاط و راتـــب
فـــەجرێ کـــو نەمایـــە وان عەلامـــەت
رابـــوو د وی شـــەهری دا قیامـــەت
میـــران ڤـــەکـــرن عوقـــاب و بـــازی
شـــێران دبـــرن پلنـــگ و تـــازی
دەررنـــــدە و ئـــــادەم و بـــــەهائم
فـــەردەک قـــە نـــەما د شـــەهری قـــائم
دام و دەد و ئـــــادەمی و حـــــەیوان
طفـــل و صـــەبی ئاشـــڤان و رەزڤـــان
(القصـــــە) قەبیلـــەیا رجـــالان
(فـي الجملـە) کسـەک نـەما د مـالان
بـــوو حەشـــرگەهەک ل صـــەیدگاهان
شـــەفقەت نـــەکرن ل بـــێ گوناهـــان
ئـــەو چەنـــد ژ وەحشـــیان دکوشـــتن
گۆیـــا کـــو ووحـــووش قـــەط نەهشـــتن
دەررنـــــدە و دەونـــــدە و پەرەنـــــدە
هـــن کوشـــتی دو گرتـــی هـــن فکەنـــدە
چـــاپوک حـــەرەکات و نـــەوجوانان
وان فـــارس و کـــورد و بەهلـــەوانان
دوررەنـــدە درانـــدبوون ب شـــێران
پەررنـــدە برانـــدبوون ب تیـــران

مـــەحبووب مثـــالێ شـــەهلەوەندان
مەركـەب عـەرەبان خـودان كەمەنـدان
چۆگـــان د دەســـت د گـــەل گۆپـــالان
هاڤێتنـــــە گەردەنێـــد غـــەزالان
ئـەو شـێرە سـوار و بـەبر و جـەنگی
خـــوونی كريـــوون بەلـــەك پلنگـــی
ئـەو چەنـد غـەزال ئـەوان كـرن صـەيد
ئـەو چەنـد پلنـگ ئـەوان كـرن قەيـد
ئێـدی نەدشـێن د گـەل خـوە بيـنن
بـەلكی نەدشـێن ژ جهـ هـەلينن
كوشـتی ژ خـوە ڕا بـرن فـەقيران
گرتـی ب خـوە ڕا بـرن ئـەميران

## داستانێ بوستانێ جەننەت نشانێ میرانە
## کو بوویە (مەجمەعولبەحرەینا) عشقا هەردو دلفگاران
## (مەطلەعوننەییرەینا) شەوقا حوسنا هەردو گولعوذاران

باغــەک وە هــەبوو ئــەمیر زەینــدین
بــاغێ ئرەمــێ دچــوو ب مــزگین
هــەر دەوحــە ژ وی و هــەر طویــوورەک
یــەک قەصــرە ژ جەننــەتێ و حــوورەک
بــۆ شوشــتنێ دەســت و پــێ و دهقــان
کەوثــەر گــەرپیا ســەبیلێ رضــوان
هەرمســەر ب مــەقامێ ســدرە ســەروەک
مانەنــدی فرشــتە هــەر تــەذەروەک
تەشــبیهی مــەمێ دلــێ صــەنەوبەر
ســەد پــارە جگــەر ژ عشــقێ عەرعــەر
نــارنج و تــورنجێ شــوبهی زینــێ
زەربوویــــە ژ عللــــەتا ئــــەڤینێ
ســێڤ و روطــەب و ئــەنارێ بوســتان
لێــڤ و ذەقــەن و ئــەنارێ پوســتان
شمشــاد و چنــار هەمقــەدەم بــوون
خوەش سایەوەر و عــەلی هــەم بــوون

زەررین قەدەحێ د مەستێ لەبریز
رەیحان و بنەفشە جوملە شەبخیز

مەجموعەئێ خەضرەوات و ئەزهار
شیرازەئێ سەلسەبیل و ئەنهار

صەحنا رەزی موجەلا کتابەک
هەر قەطعە و فەصلە فەصل و بابەک

گۆیا ب ئەدەب ئەدیبێ تەنجیم
سەرصەفحەئێ باغی شوبهی تەقویم

جەدوەل کریوو ب حەللێ سیماب
شەنگرف صفەت گولێ د سیراب

ئەطراف ژ سونبول و رەیاحین
ئەلوان ژ خوطوطێ سەبز و مشکین

هەر یەک دکرن بەیانێ ئەحکام
بەختێ سیەهـ و سفید ئەعلام

## رەهائیا زینێیە ژ قەیدا تەعەللوقا ئەغیاران
## تەنها و تەکەللوما ویێیە د گەل بەلگ و داران

ئـەو ئـاهوویێ صـەیدگاهێ وەحشـەت
ئـەو بـانوویێ بارگـاهێ ئولفـەت
سـەرکەللە غـەزالێ دەشـتێ دەردان
سەرگەشـتە نهـالێ بـاغ و وەردان
پابەسـتەئێ قەیـدێ عشـقێ خوونخـوار
صـەیدا کـو مـەمێ کـری برینـدار
دی شـەهر و مەحەللـە جوملـە خـالی
خـالی بوویـە کووچـە و حـەوالی
تـەنها و تـەهینـە بـاغ و بوسـتان
بـێ ئـنس و پەرینـە صـەحن و ئـەیوان
زانـی کـو زەمانـە بـێ ئەمانـە
گـۆ: ڕابـە دلـۆ! عەجـەب زەمانـە!
فورصـەت خوەشـە دا بچینـە سـەیران
دا سـەیر بکـەیـن ل وەحش و طـەیران
کـانێ قـە هـەبـن ژ وا مـە هەمـدەرد
لـەوا کـو ئـەڤ ئادەمینـە بـێ دەرد

طـەیـرەک مـە بهیسـتییە د باغـان
بـەختێ وی ڕەشـە ژ ڕەنگـێ زاغـان
لـێ ژار و ضـەعیـف و بـێ مەجالـە
ئاشـوفتەئێ ڕوویـێ وەردێ ئالـە
ڕۆژان دکـەتن فغـان و زاری
خوونـا خـوە دخـۆت شـەڤێ د تـاری
دائـم دکـەتن فغـان و غولغـول
هەڤـدەنگێ منـە ب نـاڤێ بولبـول
هەمـدەردەکی قەنجـە ئـەهلێ حالـە
دەرمانـەکێ دەردێ مـن ل بالـە
ئـەی دل وەرە دا بچـین نهـانی
هێـژا کـو هەیـە مـە زنـدەگانی
بەلکـە ب نەصـیحەت و ب پەنـدێ
ئـازا مـە بکـەت ژ قەیـد و بەنـدێ
ئـەڤ ڕەنگەهـە گـۆت و بـێ تـەوەققوف
زیـن هاتـە ڤـی بـاغی بـێ تەکـەللوف
ئاگاهـ نـەبوون ژ وێ چـو دەییـار
نـە دایـە نـە خـادم و پەرسـتار
مەقصـوود ئـەوێ نـە عشـرەتەک بـوو
وێ مـەحض مـورادێ عزلەتـەک بـوو
لـەو هاتـە ڤـی بـاغی ئـەو پـەریزاد
دا تێـر بکـەت ژ دەسـت غـەمان داد

هــەر لالــە ل ســینە بوونــە داغــەک
هــەر غونچــە ب ســوهتنێ چراغــەک
هــەر دار ل جســمی بوونــە بــارەک
گولنــار ل قــەلبی بوونــە نــارەک
تـەنها کـو خـوە دی بـەرەک د دەس بـوو
ئـەو سـەنگ زەبانـەئێ جـەرەس بـوو
دەم دەم وە ددا ل دەففــێ مەرمــەر
بـێ شـوبهە دلـێ بـەران دبـوو کـەر
گاڤـا کـو نـەظـەر دکـر ل ئاڤـان
خوونــاب دچــوو ژ هــەردو چاڤــان
صــەحنا ڕویـی بـوو هـەوایێ بولبـول
شــاداب دکـــر ب ئــابێ گولگـــول
قــەددا کـــو ب ڕاســتی صــەنەوبەر
دێمــا ب ضــیایێ مهــرێ ئــەنوەر
ئــەو ڕەنــگ ددا ل ئــاخ و عــەردێ
ئــەو چەنــد دســوو د تــۆز و گــەردێ
ئــاخێ دکــر ئــاخ و بــەر دنــالین!
داران دکــر ئاهــ و بــەلگ دکــالین!
هــەردەم کـو دکـر ژ دەرد (یــا هــوو)
مرئــات و فەلــەک دکـــر سیەهـــ ڕوو
پــەژموردەکرن ب ڕەنگـــێ ســۆرگول
ئەفســـوردەکرن ب دەنگـــێ بولبـــول

بولبـــول نەدشـــێ ببینـــە هەڤـــدەنگ

ســـۆرگول نەدشـــێن ببینـــە هـــەڤڕەنگ

هنـدی كـو د بـاغی دا نـەظـــەر كـر

بـەحتا خـوە د گـەل گـولێ د زەر كـر

كـــای شــوبهەتی عاشـــقان دگـــەرگوون

وەی شـــوبهەتی مـــن ژ زێــڕ و زەرگـــوون

بـــەرگێ د وە ســـەد نـــەوا هـــەزارن

هـــوون بـــۆ چ زەرن ضـــەعیـــف و ژارن؟

یـان شوبهەتی مـن د بـێ مـەمن هوون؟

لـەورا وەكـوو مـن د پـوڕ غـەمن هـوون!

بولبـــول ب گـــولێ د ســـۆرە مەشـــغوول

هـوون مایینـە شـوبهێ مـن د مـەعزوول

لـــــەورا د عـــــەلیل و دەردنــــاكن

لــــەورا د حـــەزین و ســـینە چـــاكن

هـــوون قـــەنج ژ بـــۆ مـــە ڕا دەلـــیلن

هـــوون بـــۆ مـــە د حـــالی دا عـــەدیلن

خوشـكەک مـە هـەبوو ژ ڕەنگـێ سـۆرگول

هلگرتییـــــە وێ ژ بـــۆ خـــوە بولبـــول

هـــا هشـــتییە بـــۆ مـــە عەندەلیبـــەک

مـــەحرووم و ســـەفیل و بـــێ نەصـــیبەک

ئـــەز ژی ژ ذەلیـــل و بـــێ نەصـــیبی

زەر بوومـــــە ژ هـــــەجرێ عەنـــــدەلیبی

دێمـــا منـــە ســـۆرە ئەرغـــەوانی

زەر بوویـــە وەکـــی وە زەعفـــەرانی

جـارەک بـدیا مـن ئـەو ب دلخواهـ

ئێـدی نـەدکر مـن ئاهـ بیللاهـ!

## تەقاضایێ داعیێن دیدارێ دلدار
## و مولاقاتە ژ بۆ مەمێ ژار
## ژ جنابێ (واهب المرام) و (قاضي الحاجات)

هەرچی بیتن ژ خەیر ئەگەر شەر
بێ داعیە نابتن مویەسسەر
گەر وەصلەء و گەر قوماش و دیدار
بێ داعیە نابتن چو بازار
ئەو داعیە جوملە ئەهلێ حالن
بەلکی ژ جەنابێ (ذو الجلال)ن
قەلبێ تە دبێژتن کو ڕابە
ئەڤ ساعەتە عەینی فەتحێ بابە
ئەو کۆهـ و وەقار و بەحرێ مەوزوون
عشقێ کربوو خەفیف و مەجنوون
یەعنی کو مەمێ مەریض و بەدحال
ضەعفێ کربوو زیادە پامال
ڕۆژا کو ژ شەهری خەلـ بدەرکەت
سەودایێ خیالێ زین ب سەرکەت
بیمارێ ب دەردێ عشقێ سەکران
بێ نەضجێ مەرەض گهشتە بوحران

بــوو قەلقەلەیــەک د قــەلبێ غــەمگین
ئەصـــلا نـــەدبوو د خـــانی تەســـکین
ناچـــار ژ خـــانی ئـــەو بدەرکـــەت
ئـــەو داعیـــە خضـــر بـــوو ب بەرکـــەت
ئـــەو خضـــر چ بـــوو؟ تەشـــەووقا دل
ئـــەو شـــەوق چ بـــوو؟ تەعششـــوقا دل
قـــەلبێ وی د گـــەل وی بوویـــە بـــاغی
کێشـــان و کەشـــان گهانـــدە بـــاغی
زینـــا کـــو شـــەڤێ د ڕەش د تـــاری
هـــەردەم ب فغـــان و ئاهـــ و زاری
دائـــم ژ خـــودێ دکـــر تەمـــەننا
مـــەم ڕابـــت و بێتـــە نـــک ب تـــەنها
ناگەهـــ فکـــری کـــو مـــەم ژ دەرهـــات
بیمـــارێ مەســـیح دی ب ســـەرهات
زینـــێ ژ ئـــەڤین و شـــادمانی
(فـــي الحـــال) نـــەما چـــو زنـــدەگانی
بێ هش کەتـە سـەر چیمـەن وەکـی گـول
سـەد پـارە جەگـەر ژ عشـقێ بولبـول
مـــەم هـــات و تەفـــەرروجا گـــولان کـــر
ســـەیرەک ل رحـــان و ســـونبولان کـــر
گـــۆ: ئـــەی گـــول ئەگـــەر تـــو نـــازەنینی
کـــەنگی تـــو ژ ڕەنگـــێ ڕوویـــێ زینـــی

ئەی سونبول ئەگەر هەیی تو خوەش بوو
رەیحان ژ تە بووینە سیەهـ رِوو
هوون نە ژ مثالێ زولفێ یارن
هوون هەردو فوضوول و هەرزەکارن
ئەی بولبول ئەگەر تو ئەهلێ حالی
پەروانەئێ شەمعێ وەردێ ئالی
زینا مە ژ جەوچەما تە گەشتر
بەختێ مە ژ طالعێ تە رِەشتر
بولبول ئەزم ئەی نیکوو سەرەنجام
بیهوودە چرِا دکەی خوە بەدنام
گول یەک نە تەنێ کو سەد هەزاران
گولشەن ددتن د نەوبەهاران
مەعشووقە کو مثلی وان گەلەک بن
هەر چەند کو حووری و مەلەک بن
ئەو نابنە مووجبێ چو دەردان
لەورا کو هەبن ل جوملە عەردان
یەک بیت و نەبت مثال و هەمتا
مەستوورە ژ رِەنگێ زین و عەنقا
عاشق ب چ دێ بکەت مدارە
بێ صەبر و مرن ئەوی چ چارە
ئەڤ رِەنگە دگۆ ژ حالێ غافل
ناگەهـ فکری کو پێش موقابل

زینــا کــو دوســەد پــەری پەرســتار
حــوورا کــو مــەمۆ ژ بــۆ گرفتــار
وێ ســەبزە صــفەت ل ســەر زەمینــێ
بــێ هــش کــری داروێ ئــەڤینێ
زینــا کــو شــەبیهی دوررێ مــەکنوون
(فــي الحــال) کــو دی مــەمێ جەگــەرخوون
بێ هــش کەتــە بــەر پییــان و بــێ گــاڤ
ســەروێ کــو گەهشــتە بــەر پییــان ئــاڤ
غونچــە ژ خــەوا ســەحەر ڤــە بشــکوفت
وێ بــوویی ب بولبــولێ خــوە ڕا جوفــت
گــۆ: ئــەڤ خەونــە یــان ئــەڤ خیالــە
ئــەڤ خەونــە صــەحیحە یــا بــەطالــە؟
حاصــل کــو ژ پاشــی ســەد خیــالان
خاصــییەتێ بــوویی زولــف و خــالان
زینــێ کــو گهانــدە بــەر مشــامێ
صــەیدێ مــری زەنــدە کــر ب دامــێ
ڕابــوو کــو ل پێشــی دەســتێ زینــێ
فکــری کــو دو دەســت د دەســتێ زینــێ
مــان هــەردو گەلــەک ل پێشــی یــەک لال
نــە نوطــق و خەبــەر نــە قیــل و نــە قــال
ئــەووەل دکــرن ب دەســت ئشــارەت
پاشــی کــو ڤــەبوو ل وان عبــارەت

ئــەو چەنــد کــەلام پێکڤــە گــۆتن
ئــەو چەنــد ژ پێشــی پێکڤــە ســۆتن

ئـەو چەنـد قـەدەح ب یـەک ڤـە رێـتن
ئــەو چەنــد لێڤــێ د یــەک دمێــتن

ئـەو چەنـد شـەکەر ب یـەک ڤـە خـوارن
ئــەو چەنــد قــەضــا ژ نــوو بــژارن

چەشم و لـەب و سینە گـەردەن و دووش
روخســـار و ذقــەن بــەر و بنــاگووش

یـەک یـەک ب دلـی ژ یـەک دخوەستن
هـــن بۆســـە ددان و هـــن دگەســـتن

ئـەو تەشنەلەبێد ژ وەصلێ یـەک تێهن
گـــەردەن دکـــرن ل یێـــک و دو بـــێهن

زینــا کـــو ب روخ مشــالێ شــەمعان
پــوڕ شـەوق و ضیاء و نـوور و لـەمعان

پەروانــە صــفەت مــەمێ ب ظــاهر
جســـمێ خـــوە و جـــان ددانـــە ئـــاگر

گەهـــ گـــەش دبـــوو ئـــاگرێ ئـــەڤینێ
پەروانـــە دمـــا ژ بـــوویی زینـــێ

هـــەردو د وی حـــالی دا عـــەیانی
بـــێ پـــەردە ســـەرا و بـــێ نـــوانی

وان دیـــت د بـــاغی دا ســـەرایەک
ئاییـــنەێ جـــەم جـــەهان نومایـــەک

ڕابـــوون و مـشـــينه شەهنشـــينان
ڕوونشـــــتن و هـــــەردو نازەنينـــــان
هجـــران دكـــرن ژ ســـەر شـــكايەت
وجـــدان دكـــرن ژ نـــوور و ئايـــەت
دەم ئـــەبر صـــفەت حـــەزين و گريـــان
گەهـ غونچـه مەثـەل لـەطـيـف و خەنـدان
هـــەردەم دكـــرن قـــەضـــا و ســـوننەت
فەرضـــا وەكـــوو بۆســـەنە چ مننـــەت!
هـەر چەنـد كـو رەفـع بـوون تەكـەللوف
لـــێكن ئەڤشـــان دبـــوون تەصـــەرروف
ئـەو گـەر چ هـەبوون ژ هـەڤ ب هيڤـى
ئـــەمما نـــەدچوون قـــەوى نشـــيڤى!
حوبـــا د دلان ژ حـــەددى دەربـــوو
ســەرحەددێ ظـــەرافـــەتان كەمـــەر بـــوو
عشـــقا كـــو ژ ســـەرحەدى كەمالـــە
ئاڤـــا كـــو ژ مەنبـــەعێ زەلالـــە
ئەلبەتتـــە خـــوەيـــێ بكـــەت حراســـەت
ناكـــەت چـــو قـــەبووليا نەجاســـەت
جـــوانى و بهـــار و بـــاغ و مـــەحبووب
ئايـــا د دنـــێ چ مايـــه مـــەطلـــووب؟
خاســـما هـــەبتن ئـــەڤينى غالـــب
لـــەب تەشـــنەئێ عشـــقێ هـــەردو جانـــب

ئێدی چ ببێژم ئەز نزانم؟
(بلمز کە نە سویلیە زبانم)

## ئەگەڕیانا میرێ میرانە ژ شکارێ
## ب سەرخوەشیا مەمێ و زینا د عەینیبیا دیدارێ
## ب نێچیرێ وانە ژ سەردا هاتنا میرێ میرانە د وەقتێ ئێڤارێ

ساقی مە بگر کو ئەز ب دەستم
مەخموورم وێ مەی نەخوارێ مستم

گاڤا کو ڤەخوار مەمێ و زینێ
ئاخفت ل من جهێ برینێ

ئەم عاشق ئەگەر چ مەیپەرەستن
ئەمما ژ مەیا ئەلەستێ مستن

ئەو مەی نە وەکی مەیا تە ئالە
ئەو مەی ژ جەمالێ (ذو الجلال)ە

ئەو حوببێ حەبیبێ پاک ذاتە
قونوانێ حەدیقەئێ صفاتە

ساقی بدە من ژ بۆ خودێ ڕا
جامەک ژ مەیا تە دوهـ دگێڕا

هەر جورعەیەکێ ئە ژێ بکەم تام
یەک تەشنە بەسە حەتا سەرەنجام

ئەو کەیفەکە مەحضە بێ کەم و کەیف
ئەسرارەکە بێ خەیال و بێ طەیف

دا دەفع بکـم خومـارێ دووشـین

هشـیار بـبم ژ خـوابێ نووشـین

دا شـوبهی مـەمێ نـەبت کـو غافـل

بێت میرێ ئەجەل ب سەر مە عاجل

ڕۆژا منـە عـومرێ چوویـە ئێڤـار

هێـژا نـەبووم ئـەز ژ خـوە خەبـەردار

زینـا هەوەسـا دلـێ هـەوایی

مـن دانییـە ناڤـە خـۆ عـەبایی

میـر هـات ل سـەر وی هندی عسکەر

زورنـا و نـەفیر و کـووس و مـەیتـەر

دادایـی ل طـەبـل و خـان و سـازان

چـاویش و صـەدا و گازەگـازان

پابەنـد ب عشـقێ هـەردو جـەیران

دەرمانـدە ژ پـێش یەکڤـە حـەیران

قـەط سەف نـەکرن کـو ئـەڤ چ ڕەنگـە

قـەط گوهـ نـەکرن کـو ئـەڤ چ دەنگـە

میـر گـۆ کـو ڤەکـەن ئـەڤان غـەزالان

پابەنـد مەکـەن ئـەوان شـەپالان

تێـک بەردەنـە باغی وان وەکـی طـەیر

دا ئـەم بکـەریـن هـەرۆ ل وان سـەیر

خـەلقێ کـو غـەزال و گـوور و خـەرگووش

خوەش گرتـی ل سـەر مـل و دەرئـاغووش

ئـانین هـەمی میـر تـژی د ڕەز کـر
ئـاغول کـو شـڤان تـژی ژ پـەز کـر
میـر گۆتـە ئـەکابر و خەواصـان
تەنبیـە بکـەن نـەدیم و ناسـان
دا چـین و دەمـەک د بـاغی ڕوونـین
لـەورا کـو ژ ڕەحتیـان زەبـوونین
ئـەو هاتنـە دەر سـەرایێ عـالی
دیـتن دەر و بـان هـەمی د خـالی
ئـەمما کـو دەریچـە تێـک گوشـادن
ڕەنـگ قورعـەئێ تەختـەئێ مـورادن
حاضـر کەتـە قـەلبێ وی خیالـەک
زانـی کـو نـە خالییـە ژ حالـەک
میـرێ ب وەقـار و عـەقل و فەرهـەنگ
تاجدین و بـەکر خوە دانـە بـەر چـەنگ
ئینانـە سـەرا کـو زیـن و مـەم تـێ
گوهـ دانـە صـەدا کـو زیـر و بـەم تـێ
میـر هات و ب سـەر ڤـە دی مـەمێ ژار
پالدائیـە بالگـەئێ د زەرتـار
کێشـایە سـەرێ خـوە وی عەبایـەک
ئێڤـار و نـە شـەمع و نـە چرایـەک
میـر گـۆ: کییـە ئـەڤ د ڤـی زەمـانی
بـێ روخصـەتێ مـن د ڤـی مـەکانی؟

زینێ کو بهیست دەنگ ناسی

(في الحال) خوە دایە بن لباسی

مەم قەط ژ جهێ خوە ڕانەبوو گۆت:

صەیدا تە ل من دل و جەگەر سۆت

میرم تە دزانی ئەز نەخوەش بووم

حەتتا ڤە دوهی قەوی نەهەش بووم

ئیرۆ مە بهیست کو خەل د گەل میر

تێکدا ب تەبایی چوونە نێچیر

صەبرا مە نەما د ناڤ نڤینان

ڕابوومە د گەل ئەڤان برینان

ناچار بدەرکەتم ژ خانی

ناگەهـ مە خوە دی ل ڤی مەکانی

میر گۆ: نەخوەشان نەهن ژ بۆ قەید

باری تە د باغی دا چ کر صەید

گۆ: ئەز کوو ببێم بکە تو باوەر

داوەر ب م ڕا کو بوویە یاوەر

من دی د ڤی باغی دا غەزالەک

ئەمما کو غەزال نەبوو شەپالەک

ئاهوویە سپی و چاڤ د ڕەش بوون

بسکێن د سیاهـ و بهن د خوەش بوون

هەر لەحظە ژ نافەئێ تەتاری

سەد بار ژ طوررەیان دباری

صـەحرایێ خوتـەن تـژی بـتن مسـک
یەک طـایێ ژ زولفێ وێ و یەک بسـک

هـەر چەنـدە سپی و چاڤ بەلـەک بـوو
ئـەمما ب قیاسـێ مـن مەلـەک بـوو

لـەورا کـو تـو هـاتی ئـەو نهان بـوو
هنـدی تـو نـەهاتی ئـەو عـەیان بـوو

تاجـدین ژ تەکـەللوما وی زانـی
زیـن هاتییـە بـا مـەمێ نهـانی

گـۆ: گوهـ مەدنـە مـەمێ کـو دینـە
مالخۆلییـە وی عـەقل چـو نینـە!

ئعـراض کـرن ژ وی کـەلامی
ئـەعیان هـەمی ڤێـک کـەتن تـەمامی

سـاقی و شـەراب و شـەمع خوەسـتن
دیوانەکـە حاکمانـە بەسـتن

## ڕابوونا تاجدینه ژ دیوانێ د وێ دەمێ دا
## سوهتنا ملکانه د ڕێیا مەمێ دا

تاجــدین فکــری کــو بــەزم بۆشــە
پــوڕ ذەوق و صــەفا و عــەیش نۆشــە

مــەم زێــدە ب غوصــە و مەلالــە
چــوو بــال ڤــە گــۆ: بــرا چ حالــە؟

ئــەمما ب ئشــارەت و موعــەمما
پورســی و مــەمێ ب ڕەمــز و ئیمــا

دەســتێ خــوە ژ هــۆچکێ عــەبایی
کێشــا و عەجائبــەک نومــایی

دیــتن دو کــەزی ژ مســکێ تاتــار
مانەنــدێ دو ســەر ب مــەهرە شــەهمار

گەردایــە د پاشــلا مــەمێ دا
مــەم مایــە د هەیبــەت و غــەمێ دا

زانــی کــو قــەوی خەرابــە ئــەحوال
ڕابــوو ب لــەز و بــەزی و چــوو مــال

ناگەهــ ب غــەضــەب کــو چــوو ژ دەردا
زانــی ســتییێ د گــەل خەبــەر دا

گۆتێ: تە چ حالە ئەی تەهەمتەن
تەعجیل چییە؟ کییە تە دوشمەن

گۆ: ڕابە ستی کو مەن دەرەنگە
ئیرۆ مە د گەل ڤێ مالێ جەنگە

طفلێ خوە خەلاص کە دێ بچت مال
مال بۆ مەن و ها ژ بۆ تە مندال

سەرمایەێ عومرێ زندەگانی
یەعنی مەم و زین ب دل گرانی

مایینە د وەرطەیا بەلایێ
مەن قەصدە کو ئەز بکەم رەهایێ

خەل ڤەدکوژت ئاگری ب ئاڤێ
ئەز دێ ڤەکوژم ب ئاگر ئاڤێ

مالا خوە ژ ڕەنگێ قەومێ زەردەشت
دا ئاگر و گازییا خوە ڕاهشت

ئاگر کو دگرتە خان و مانان
وی گرتە ب گازی و فغانان

ئەقوام و قەبائل و عشائر
(بالجملە) بەزینە دەفعێ ئاگر

ئاگاهـ کو بوون ئەمیر و غلمان
خالی کرن ئەو سەرا و بوستان

ئەو ژی کو بەزینە وێ هەوارێ
وی موتتەهەمی وە گۆتە یارێ:

تاجدینی تە دی چ ڕەنگ ئەدا کر
مووسا ل مە بەحرێ غەم زوا کر
ڕابە تو هەڕە حەرەمسەرایێ
دا ئەز چمە ئاگر و ندایێ
زین ڕابوو وە چوویە خەلوەتا خاص
تاجدینی نەما نە جل نە پالاس
ئەسباب و تەجەممول و دەفینە
ئەملاک و جەواهر و خەزینە
جوملە د ڕیا برایی سۆتن
لەو ناف ب قەنجی تێتە گۆتن
مالی مەحەبین تو ئەی نکوونام
حوبیا وی دکەت مرۆڤی بەدنام
زنهار! تو مەبە ل مالی حارث
لەورا کو دبەن ژ دەست تە وارث
جەمعا وی ژ بۆ تە بارێ زەحمەت
تەرکا وی ژ بۆ تە نارێ حسرەت
ڕۆژا بچی پێش دەستێ باری
دەستێ تە ژ گەنج و مالی عاری
ئەڤ جەننەت و ئەڤ قوماشێ دیدار
ئەی موفلسێ ئاخرەت خەریدار
کەنگی ژ تە ڕا دبن مویەسسەر
دێ بێنە تە: مفلسۆ! هەڕە دەر!

رەهــ شــوبهەتی ڤــێ جــەهانێ فــانی
مفــت نــادەن تــە پاریــەک ژ نــانی
مــالی مــەدە وارثــان تــو مــەجان
گــەر دێ تــە بڤــێ هســاییا جــان
هێــژا کــو خوەشــی تەلــەف بکــە مــال
(بالجملــە) بــدە ب حوســنێ ئــەعمال
وارث ژ تــــەر ڕا کەفــــەن بــــەهایی
حــــەتا نــــەکرن ددەی هســــایی
یــان صــەرف بکــە مثــالێ تاجــدین
پــێ نــاڤێ ئەبــەد ژ بــۆ خــوە بســتین
یــان پــێ بکــرە تــو یــارەکێ قــەنج
ئــەو چێتــرە بــۆ تــە ڕا ژ ســەد گــەنج

## ئاگاهییا میرە ل عشقبازی و یارییا مەم و زینان ب ئەفشا و ئالقاییا نەیاران و موذەبذەبینان

سـولطانێ ولایـەتێ مەحەبـەت
سـەرخەیلێ ئەیالـەتێ مـەوەددەت
گاڤـا کـو ژ مەکمـەنێ خولووصـی
بنمیـت ل تـەختێ دل جولووسـی
کـەنگی دکـەتن قـەبوولێ ئەسـتار
حـەتتا عەلـەما خـوە ناکـەت ئظهـار
رەهـ شـوبهەتی پادشـاهێ ئـەنجوم
تابەنـدە ژ طـارەمێ چهـاروم
ژ ئـەو چەنـد طـەبـەقاتێ ئاسمانی
ژ ئـەو چەنـد مەسـافە و مـەکانی
ژ ئـەو چەنـد عەناصـر و سـەحابان
ژ ئـەو چەنـد مـەوانع و حجابـان
ناچـار دکـەت نوفـووذێ هـەر رووز
ئەلبەتتـە دبیتـە عالـەم ئـەفرووز
ئـەڤ پادشـەهێ کـو عشـق نامـە
ڕۆژێ ب وی نسـبەتەک تەمامـە

ئـەڤ ژێ قـە ڤەناشـرت چـو جـاران
ناچــار بكــەر دكــەت ســتاران

رازێ د دلـــێ مـــەمێ و زینـــێ
ســازێ كــو د پــەردەیا ئــەڤینێ

هنـــدی نەگەهشـــتبوو زەبانـــان
نەدبوويـــە زيـــان ژ بـــۆ خودانـــان

مضـــرابێ زەبـــانێ خـــەلقێ ناســـاز
بـــێ پـــەردە كـــو بـــوو تەرانـــە پـــەرداز

زينـــێ نـــە گونەهــ مـــەمێ نـــە ســووچەك
ئاگاهـــ كـــرن بـــوزورك و كووچـــەك

زەنگـــل ب دەڤـــا گهـــان ڤـــە زەنگـــوول
مـــەفتوولێ ئـــەنامـلان ژ مـــەرغوول

عوششـــاق حـــەزين و بـــێ نـــەوا بـــوون
خـــەل تەشـــنە حوســـەينێ كەربـــەلا بـــوون

مـــەجلس ب نـــەوایێ زیـــر و بـــەم بـــوون
مـــەملوء ژ هـــەوایێ زیـــن و مـــەم بـــوون

بـــاری ل جـــەمازەئێ نـــە بـــەس بـــوو
غـــەممازێ د مەرتـــەبا جـــەرەس بـــوو

یـــەعنی خەبـــەرێ د هـــەردو یـــاران
نـــەممام و حەســـوود و حیلـــەكاران

ئـــەو چەنـــد د مەجلســـان گەرانـــدن
ئـــەو چەنـــد ب قومصـــیان گهانـــدن

حەتتا بەکرێ ژ ڕەنگێ ئبلیس
صاحب غەرەضێ خەبیث و تەلبیس
ئەو ژی ژ وی حالی بوو خەبەردار
ڕابوو ژ جهێ خوە ئەو غەرەضدار
تەنها خوە گهاندە خەلوەتا میر
(القصە) کر ئەو قەضییە تەقریر
میر هاتە تەهەوورا ب غیرەت
بوو غەرقەیێ بەحرێ فکر و حیرەت
پورسی ژ ئەوێ خەبیثێ سالووس
گۆ: ئەڤ خەبەرا خلافێ نامووس
ئەم دێ کۆ حەقیقەتێ عەیان کەین
سەررشتەیێ توهمەتێ بەیان کەین؟
گۆ: ئەمری بکە مەمێ بخوونن
هوون هەردو د خەلوەتێ کو ڕوونن
مەم عاشقێ صادقە بزان قەنج
ڤێرا بلەییزە تو ب سەطرەنج
شەرطێ خوە ژ وی بخوازە دلخواز
دێ کەشف بیت حەقیقەتا راز
گاڤا کو ئەوی دکەی تو مەغلووب
بێ: ڕاست بێ کییە تە مەطلووب؟
مەم فهرس و بەطل و سینە صافە
خاسما ب تە ڕا خو بێ خلافە

حوبــا د دلــێ خــوه ناکــەت ئنکــار

ســررا خــوە دکــەت ژ بــۆ تــە ئقــرار

ثابــــت قەدەمــــە د ڤــــێ ئــــەڤینێ

دێ بێــــت کــــو عاشــــقم ل زینــــێ

پاشــــی تــــویی صــــاحبێ ریاســــەت

لائــــق وی ببــــین چییــــە سیاســــەت

حوککــــام ژ جنســــێ شــــاهمارن

ئەصــــحابێ ســــوموم ومــــوهرەدارن

مــــوهران کــــو ددەن بــــزان کــــو زەهــــرە

مهــرێ کــو دکــن بــزان کــو قــەهرە[1]

عاقــــل حــــەذەرێ دکــــەن ژ مــــاران

غافــــل دبنــــە موحــــب و یــــاران

هــەر چەنــد ل نــک ب عــزز و نــازی

هــەر چەنــد د گــەل ب لــەعب و بــازی

جــــوزئی ببــــتن ژ تــــە تەغــــەییور

کــــوللی دکــــەتن ژ تــــە تــــەدەببور

خاســما کــو هــەبن خــەبیث و خــەنناس

بــەدخواهێ بــەخیل بــن (مــنَ النــاس)

تــــەحقیق خــــەرابترن ژ شــــەیطان

یــــا رەب مەکــــە وان قــــەریبێ ســــولطان

---

(١) د دانەیەکێ دا ئەڤ مالکە ل شوینێ هاتییە:

مهران کو دکەن بزان کو ڕۆژە      قەهران کو دکەن جهان دسۆژە

## سەطرەنج بازیيا مەمێ و میرە ب شەرطێ دلخواز
## ئەدانا دامێ تەزویرە ژ بۆ کەشفێ راز

سـالارێ مـەواکب و کـەواکب
سـەردارێ طـەوالـع و غـەوارب
سـولطانێ سـەریرێ چـەرخێ رابـع
وەقتـێ وەکـوو بـوو ژ شـەرقێ طـالع
شەطرەنجی و ماهـ و جونـد و ئەختـەر
(بالجملـە) ل سـەر بسـاطێ ئەخضـەر
شـەهمات کـرن ب بەنـدەقا نـوور
تـە دگـۆ هـەمی بـوون د تـۆرێ مەستوور
میـرێ کـو ژ غیرەتـێ دل ئـەفگار
شـێرێ ژ حەمییـەتێ برینـدار
حـەتتا سـوبە خـەو نەهاتـە چاڤـان
ساکن نـەدبوو ژ ڕەنگـێ ئاڤـان
ڕۆژێ کـو ژ مەشـرقێ نومـا نـوور
ئافـاق کـرن ژ ظولمـەتێ دوور
میـر ڕابـوو و هاتـە شەهنشـینێ
نێزیکـی سـەرایێ نـازەنینێ

ڕوونشـــت و وه گۆتـــه پیشـــەکاران:

هـــوون گـــازی بکـــن نـــەدیم و یـــاران

تـــەنها ژ م ڕا مـــەمێ بخـــوونن

تاجـــدینی د گـــەل بـــران مـــەخوونن

ئیـــرۆ ل مـــەمێ ئـــەز دێ غـــەضـــەب کـــەم

سووچەک وی هەیـە ئـەز وی ئـەدەب کـەم

نابـــت کـــو ژ مـــن بـــبن د غافـــل

(بالجملـــه) ب ئـــەمرێ مـــن د عامـــل

ژ ئـەو پاشی شـهانده نـک مـەمێ خوەنـد

حاضـــر کربـــوون گـــولاب و گولقەنـــد

ئـــەو چەنـــد شـــەراب و قەنـــد و شـــەککەر

ئـــەو چەنـــد گـــولاب و مســـک و عەنبـــەر

ئینـــــان و د مەجلســـــێ گەڕانـــــدن

کـــەیفێ د خـــوه ســـەر ب ســـەر گهانـــدن

ئـــــەنجام و تەکـــــەللوم و خەبـــــەردان

کێشـــا کـــو ب ســـاطرەنج ونـــەردان

میـــر گۆتـــه مـــەمێ ب کـــین و کەربـــه:

ئیـــرۆ مـــه د گـــەل تـــه جـــەنگ و حەربـــه

ڕابـــــه ژ مـــــه ڕا وەره موقابـــــل

بـــێ شـــەک ب تـــه ڕا ئـــەزم موجـــادل

شـەرطێ مـه د گـەل تـه ئـەی سـەرئەفراز

هـــەرچی تـــه د ڤـــێ ژ بـــۆ مـــه دلخـــواز

لـێ میـر ژ کـوڕان هـەبوو جوانـەک
مـــەحبووبێ زەمانـــە نوکتەدانـــەک
یووســف ژ مەلاحــەتا وی مــەحجووب
روســتەم ژ شــەجاعەتا وی مــەغلووب
هـەم صـوحبەت و هەمـدەمێ مـەمێ بـوو
هەمشــاهی و هەمغــەمێ مــەمێ بــوو
ســەرداریێ کــوڕان ب نــاڤێ گــورگین
(فــي الحـال)ی خەبـەر گهانـدە تاجـدین
ئـەو بـەطـل کـو بـوو ژ حـالی واقـف
ڕابـــوون ب وی ڕا چـــەکۆ و عـــارف
شـێران ڤەڕسـاندە قەیـد و زنجیـر
هـەر سێ ب تـەبایی چوونـە نـک میر
تاجـدین کـو د گـەل بـران ب مـەش هـات
کەعبـەین ژ بـۆ مـەمێ دوشـەش هـات
فیــل و روخ و کەرکــەدەن کــو هــاتن
دیـن میـر و موعــەللمێ خـوە مــاتن
زانـــین کـــو مـــەمۆ ب بەنـــد و بـــازە
میــر گۆتــە مــەمێ کــو دەســتێ تــازە
ســێ دەســت ژ میــر بــرن تــەمامی
موفســـد فکـــری ژ وی مـــەقامی
زیـــن دی کـــو ل پەنجـــەرێ دیـــارە
مهـرە ل مـــەهێ دکـــەت نـــەظـــارە

بـــەدخواهی ببـــین چ حیلـــە ڕاکـــر
ئــەڤ ڕەنگــە بەهانەیــەک ئــەدا کــر

گـــۆ: بەنـــد و لـــەییز و جهـــ ب دۆرن
هـوون هـەردو جهـان ب هـەڤ بگـۆڕن

مـەم دێ ببـتن ڤـێ جـارێ مـەغلووب
حاصـــل ببـتن ژ بـۆ تــە مـەطلـووب

میـر ڕابـوو و چـوو جهـێ مـەمێ ژار
مـەم هاتـە جهـێ ژ پێشـڤە دلـدار

چـاڤێ د مـەمێ کـو دیـن روخـێ زیـن
مفت دانە ژ دەست خوە فیـل و فـەرزین

دل مایـــە ل پەنجـــەر و شـــباکان
هسـپێ خـوە ددا ل ب جهـ پـەیاکان

میـر بـر ژ مـەمێ تـەمام شـەش دەست
مـەم بـوو ژ مـەیا ژ پێشـڤە سەرمەست

میـر گۆتـە مـەمێ: مـە بـر خوە دلخـواز
وی گـۆ کـو ببـێ چیـە تـە داخـواز؟

میـر گۆ: مـە غـەرەض نـە کسبێ مالـە
مەقصـوود ژ طـەییـێ کشـفێ حالـە

مـەطلـووب ژ لـەعب و بەنـد و بـازان
قـەط نینـە ب غـەیری کشـفێ رازان

شـەرطێ مـن ئـەوە بکـەی تـو ئقـرار
کـانێ د دنـێ کییـە تـە دلـدار

هـــەرچی پـــەریيا تـــە دل ل بالـــە
حـــووری صـــفەتە مەلـــەک مثالـــە
گـــەر لائقـــی تـــە ئـــەوێ ببيـــنم
مـــالی بـدەم ئـەز ژ بـۆ تـە بيـنم
صـاحب غـەرەضـی د وەقتـێ فورصـەت
طـەعنا خوە ژ ڕەنگێ دەفعێ توهمەت
گـۆ: مـن دیيـە يـا مـەمێ حەبانـدی
کیـــژەک عەرەبانـــە لێـــڤ دەقانـــدی
سـەر تـا ب پییـان ڕەشـە وەکـی قیـر
نــە لائقــی بــەحث و خوەســتنا میــر!
طـەعنێ د مـەمێ وە ڕەنـگ ئـەثـەر کر
یـەک جـار ژ عـەقلی بـێ خەبـەر کـر
بـەحرا دلـێ پـەردە لـێ ب جـووش هـات
ناکـــام ب گـــازی و خـــورووش هـــات
گـــۆ: قـــەط نەوەيـــە وەکـــی وی گـــۆتی
میـــرم پـــەریيا دلـــێ م ســـۆتی
شـــەهزادەیە شەهنشـــین مەکانـــە
عەنقايـــــە بلنـــــدە ئاشـــــیانە
میرانییـــە ئـــەو ژ نســـلێ پاکـــە
نوورانییـــە ئـــەو نـــە ئـــاب و خاکـــە
ســـەردەفتەرێ حـــوور و نازەنینـــە
هـــەر چەنـــد مەلـــەک ب نـــاڤێ زینـــە

میـر ئـەڤ خەبـەرێ خلافـێ هەیـەت
گاڤـا کـو بهیسـت هاتـە غیـرەت
وی گۆتـە قەبیلـەیا غولامـان:
هـوون بـۆچی گـەلی نەمـەک حـەرامان
ڤـی ناکسـی نـاگرن ب ذللـەت
دا ئـەز بکـوژم ئـەوی ب عبـرەت
ڕابوونـە مـەمێ دو سـەد غـەضـەنفـەر
مـەم ڕابوویـە پـێ د دەسـتی خەنجـەر
تاجـدین و چـەکۆ د گـەل برایـی
ڕابـوون ب تەعەصـوب و تـەبایی
گـۆتن: گـەلی جونـدیان ڤەوەسـتن
هـوون جوملـە نسـەرخوەش و نەمەسـتن
هـوون قـەنج دزانـن ئـەم کوسـانن
صـاحب هونـەرین و پەهلـەوانن
پانسـەد ژ وە حەملـە کـەن ب کـەربان
نادەینـە وە نەوبـەتا چـو ضـەربـان
گـەر چ وە ئەجـەل ب دەسـت مـە نینـە
ئـەمما وە گەلـەک ژ دەسـت مـە دینـە
حـەتتا کـو بکـەن مـەمێ گرفتـار
سـێ سـەد ژ وە دێ بـبن برینـدار
حـەتتا نـە مـە هـەر سییان بکەرکـەن
هـوون دێ ل مـەمێ کوسا نـەظـەرکـەن؟

هـەرچى كـرى حـاكمێ مـە فـەرمان
ئـەم نابنـە مـانعێ چـو حوكمـان
دەسـتێ د مـە بەسـتنە ل بـەر ميـر
هـا گـەردەن و دەسـت و پـێ و زنجيـر
مير ڕابوو و دەست و پێ مەمێ بەست
تاجدين مرنـا خـوە وى دەمـى خوەسـت
ئـەمما چ بكـەت ژ بـۆ نـە عـارە
جـەللاد نـە ميـرە خونـدكارە
مـەم گـرت و شـهاندە پێش سـەرهەنگ
گـۆ: حـەبس بكـن د قوللـەيا تـەنگ
هلگـرتن و برنـە پێشـى دوزدار
مـەحبووس كـرن د قوللـەيا تـار
ديـوانى و مەجلسـى بـەلاف بـوون
(بالجملـە) ژ بـۆ مـەمێ د مـەحزوون
ديوانـە صـفەت ب ئاهـ و فـەرياد
هـەميان دكـرن ژ بـۆ مـەمێ داد

## خولووصییەت و خەلاصییا مەمێیە
## د خەلوەتا زندانێ دا ژ صفاتێ د حەیوانی
## موشارەکەت و موشاکەلەتا وییە ب ئەخلاقێ د رووحانی

مەهـــرا فەلـــەکێ ئـــەزەل عەدیمـــە
کینـــا فەلـــەکێ ئەبـــەد قەدیمـــە
هـەرچی وەکـوو ئـەو ژ عـەردێ ڕاکـەت
ئەلبەتتـــە وی دێ د عـــەردێ ڕا کـــەت
عولـــوی ژ خـــوە ڕا عـــەیان دخـــوازت
ســـوفلی ژ مـــە ڕا نهـــان دخـــوازت
نـــابینی هـــەڕۆ کـــو ئافتـــابێ
داڤێتـــــە مـــــەغارەیا تـــــورابێ
خاســـما کـــو د گـــەل قـــەبیلێ عاشـــق
هـــەم خـــائن و خـــارە هـــەم مونـــافق
ئەلبەتتـــە دلـــێ مـــە عشـــقبازان
ئـــەوول دبـــەتـــن ب غـــونج و نـــازان
ئـــاخر دکـــەتن مـــەلوول و مـــەئیووس
مانەنـدی مـــەمێ ذەلیـــل و مـــەحبووس
داڤێژتـــــە مەحبســـــێ ب ناکـــــام
داتیننتـــــە مەرقـــــەدێ ســـــەرەنجام

ئـەو بەختڕەشـێ لەقـەب ل وی مـەم

بـێ هەمنەفـەس و هـەڤال و هەمـدەم

هاڤێتنـــە چالـــەکێ ب زاری

تەشـبیهی ب گـۆڕێ تـەنگ و تـاری

مەکرووهـ وەکـی دەهـانێ ئـەژدەر

مـەنکـوور وەکـی نـەکیر و مونکـەر

ڕوونشـــت د وێ ڤـــە عابدانـــە

زنـــدان ل وی بوویـــە چللەخانـــە

ئـەو جهـ ل وی بوویـە چـاهێ نەخشـەب

ئـەو مەهـ گـەڕییا هلالـێ یەکشـەب

صـووفی کـو گـەهشـتە کـونجێ خـەلوەت

شـەیخینی گهانـد مـەقامێ وەحـدەت

گەهـ شـوبهەتی عاشـقان ب دلخـواز

گەهـ شـوبهەتی عابـدان ب داخـواز

هـەر لەحظـە د گـەل کـەلا گرینـێ

ئـەڤ ڕەنگـە دگۆتـە نـازەنینێ:

کـای مثلـێ حـەرارەتا غـەریزی

ئیرۆهـە د مصـرێ دل عـەزیزی

سـەد جـار هـەرۆ ل قـەلبێ غـەمناک

پیراهـەنێ صـەبرێ مـن تـە کـر چـاک

گەهـ گەهـ چ دبـت وەکـی زولـەیخا

پوڕسـا م بکـەی تـو ئـەی شـەکەرخا

لـەیلا تـویی ئـەز ژ بـۆ تـە مـەجنوون
گولگـوون ژ تـە ڕا سرشـکێ پوڕخـوون

فـەرهادم ئـەز و تـو بـۆ م شـیرین
سـەیلاب سرشـکێ جـوویێ شـیرین

دونیـا ل مـە گـەر چ بوویـە زنـدان
ئیرۆهـە تـەنێ ئـەزم موسـلمان!

لـەورا ژ دەڤـێ نـەبیێ مورسـەل
بـوو ئـەڤ خەبـەرە صـەحیح و مورسـەل:

دونیـا کـو بەحشـتێ کافرانـە
مـەئوایێ بـەلایێ موئمنانـە

هـەر چەنـدە قـەوی موشەووەشـم ئـەز
ئـەو چەنـد ب موشەووەشـی خوەشـم ئـەز

سـەد سـال بگێـڕی مـن تـو مـەحبووس
مـا ئـەز قـە دبـم ژ وەصـلێ مـەئیووس

سـووندێ دخـوم ئـەز ب سـوورەئێ نـوور
دیمـا کـو ئـەوە کتـابێ مسـطوور

دەهـ جـار ب حـەققێ بـەژن و بـالێ
چـل جـار ب حـەققێ زولـف و خـالێ

تـەحقیق ب ئافتـابێ روخسـار
تەصـدیق ب ماهتـابێ دیـدار

تەئکیـد ب قبلـەگاهێ ئـەبروو
تـەعظیم ب سـەجدەگاهێ گیسـوو

سەد جار قسەم ب هەردو نوونان
عەهدا من ئەوە د گەل عویوونان

حەتتا رەمەقەک هەبت ژ جانی
جانا! تو د جانی دا نهانی

هندی کو ژ هەجرێ بێ قەرارم
ئەو چەند ژ تە ئومێدوارم

هەر چەند کو میر ل من غەضەب کر
ئەڤ قەهرە ل من ژ بێ سەبەب کر

هەر چەند خەبەرێ بەکر وی گوهـ کر
ئەڤ جەبرە ئەوی ل من ب جهـ کر

لەورا کو تو شاهی ئەز گەدا بووم
ئەز بۆ تە نە کوفو و هەم لقا بووم

تو مهر جەمال و مەهـ جەبینی
ئەڤ چەندە لەطیف و نازەنینی

ئەز خار و ذەلیل و خاکسارم
ئەڤ ڕەنگە ضەعیف و دلفگارم

پەروانەمە تەن مە دایە ئاگر
سوهتیمە ب باطن و ب ظاهر

نیلووفەرە دل تو ئافتابی
تەن شوبهی کتان تو ماهتابی

گەر تەن برزت وە یا بیت خەرق
وەر دل ببتن د بەحرێ غەم غەرق

حـەققێ منـە عەدلـە ظـولم نینـە
خاصـیيەتێ ئـاگرێ ئەڤینـە

ئـەڤ چالـە ئەگـەر چ زێـدە کـوورە
ئـەمما ژ عەدالـەتێ نـە دوورە

صـوفیمە و صـەومەعە نشـینم
خـوەش طـالبێ نـوورێ ڕوویـێ زیـنم

حاصـل قـەومی مـەقامێ (موتـوا)
بـەر مـووجبێ (قبـل أن تموتـوا)

تەزکییـەئێ نەفسـێ بـوو موکەمـەل
تەصـفییەئێ قـەلبی بـوو موحەصـەل

ئاییـنـەئێ رووحـێ بـوو موجـەللا
نـەفس و دل و جـان ب هـەڤ موصـەففا

ئـەو موعتـەکفێ د دەورێ چـالێ
هێـژا نەگەهشـتی دەورێ سـالێ

بـەلکی نـە چـل و نـە ئەربەعینـەک
ظـەننـا د دلـێ وی بـوو یەقینـەک

مەشـهوود بـوویین ل قـەلبی ئـەنوار
مەکشـووف بـوویین ل بـەر وی ئەسـرار

ئاییـنـەئێ دل وە بـوو موصـەیقەل
صـوورەت وە ب مەعنـەیێ موبـەددەل

ئـەو هەیکـەلێ مـەطلـەبـا مـەجازی
بـوو مەلعـەبێ طفلـێ عشـقبازی

ئـەو مـومكن و (ماسـوا) سەراسـەر
(فـي الجملـه) ژ بۆ وی بوونـه مـەظهـەر

ئـەڤ دار و بـەر و دەواب و ئنسـان
ئـەڤ مەعـدەن و ئـەڤ نـەبات و حـەیوان

هـەرچی كـو ب دل وی لـێ نـەظـەر كـر
هـەرچی ب خیـال وی لـێ گـوذەر كـر

هـەر یـەك دنـەمـا ژ بـۆ وی زینـەك
مەشـهـوود ژ هـەر یـەكی یەقینـەك

گۆیـا ب خـوە ئـەو رەصـەد نشـین بـوو
ئـەو چـال ژ بـۆ وی دووربـین بـوو

## مەئیووسییا زینێیە ب سەبەب مەحبووسییا مەمێ
## مەئنووسییا وێیە ب غەم و دەرد و ئەلەمێ

زینا کو ب دەردێ هەجرێ غەمگین
بێ صەبر و سوکوون قەرار و تەمکین
هندی وەکوو مەم نەبوویی مەحبووس
هێژا نەدبوو ژ وەصلێ مەئیووس
گاڤا وەکوو مەم گهشتە چالێ
ئوممێد نەما ژ بۆ وصالێ
نەزهەتگەهـ و شەهنشین و ئەیوان
لێ بوونە حەصار و حەبس و زندان
هندی وەکوو شەربەت و طەعام بوون
گۆیا کو ل وێ هەمی حەرام بوون
جانی نەدکر چ خواب و راحەت
جسمی نە ددی چو تاب و طاقەت
ئەو ڕەنگ ضەعیف و ژار بووبوو
گۆیا کو ب جسمی تارێ موو بوو
ئەو موو گەریایی زەعفەرانی
تەشبیهی ب ڕەنگێ ڕوویێ خانی

شەب تا ب سەحەر سەحەر حەتا شەب
فارغ نەدبوو ژ ذكرێ: (یا رەب)
هەر لەحظە دگۆتە چەرخێ دەووار:
كای ظالمێ بێ ئەمان و خوونخوار
من قەصد و غەرەض د گەل تە نینە
ئایا تە د گەل من ئەڤ چ كینە؟!
دەورەک تە نەكر دەمەک ژ بۆ من
پڕ دی تە مەگەر مەمەک ژ بۆ من
نوورەک د رویێ مە كر تە پەیدا
سوهتن ل مەمێ تە پێ سوەیدا
شەوقەک د روخێ مەمێ تە هەل كر
قەلبێ مە ب وی تە سۆت و كول كر
ئایا تە چ مەصلەحەت د من دی
نیشانێ مە دا تە یێكێ جندی
ئەووەل تە كوسا ل من عەیان كر
پاشی تە چرا ل من نهان كر
سوهتم تە ب ئاگرێ فراقێ
كوشتم تە ب دەردێ ئشتیاقێ
عالەم هەمی پێكڤە شاد و خوررەم
داینە من و مەمێ تە مەئتەم
دەردێ خوە ژ بۆ م را ببێژە
ژەهرا د دلێ خوە دا بڕێژە

یووسـف تـه ل مــن شـهانده چـالێ
هیشـتم تــه د ڤــێ خەرابــه مــالێ
یــەعقووب صــفەت حــەزین و نــالان
صــەبرا دل و جـان تــه بــر ب تـالان
ئــەز ماییمــه هــەر وەکــی زولــەیخا
بــێ یووســف و بــێ مــوراد و مــەئوا
گەهــ شــەکوە دکــر ژ بــۆ مــەمێ ژار:
کــای یووســفێ بــێ گونەهــ گرفتــار
دا فکــرێ نــەکی کــو راحــەتم ئــەز
دا ظـــەن نـــەبری ب طاقـــەتم ئــەز
وەللاهـــی قســـەم دکــەم ب بــاری
ڕۆژێ د ســـپی شـــەڤێ د تـــاری
نیــنن ژ مــە ڕا چــو خــواب و خــوارن
ئــیللا کــو دو دیــده خــوون دبــارن
بیداریـــه صـــەنعەتێ دو چاڤـــان
خوونخواریـــه خوارنـــا هناڤـــان
ئــەی قبلــەئێ قــەلبێ مــن ب دلخواهـ
وەی کەعبــەئێ جــان ب (کعبــه اللــه)
هــەر لەحظــه ژ دەســتێ فرقــەتا تــه
هــەر وەقتــی ژ دەردێ حســرەتا تــه
ســەد ئاهـ و دوســەد ئــەنین و ئــەفغان
بــێ گــاڤ مــه تــێن ژ نیــڤ دل و جــان

ئەڤ ڕەنگەیە حالێ من شەب و رووز
حالێ تە کوسانە ئەی دل ئەفرووز؟
زندانییێ من! تە کی جەلیسە؟
سەودائییێ من! تە کی ئەنیسە؟
ئەی دل تو ژ قەلبێ من بدەرکەڤ!
وەی جان تو ژ بۆ دلی ب بەر کەڤ
هوون هەردو هەرن مەمێ ببینن
لێ یەک خەبەری ژ بۆ مە بینن
ئەی دل تو کو لێ دکەی سەلامێ
زوو بینەڤە بۆ م ڕا پەیامێ
کانێ ب چ حالە ئەو گرفتار
دانین چ خیالە ئەی دل ئەفگار
کانێ ل مە ئاشە یانە زیزە
باغێ وی بهارە یا پاییزە
خوەش ڕەنگ و لەطیفە شوبهی سۆرگول
یان ژار و ضەعیفە مثلێ بولبول
ئەیوان ل مە بوویە دارێ محنەت
زندان ب مە بوویە باغێ جەننەت
خوەزیا کو ل من غەضەب کرا میر
مانەندی مەمێ ب غلل و زنجیر
ئەز ژی بشهاندما وێ چالێ
ڕۆژەک ڤەکەتا ل من ژ سالێ

جارەک بدیا من ئەو گرفتار
دەرمان بکرا من ئەو بریندار

عومرێ من ئەگەر چ یەک رەمەق بوو
حەققا کو مرن ژ بۆ م حەق بوو

## تەصوورا تاجدینە ژ غیرەتا برایی
## مشوەرەتا د گەل برانە ل خەلاصییا بێ نەوایی

ئـــــەجزائێ کتـــــابێ عشـــــقبازی
صـــەححافێ موجەللـــەدێ مـــەجازی

شـیرازە و جـوزء و بەنـد و تـەرکیب
ئـەڤ ڕەنگـە کـرن ب نـەظـم و تـەرتیب

کـو زیـن و مـەمێ د نـاز و پـەروەرد
گاڤـــا وەهـــە دەرڤـــەبوون ل وان دەرد

ئـەو دەرد وەهـە بوویـە بـەحرێ ئاتـەش
ئـەو ئاتەشـێ غـەم وە بوویـە سـەرکەش

خـەلقێ کـو هـەبوو ژ عشـقێ تەشـویر
وی ئـــاگری کـــر ل وان وە تـــەئثیر

مـــەعلوول بـــوویین هـــەمی ب دەردان
یـــەکجار بدەرکـــەتن ژ پـــەردان

خاســـما کـــو مـــوافقێ د دێـــرین
هـەم صـوحبەتێ وان سـتی و تاجـدین

دەردان وە ل وان ژ نووڤـــە ســـەردان
ئێـــدی نەدهاتـــە ژێ خەبـــەردان

هەر چەند کو ئەو ژ ڤان جودا بوون
دیسان ب وی دەردی موبتەلا بوون
دەردێ ستیێ خیالێ زین بوو
تاجدین ژ غەما مەمێ وە دین بوو
هەر لەحظە د گەل بران ب شەڕ بوو
قەصدا د دلێ وی ئەڤ خەبەر بوو
ڕابت ب غەضەب بچیتە پێش میر
داخواز بکەت مەمێ ب تەقصیر
جارەک بچتن مەمێ رجا کەت
سووچ و گونەهێ مەمێ تکا کەت
دا میر ژ م ڕا برایی بەردت
یا ئەڤ سەر و مالی تێ بدەردت
عارف وەها گۆتە رۆستەمێ زال:
ئەڤ ئەمرە ب من مەحالە بێ قال
بێ جەنگ و جدال و بێ تەهەوور
قەط ڤی شوغولی مەکن تەصەوور
ئەڤ مەعرەکە نابتن ب دیوان
ئەم مانە و صوبحێ صەحنێ مەیدان
یا قەنج ئەوە ئەم سوبە سوار بن
هەر سێ ب سلاح و کار و بار بن
چارانە و جەوشەنان د بەرکەین
زەندانە و مەغفران ل سەر کەین

گـــورزان بهـــمژین رمـــان بیـــازین
ئـەڤ رەنگـە مـەمێ ژ میـر بخـوازین
یـا دێ ب کوتـەک مـەمێ خوە بـەردین
یـا جوملـە ب مـەردی سـەر ب دەردیـن
گـەر وی ب ڤـی رەنگـی مـەم رەها کـر
دەردێ د دلـــێ مـــە وی دەوا کـــر
وەر مـــایی موصـــر ل ســـەر عنـــادێ
ئـەم دێ بکـەریـن وە رەنـگ جهـادێ
ژ ئـەووەل ڤـە بچـین بـەکر ب کەرکـەیـن
وی مـــودبری ژێـــرە دەر ب دەرکـــەیـــن
هـەر بـەر دەرەکـی گـورەک ل بـەر بـت
خەصـمانەێ قـەنج سـەر ب سـەر بـت
میـر ئـەر ژ وی را بکـەت تەعەصـوب
رابـت ل مـە ئـەو بکـەت تەغـەللوب
ئاشـــێ ئەجـــەلێ وســـا بگێـــڕین
تەشـــبیهی حـــەبان ســـەران بهێـــرین
بوهتانـــە بکـــەینـــە رەقـــص و گۆڤەنـــد
دا بێنـــە تەماشـــەێ شـــەکەرخەند
گاڤـــا وەکـــوو دەســـت بدینـــە حـــەربان
مـــەحبووب تەماشـە کـەن ل ضـەربـان
هـــەر لەحظـــە ببێـــژن ئـــەو پـــەریزاد
دەســـتێ د وە ئـــەی جـــوان مـــەریزاد

هنـــدەک بگـــرین هنـــەک ئـــەنـــا کـــەن
هنـــدەک بکـــەنن هنـــەک دوعـــا کـــەن
دلـــدار نـــەظـــەر بکـــن ژ بورجـــان
دوڕدانـــە ب دەرکـــەڤن ژ دورجـــان
شـــەهزادە ژ پەنجـــەران نـــەظـــەر کـــەن
گـــول پیرەهـــەنان د بـــەر خـــوە کەرکـــەن
هـــەردەم ببهـــین ژ نازەنینـــان
ســـەد مـــەدح و هـــەزار ئافـــەرینان
تاجـــدین خەبـــەرا برایـــی گوهـــ کـــر
موحکـــەم د دلـــێ خـــوە دا ب جهـــ کـــر

## تەعەصصوب و تەدارەکا تاجدین و برانە ب ئەمرێ غیرەتێ سوارییا وانە ل هەسپێ حەمییەتێ

سەر صوبحە کو شەهسوارێ ئەفلەق
ئەشهەب کو کشاندە جایێ ئەبلەق
ئەدهەم د طەویلەئێ نەهین کر
ئەشهەب ژ خوە ڕا ژ نووڤە زین کر
گورزێ خوە یێ ئاتەشین دەرانی
تیغێ خوە یێ زەرفەشان کو دانی
دونیا ژ مەهابەتا خوە زەر کر
تیغ و کەمەرا چیان ب کەر کر
تاجدین و بران ژ خەلقێ لالی
خوەستن ب دلێ خوە وان حەلالی
کێشانە دەرێ ب رەقص و بازی
رەخشێ عەرەبی سەمەندێ تازی
مسمار کرن بەدەو ژ غەفلەت
هشیار کرن عەدوو ب صەولەت
مەیدان بەدەوان کولان ب دەستوور
گۆیا ڤەددان ل دوژمنان گوڕ

تاجـدین ژ تـەوابعێ خـوە یـەک پیـر
تـەعیین کـر و زوو شـهانده پـێش میـر
گـۆتێ: هـەرە بێـژە میـر و ئاغـان
بینەنــده ڤـــەناکوژن چراغــــان
میــرێ مـــە ئەگـــەر چ دووربینـــە
ئیـرۆ وی د چـــاڤی نـــوور نینـــە
ئـەم چـار بـرا هـەبوون د صـادق
هــەر چـار ل خدمـــەتا وی عاشــق
ئنصـــافە کـــو زێـــدەتر ژ ســـالێ
مـــەم مائیــە بـێ خــودان د چـالێ
دوژمــن ل مــە شانە دۆسـت غـەمگین
فەرضـــە مرنـــا چـــەکۆ و تاجـــدین
مــەم گــەر چ کــو زێــدە پـوڕ گوناهــە
لــێ عاشــقێ عشــقێ پادشــاهە
حــوکمی تـــو مەکـــە ل پادشـــاهان
ظـــولمێ تـــو مەکـــە ل بـێ گوناهــان
ئـەم هیڤـی دکـەین مـەمێ رهـا کـەت
دەردێ د دلـــێ مـــەمێ دەوا کـــەت
ئــەم چــار براینــە چــار دیـــوار
ئـەرکانێ سـەعادەتـا وی هـەر چـار
هـەر چـار سـەرێ د مـە وەکـی گـۆ
چـەوگـانێ ئرادەتـا وی کاشـۆ

یـا مەصـلەحەتێ ژ بـۆ مـە چـێ کـەت

یانـــە ژ مـــە ڕا بـــەکر ب ڕێ کـــەت

دا ئـــەم خەبـــەران ژ بـــۆ وی بێـــژن

دەردێ د خـــوە ئـــەم ل وی بڕێـــژن

ڕوومـــەت مـــە نـەما ل ڕوویـــێ عـــامێ

دێ نـــەقل بکـــەین بچینـــە شـــامێ

## تەدبیرا بەکرە ژ بۆ دەفعا مەظلەنەت و عنادێ
## تەزویرا وییە ژ ترسا فتنە و فسادێ

تــەقریر کــو کــر تــەمام قاصــد
واقــف گــەرییا ب حــالی حاســد

زانــی کــو ژ بــۆ وی ڕا خەرابــە
گــۆ: عــەفو ژ بــۆ مــەمێ صــەوابــە

میــرم مــە نــەگۆ ژ بــۆ تــە پێشــین
تاجــدین و بــران ژ خــوە مــە ئێشــین

زینــێ بــدە وان وە یــا بکــوژ مــن
یــان ئــەو ب تــە ڕانــە خەصــم و دوژمــن

یــا قــەنج ئــەوە قــەط نەکــەی تەکــەللوم
تاجــدین ژ تــە ناکــەتن تــەوەهوم

بێــژێ: مــە فــداکرن مــەم و زیــن
تــەزویج کــرن مــە دانــە تاجــدین

ظــاهر مەکــە تــو ئــەڤێ عنــادێ
جــارەک ڤــەکوژ ئــاگرێ فســادێ

ژ ئــەو پاش تــو بێخــە وەقتــێ فورصــەت
زنهــار! مــەدێ ئــەمان و موهلــەت

خەصمێ کو نەشێی ببی موقابل
دەرمان چیە؟ شەربەتا هەلاهل!
لەو لازمە حاکمان دو فنجان
یەک خاصێ خەرابە یێکە قەنجان
دا یەک نەخوەشان ژ بۆ وی خوەش کەت
یا دی ژ وی ڕا خوەشان نەخوەش کەت
یەک جانی ژ دوژمنان جودا کەت
یا دی مرییان ژ نووڤە ڕاکەت
کەربا خوە مەکە تو ئاشکارا
یا قەنج ئەوە ئەم بکەین مودارا
شۆلن هەنە ئەو ب کەربێ نابن
لەورا کو ب زۆر و ضەربێ نابن
ئوستادی دڤێتن و تەئەممول
ئخفاء و تەغافول و تەحەممول
ئەوقاتێ زەمانە گوونە گوونە
باری ژ مە ڕا کرن نەموونە
یەعنی شەڤ و ڕۆژ و صوبح و شامن
هن ڕۆهیننە هن ژ وان ظەلامن
ئەم ژی د لەیالی و نەهاران
دا بێن ب نهان و ئاشکاران
هن ظاهر و هندەکان ب خەف کەین
ڕاکن هنەکان هنان تەلەف کەین

وی مولحـدی شـیر وسـا سـەقا کـر
مصـری ژ خـوه ڕا وسـا بـەرا کـر
پەنـد و غەلـەط و خـلاف و پـالان
بەنـد و سـەقەط و غـلاف و کـالان
تەصـنیع کـرن وی هنـدە تەشـنیع
بەسـتن وی ل شـیری شوبهی تەرصـیع
ئـەو شـیر ل بـن سـەرێ خـوە دانـی
ئـەو ڕەنگـە ڤـەشـار کـو کـەس نـەزانی
میـرێ وەکـوو دل ب کـەربێ سـۆتی
هـەرچی کـو بـەکر ژ بـۆ وی گـۆتی
بـاوەر کـر و گۆتـە مـەردێ قاصـد
ئـەی پیـر مەکـە تـو فکـرێ فاسـد
گـەر فـەوت بکـەم جـەمیعی فەرضـان
تاجـدین کـو ددەم ژ دەسـت خـوە ئـەرزان
مـن شـەوکەت و سـەلطەنـەت ب وینـە
ئـەڤ شـوهرەت و شـاهی مـن ژ وینـە
ئـەڤ نـام و نشـان و ئـەڤ مەقامـە
بـێ خـاطرێ وی ل مـن حەرامـە
ئـەو ڕۆسـتەمە گێـوە لەندەهایـە
گەنجینەمـە ئـەز ئـەو ئەژدەهایـە
بێـژێ ب دلـێ خـوە مـن مـەم و زیـن
هـەردو ب حـەلالی دانـە تاجـدین

بێ وەجهـ ژ مـن تـو بـوویی وەحشـی
داخـواز تـە کـر کـۆ مـن نەبەخشـی؟
تاجـدین و چـەکۆ ب عـزز و نـازن
دێ هـەر وە بـتن وەکـی دخـوازن
قاصـد کـو رەوانـە بـوو ژ پـێش میـر
تـەقریر کـو کـر تـەمام تـەعبیر
شـێرێ دەلـەشـەر وە بـوون مـولایم
گـۆتن دەم و دەولـەتا وی دایـم

## نەصیحەتا صاحب غەرەضێ پڕ مەرەضێ دلکول
## ژ بۆ میرێ بێ تەمیزێ سادەدل

ئێڤــــاری کــــو ئاســــمانی مەنقـــەل
دانــــی و ل وان ڤەشــــار مەشــــعەل

یــەعنی کــو ڤەکوشــت چراغــێ زەرریــن
وەرگـــرت ژ نـــوو لباســـێ ڕەنگـــین

میــرێ کــو هەمیشــە شــاد و خــوررەم
گۆیــــا کــــەتبوو لباســــێ ماتــــەم

وی بەختــــەکێ ڕووســــیاهێ مــــەلعوون
گاڤــــا ئــــەوی دی ئــــەمیر مــــەحزوون

گـۆ: غـەم مـەخوە ئـەی چراغـێ دەولـەت
گـەر عـومر بـدەت ژ بـۆ مـە موهلـەت

ئـەڤ کـەرب و ئەلـەم ئەگـەر تـە نـاڤێ
زینــێ و مــەمێ ژ دل خــوە بــاڤێ

ئــــەو هەردونــــە بــــاعثێ فســــادێ
ئــەو بوونــە ســەبەب ژ بــۆ عنــادێ

گــەر ئــەذنێ بــدەت ژ بــۆ م ڕا میــر
ئــەز دێ بکــوژم مــەمێ ب تــەدبیر

تاجـدین و بـران ب شـەربەتەک زەهـر
تـو دشێیی دەمـەک ئـەوان بکـەی قـەهر
ئـەمرێ کـو دبـت تـەدارەک ئاسـان
ئاگەهـ مەکـە پـێ تـو خـەلق و ناسـان
میـرم تـو هـەرە بیێـژە زینـێ
مـەم سـوهتییە ئـاگرێ ئـەڤینێ
مـەم تەشـنە تـو ئـابێ زنـدگانی
مـەم مـوردە تـو جـانێ جـاودانی
بێـژە کـو هـەرە مـەمێ دەرینـە
مـن دائییـە تـە ژ بـۆ خـوە بینـە
مـن زانییـە مـەم زیـادە ژارە
پەروانەیـە مەقصـەدا وی نـارە
گاڤـا کـو نـەظـەر بکـەت ل زینـێ
تەحقیقـە کـو ناکـەتن چـو ژینـێ
(فـي الحـال) دەمـا کـو وێ ببینـت
بـاوەر مەکـە ئـەو ب رح بمینـت
مـەم گـەر ب ڤـی رەنگـی زوو فـەنا بـت
دێ کەشـمەکەش و نـزاع رابـت
میـرن هەنـە عـاقلن عـەزیزن
لـێ سـادە دلـن د بـێ تـەمیزن
ئـەو سـادە ژ بولهـ و ناتـەمامی
دل نادەنـە مەنشـەئا کـەلامی

وان دل گوهـــە گوهــ ب دل ڤـــە نینـــە
ڕەش چـــاڤن و مەردومـــەک ســـپینە
هـــەر چـــی کـــو دبێژنـــێ: غـــەرەضـــدار
بـــاوەر دکـــەن ئـــەو ب ڕاســـتی و خـــوار
نـــابێن ئەڤـــە قەنجـــە یـــا خەرابـــە
نـــابێن ئەڤـــە خـــەطئـــە یـــا صـــەوابە
قاصـــر نەظـــەرن د بـــێ تەئـــەممول
حاضـــر ب غـــەضـــەبـــن د بـــێ تەحـــەممول
ئەغلـــەب دبـــن ئـــەو ب عـــەقلی مـــەغروور
ئەکثـــــەر دکـــــەرن ژ دانشـــــێ دوور
بەدخواهـــــ و بـــــەخیل و بەدســـــوکالان
بەدئەصـــــل و سەفیهـــــ و بـــــەدفعالان
تیـــنن دکـــەنـــە ڕەفیـــق و ڕەهبـــەر
بـــەدنام دبـــن وەزیـــر و ســـەروەر
دســـپێرنە ڤـــان کســـان ئومـــووری
ئـــەو تێخنـــە دەولـــەتێ قوصـــووری
میرێـــد ب دەولـــەت و فەراســـەت
صـــاحب شـــەفەقەت خـــودان سیاســـەت
ئـــەو هـــەر کســـەکی خـــودان ناکـــەن
حـــەتتا وەکـــوو ئمتحـــان ناکـــەن
چـــل جـــار دکـــەن یـــەکی موجـــەرڕەب
پاشـــی ئـــەوی دێ بکـــەن موقـــەرڕەب

ئـــەڤ میـــر و وەزیریـــا جهـــانی
ئـــەڤ بـــەگی و گزیرییـــا زەمـــانی
هـــەردو ب مثـــالێ یـــەک لـــەییزن
هـــەردو د بـــەطـــال و بـــێ تـــەمیزن
حەتتا وەک بـەکر[1] نـەبی تـو ئەلحـەق
کـــەنگی دبییـــە وەزیـــرێ موطلـــەق؟!

(۱) ل شوینا (وەک بەکر) د دانەیەکێ دا (وەکو کەر) هاتییە!

## روخصەتدانا میرە ل دیتنا دلدارێ
## بێهشبوونا زینێیە ژ ذەوق و شەوقا دیدارێ

تـــەدبیر کونەنـــدە پیـــرێ عاقـــل
ئـەڤ ڕەنگەهـــە بـوٚ ژ بـوٚ مـــە ناقـل

گـــوٚ: میـــر ب موشـــاوەری و رایـــێ
وەقتـــێ وەکـــوو چـــوو حەرەمســـەرایێ

زیـــن گـــازی کـر و ل بـــا خـــوە دانـــی
ئـــەو پـــەردە ژ ســـەر ســـرێ هلانـــی

کـو بـێ دلییـا مـــەمێ مـــە بـــەس کـر
ئـــازوردەئێ مـــن ل وی عەبـــەس کـــر

جـــەور و ســـتەما کـــو مـــن ل وی کـــر
ئـــەو جـــەور تـــە کـر ستەم ئـــەوی کـــر

عشـــقا تـــە ژ وی عـــەقل ڕەڤـــابوو
شـــەیدا و جونـــوون و موبتـــەلا بـــوو

زانـــی ژ حەکیمـــەکی مـــە تـــەدبیر
دیوانـــە دەوا دبـــن ب زنجیـــر

لـەو مـن ب غـەضـەب شهاندە چالێ
ئـــەو حـــەبس ل وی گهانـــدە ســـالێ

دا عشـــق بکـــەت کـــەمالێ حاصـــل
حوببـــا وە نەکـــەت وصـــال باطـــل
(فـي الحـال) دەمـا ب قـەلب و جـانی
مقـــدارێ مـــەحەببـــەتێ وە زانـــی
هـــوون هـــەردو د مەرتـــەبا کـــەمالن
مـــــەقبوولن و قـــــابلێ وصـــــالن
مـــەم عاشـــقێ صـــادقە ب تـــەحقیق
قـەلبێ مـە دکـەت ژ بـۆ وی تەصـدیق
مـــــەئمموورە ب ئـــــەمرێ پادشـــــاهی
مەعـــذوورە ب عـــوذرێ بـــێ گونـــاهی
هـــەر چ کـــو ل وی بکـــەت عتـــابێ
ئەلبەتتـــــــە دبینـــــــتن عقـــــــابێ
حوســـنا تەیـــە ئـــەو کـــری گرفتـــار
حوببـــا تەیـــە ئـــەو کـــری برینـــدار
تیـــرا وی ل دل کـــەتی تـــە لێـــدا
ئـــەو داروێ بێهشـــی تـــە پێـــدا
ئـــەو ســـورمە د چـــاڤێ وی تـــە کێشـــا
حـــەتتا تـــو نـــەدی وی دل نەئێشـــا
زولفـــا تـــە ل دەســـت و پـــێ وی بەســـتی
عـــەقرەب صـــفەتا دلـــێ وی گەســـتی
طـــەوقـــا تـــە ل گـــەردەنا وی دانـــی
داڤـــا تـــە ڤـــەدا ل قـــەلب و جـــانی

چاوا ڤەکرن تە هەردو ئاهوو
بەردانە فەقیری هەردو جادوو
دیسان تو هەرە د گەل خەبەر دە
قەیدان تو ڤەکە ژ بۆ خوە بەردە
ئەی غونجەئێ ناشوکوفتە سۆرگول
بشکێن قەفەسێ دەرینە بولبول
ئەو تێهنە تو کاهنییا فوراتی
ئەو خستە تو چەشمەیا حەیاتی
ئەو تەشنە تو ئابێ زندەگانی
ئەو موردە تو جانێ جاودانی
ئەو پەردەگییا کو پڕ هەوا بوو
مەضبووط د پەردەیا حەیا بوو
ئەو پەردە برایی لێ هلاڤێت
خوونێ د دەڤ و کەپێ وێ هاڤێت
زینا کو دو سەد برین ل جەرگێ
چوو حالەتێ فەوتێ شادمەرگێ
بەحرا کو ژ جونبوشا هەوایێ
مەحفووظ د پەردەیا حەیایێ
حاجز کو هەوا رەڤا ژ مابەین
بەرزەخ ژ حەیا نەما د بەحرەین
ئەو قولزومێ غەم کەلی ب سەر جۆش
سەر جۆش و کەلی پەرانە سەرپۆش

سەرپۆش پەڕی ژ دل پەلا خوون
هاڤێت وەکی فەرات و جەیحوون

گۆیا هەژیا هەزار میشە
مەی بوو ڕژیا ژ قەلبی شیشە

میرێ ب غەضەب کەتی ل زینێ
ئەو ڕەنگ ڕەڤا کەلا گرینێ

حاضر ژ دوێ کەبابێ ئولفەت
گەریا وی د چاڤی ئەشکێ شەفقەت

فەووارەئێ مەرحەمەت ب کەل هات
بێگاڤ گرییا ئەوی د گەل هات

ئەو چەند گری برا د گەل وێ
حەتتا سوبە هەردو مان د خەلوێ

زین غەرقەئێ خوونێ دل وەکی گول
میر لێ دگری مشالێ بولبول

مەحرەم هەمی ڤێک کەتن ل با وان
(بالجملە) بەزینە دەست و داوان

کای خوسرەوێ حەق شناسێ عادل
ناحەق تو ژ بۆچ بوویی قاتل

زین گولبەنێ باغێ عصمەتێ بوو
زین سەروێ ریاضێ عففەتێ بوو

پاکیزە دوڕا صەدەف ژ هەر جان
لائق تە نەبوو بگێڕی مەرجان

نـــازک بـــدەنا لـــەطیفـــە مەعصـــووم
بـــێ جـــورم بکـــەی ژ عـــومری مـــەحرووم
ئەڤ ڕەنگـە د خـاک و خـوون تـو ڕاکـەی
بـــێ ســـووچ ژ جـــان بـــەدەن جـــودا کـــەی
میـــر گـــۆ: مـــەکـــەرن خیـــالێ باطـــل
ئـــەو بێهشـــە ئـــەز نەبوومـــە قاتـــل
زینـــێ دکـــوژم مەگـــەر ب عەمـــدا
طـــووبایـــــە د جەننـــــەتا حـــەرەم دا
ئـــەهلێ حـــەرەمێ بەزینـــە ســـەر وێ
جۆیـــــار رەوان کـــــرن ل ســـــەروێ
بـــوو شـــیوەن و شـــین د خـــان و مانـــان
فـــــەریاد گهانـــــە ئاســـــمانان
یـــەک هـــات ژ دەرڤـــە ناگـــەهانی
گـــۆ: مـــەم مـــر و دا وە زنـــدەگانی
زینـــێ مرنـــا مـــەمێ ب گوهـــ کـــەت
گۆیـــا مریـــوو ژ نـــوو ب رح کـــەت
ڕابـــوو فکـــری د چـــار کـــەناران
وی میـــر دگریـــت شـــوبهی بـــاران
خـــەلقێ حـــەرەمێ خـــەواص و عـــامی
مەئتـــەمزەدە بوونـــە (بالتمـــام)ی
گـــۆ: ئـــەی ســـەبەبێ ســـەعادەتا مـــن
بـــێ کـــەیف مەبـــە د دەعوەتـــا مـــن

ئەی شاهـ تە دایە رووحێ روخصەت
فەوتا خوە وێ دی ژ بۆ خوە فورصەت
جان چوو و ب جانی موتتەصل بوو
ئەو رووح ب رووحێ موضمەحل بوو
حەتتا کو نەبوو ژ دەڤێ تە ئقرار
ئەو مایی د حەبسێ تەن گرفتار
تەشبیهێ مەمێ مەلوول و مەحبووس
بۆ حفظێ رضا و ناڤ و نامووس
ئەو لەو نەدچوو حەتا ڤە ئیرۆ
مابوو ل ژڤانییا تە گیرۆ
رووحم تە ژ دل دەما رضا دا
شاهم تە د مولکێ تەن صەلا دا
جسمێ منە بێ نەوا گران بوو
رووحا منە ناتوان رەوان بوو
دەر حال ژ قالبی ب دەرکەت
شەوقەک ژ روحا مەمێ ب بەرکەت
وان تەرک کرن سەرایێ فانی
ئەو چوونە جەهانێ جاودانی
هەرچی کو قەبوول نەکەت مەکانان
دێ سەیرێ بکەت د لامەکانان
هوون ڤێ سەفەرێ غەلەط مەخوونن
شاهد ژ مە ڕا موقەررەبوونن

گاڤا وەکوو جان ژ تەن رەوان بوو

جانان وی دیت و جان ب جان بوو

حاصل کو ژ پاشی ئتتصالێ

ئەو پەرتەوێ مشعەلا جەمالێ

گاڤەک سەکنین و موطمەئن بوون

حینا کو ب یەکڤە موئتەمن بوون

ئەو قەطرە د قولزوما صفاتان

ئەو زەررە د بەحرا موهلکاتان

دەم هاتنە ساحلێ فەنایێ

گەه چوونە ب سەر حەدێ بەقایێ

(في الجملە) ژ مەرکەزا تورابێ

ئەو ذەررە گهانە ئافتابێ

قەطعا نە ب ئتتصال و تەحلیل

مەحضا نە ب ئنفصال و تەحویل

وان رێ کو برین ب جانبێ ذات

باقی گەریان ب ذاتێ ذەررات

نینن عەجەب ئەڤ خەبەر ژ بۆ من

هوون ڤێ مەکەنە هونەر ژ بۆ من

شەیخێ وەکوو ئەز ب دل موریدم

ئەو رووحێ رەوانە ئەز قەدیدم

هەر چەند ل با وە ناڤی مەم بوو

لێ پادشەهەک عالی هەمەم بوو

بـــوو لائقـــێ فـــەرزێ پادشـــاهی
مـــەقبوولێ تەقـــەرروبا ئیلاهـــی
قـــەلبێ وییـــە وادییـــا موقـــەددەس
رووحـــا وی ب نـــوورا حـــەق موقەبیـــەس
هلگـــرتم و برمـــە طـــووڕێ ســـینا
بیننـــدە کـــرم د گـــەل خـــوە بینـــا
ئینامـــە دەرێ ژ ڤـــێ حجـــابێ
ئـــەڤ ذەرڕە گهانـــدە ئافتـــابێ
حینـــا کـــو ب جـــان مـــن ئـــەڤ ســـەفەرکر
ئـــەڤ جـــان مـــە ژ جانفرۆشـــی قـــەرکر
هـــەر چەنـــد کـــو ظـــاهر (اقلعـــي) گـــۆت
حاضـــر وی د پێڤـــە (ارجعـــي) گـــۆت
لـــەو هاتمـــە دا بکـــەم وە راضـــی
مەرضـــییە بـــبم ل پێشـــی قاضـــی
دا ئـــەز بکـــەرم د گـــەل وە تـــەودیع
دا هـــوون بکـــەرن د گـــەل م تەشـــییع
دیســـان ڤەگـــەڕم ژ بـــا وە رەققـــاص
مورتـــاض بـــبم ب جەننـــەتا خـــاص

## تەوصیە و تەدارەکا زینێیە ژ بۆ سەفەرا ئاخرەتێ

## تەهەییوئێ ئەسبابێ جهازە ژ بۆ عەرووسییا جەننەتێ

زینــێ کــو نومانـــە وان کـــەرامات

ئـــەڤ چەنـــدە مـــەنازل و مـــەقامات

ڕوونشـــت و وەصـــییەتا خـــوە بـــۆ میـــر

ئـــەڤ ڕەنگەهـــە کـــر بـــەیان و تـــەقریر

کـــای پادشـــەهێ روحـــان و قـــەلبان

هەمشـــیرە بـــوویی فـــدا و قوربـــان

قوربـــانی تـــە بـــن هـــەڕۆ دوســـەد زیـــن

ئـــەز هیڤـــی دکـــەم نـــەبی تـــو غـــەمگین

ڕۆژا وەکـــوو بـــر مـــە مـــەم ژ بـــۆ خـــوە

(بالجملـــە) بـــرن مـــە غـــەم ژ بـــۆ خـــوە

مەنصـــوور بـــوویم ل کشـــوەرێ غـــەم

غـــەم بوونـــە ژ بـــۆ مـــە ڕا موســـەللەم

مـــەم بـــۆ مـــن و مەرحەمـــەت ژ بـــۆ تـــە

غـــەم بـــۆ مـــن و ســـەلطەنـەت ژ بـــۆ تـــە

شـــاهم ب مـــە ڕا مەبـــە مونـــازع

ئـــەز بوومـــە ب حوصـــەیا خـــوە قـــانع

ڕوونــی تــو ل تــەختی شــوبهی خوســرەو
تـــاجێ خـــوەئێ زەر بگێــــڕە کـــەچرەو
بـــەزما طـــەرەبـــێ بـــدێرە تـــەرتیب
ذەوق و فـــەرەحێ بگێـــــڕە تـــەرکیب
ســـــەرخوەش بکـــــە ســــادە و روالان
چــوون خوەشــکە ژ نووڤــە پیــر و کــالان
ئەســـبابێ نـــەشـــاط و کامـــەرانـــی
ئـــــادابێ صـــــەفا و زنـــــدەگانی
ئامـــادە کـــە شـــەربەت و طـــەعامـــان
ئـــازادە کـــــە جاریـــــە و غولامـــان
پــڕ کـــە طـــەبـــەقان ژ بـــۆ نثـارێ
دا بـــێن فوقـــەرا د ڤـــێ هـــەوارێ
مـــــەجمووع بکـــــە موفـــــەررحاتان
مـــەخلووط بکـــە موعـــەططراتـــان
مـــەجلس ببــتن ب وان مـــەذهەبـــەب
تەهنییـــــە ببـــت ژ نـــۆ مورەتتـــەب
دا ڤێــک بکــەڤن ل مــن شــەکەرخەند
تێــک ڕاهــەژێن ب رەقــص و گۆڤەنــد
ئەقســـامێ بخـــوور و عـــوود و عەنبـــەر
مـــاوەرد و زوبـــاد و مســـکێ ئـــەذفـــەر
ئــەڤ جــنس ژ نعمـــەتان پتــر بــن
ئـــەو قســـم ژ حـــەددی زێـــدەتر بـــن

حەیوانییـــەتا مـــە بوویـــە زائـــل
رووحانییـــەتا مـــە بوویـــە کامـــل

جســـمێ مـــە ئەگـــەر دچیتـــە چـــالێ
رووحـــێ د مـــە دێ بکـــەن وصـــالێ

عەقـــدا وەکـــوو داوەتـــی مەلـــەک بـــن
ئەقســـامێ بخـــوورێ وێ گەلـــەک بـــن

لـــەورا ئـــەز و مـــەم مەلـــەک صـــفاتین
ئـــەم مـــائلێ طیـــب و طـــەییبـــاتین

عورســـا کـــو فرشـــتە داوەتینـــە
دامـــاد و عـــەرووس جەننەتینـــە

ڕۆژا کـــو ســـتی تـــە دایـــە تاجـــدین
چـــاوا تـــە د شـــەهری بەســـت ئـــایین

تەنبیهـــ بکـــە دوکـــان و ســـووکان
تـــەزیین بکـــەن ژ ڕەنگـــێ بووکـــان

بوهتـــان تـــو بیـــێ بـــلا ســـوار بـــن
جونـــدی تـــو ببێـــژە دا ب کـــار بـــن

ســـەرگەرم بـــبن وەکـــی د عیـــدان
هنـــدی کـــو ل هـــەڤ بـــدەن جریـــدان

ڕۆژا کـــو تـــە ئـــەو پـــەری ب ڕێ کـــر
چەنـــدی وەکـــوو کەیفخوەشـــی تـــە چێکـــر

ئـــەز هیڤـــی دکـــەم بکـــەی عنایـــەت
قـــانوونێ بکـــەی وســـان رعایـــەت

ئیرۆهـــه ژ بـــۆ مـــوراد و چەنـــدان
دیســان تــو وســان بــی شــاد و خەنــدان
ئحســان کـــه تـــەدارەک و جهـــازان
حاضـــر بکـــه موطربـــان و ســـازان
مانەنـــدی عمارەتـــا ســـتی تـــێ
هـــەر شـــوبهەتی مەحمـــەلا پـــەری تـــێ
تابووتـــەکـــه زەر نگـــار و ڕەنگـــین
صـــندووقەکه خوردەکـــاره زەرریـــن
سەرپۆشـــێ ئـــەوێ زەمـــین طـــەلا بـــت
ســـەیوانێ ئـــەوێ خـــودان جـــەلا بـــت
زنهـــار! مـــه هـــەردو بـــووک و زاڤـــان
بـــێ قـــەدر نەکـــەی ل پـــێش چاڤـــان
گاڤـــا کـــو دچینـــه نیـــڤ مـــەزاری
دا خـــــەلق نـــــەبێژتن ب زاری
عەقـــدا ســـتیێ چ ڕۆژه خـــوەش بـــوو
زینـــێ ژ ئـــەزەل چ بـــەخت ڕەش بـــوو
نەعشـــێ مـــه بـــلا ســـتی د گـــەل بـــت
تاجـــدین د گـــەل مـــەمێ بـــەدەل بـــت
مانەنـــدی مـــەمێ ژ بـــوویی تاجـــدین
تاجـــدین ب وی ڕا بگێـــڕه شووشـــبین
شووشـــبین بـــتن ئـــەو د گـــەل مـــەمێ مـــن
شـــاهی بـــتن ئـــەو د گـــەل غـــەمێ مـــن

ئـەی مـــایلێ خـــەیرێ بـــێ موکافـــات
وەی بـــاذلێ مەقصـــــد و مــــورادات
حـــەتتا ڤەکـــە ســـالەکێ تـــەمامی
هنـــدی کـــو تەلـــەف دکـــەی طـــەعامی
هنـــدی کـــو ب دەر ددەی لباســـــان
هنـــدی ڤـــەدخوونی عـــام و خاصـــان
هنـــدی کـــو بکـــەر دکـــەی قوماشـــان
هنـــدی کـــو بـــەلاڤ دکـــەی مەعاشـــان
هـــــەر رۆژ ب نییـــــەتا غـــــەزایێ
هنـــدی کـــو گەلـــەک دکـــەی عـــەطـــایێ
هنـــدی وەکـــوو تـــو ل تـــەختی روونـــی
هـــەر رۆژ تـــو جونـــدیان ڤـــەخوونی
هنـــدی کـــو تـــەهی دکـــەی خـــەزینان
هنـــدی کـــو شـــا دکـــەی حـــەزینان
هنـــدی کـــو غـــەنی دکـــەی فـــەقیران
هنـــدی کـــو رەهـــا دکـــەی ئەســـیران
هنـــدی د حوکومـــــەتێ خەبـــــەر دەی
هنـــدی وەکـــوو گرتییـــان تـــو بـــەردەی
هنـــدی کـــو ژ بـــۆ خـــوە ڕا دکـــەی خـــەرج
هـــــەرچی د خەزینـــــەیان دکـــــەی دەرج
قـــەهرا وەکـــوو دوژمنـــان دکـــەت دەفـــع
زەجـــرا وەکـــوو ظـــالمـــان دکـــەت رەفـــع

عـەدلا کـو ژ بـۆ خـودێ تـو خـاص کـەی
مـەظلـووم ژ ظالمـان خـەلاص کـەی
سـازی کـو د جـەنگێ دا دبێـژی
خوونـا ژ موخالفـان درێـژی
حـەتتا خـورەکێ صـەیێ شـکاری
حـەتتا عەلـەفێ کـەرێ د بـاری
شـاهم ل تـە بـت وەصـییەتا مـن
وان صـەرف بکـە ب نییـەتا مـن
مـەفکر د حەقیقـەت و مـەجازی
بنڤیسـە ل دەفتـەرا جهـازی
دا فـەخرێ بکـەم ل پێشـی زاڤـێ
شـەرمەندە نـەبم د وەقـت و گـاڤێ
هـەر چەنـد کـو مـن قـەوی درێـژ کـر
پربێژییـە وی چـرا م بێـژ کـر
گـۆری تەمـە مەقصـەدا مـە دوورە
دوور بـت ژ تـە مەرقـەدا مـە کـوورە
لـەو هنـدە قـەدەر دبـێم ب دقـەت
دا بێتـە دلـێ تـە رەحـم و رقـەت
دەر حـەققێ مـن و مـەمێ نەکـەی عـار
گاڤـا دمـرت مـەمێ برینـدار
ئـەز دێ ب جـەنازەئێ وە ڕا بـم
حـەتتا ڤەکـە مەقبـەران تـەبا بـم

وەقتێ دمرم بدەی تو دەستوور

دا من بکرن د گەل وی مستوور

من ژ ئالێ وی دەر ب دەر نەگێڕی

بێ پەردە د گەل ئەوی ڤەشێری

زینێ کو کرن وەصییەت ئاخر

غائب گەریان ژ دەردی حاضر

میر گۆ: تو هەرە مەمێ ببینە

گەر دێ مری بت ئەوی ڤەژینە

باوەر تو بکە ب صدق و ئیمان

بوومە ل تە و مەمێ پەشیمان

گەر هوون بمرن وە گەر کو ڕابن

نابت تو و مەم ژ هەڤ جودا بن

## پەشێمانییا میر زەینەددینە ل مەحبەبەتا مەم و زینان مەرحەمەتا وییە ل حالێ نازەنینان مرنا مەمێیە ب ئاخوفتنا برینان

زینێ کو بهیستن ئەڤ تەکەللوم
ئەڤ مهر و وەفا و ئەڤ تەرەححوم
ڕابوو خەملی ژ پایی تا فەرق
بوو بەحرێ حوسن د گەوهەران غەرق
دایین و ستی و سەد پەرستار
خورشید و مەهـ و نوجوومێ سەییار
(بالجملە) ب دەرکەتن ژ بورجان
دوڕدانە ب دەرکەتن ژ دورجان
سەد جاریە و ستی و دایین
هلگرتن ئەوێ ب ڕەسم و ئایین
زانی کو نەبوو موراد حاصل
بێ خەلوەتێ خاص و شەیخێ کامل
ئەو زەهرە مثالێ ذەررە ڕەققاص
بوو مەحرەمێ رازێ خەلوەتا خاص
گاڤا کو گهانە خەلوەخانێ
دەرگەهـ ڤەکرن ل حەبسخانێ

ئەو پێکڤە ب مەشعەل و فەنەر چوون
دایین و ستی هنەک د بەر چوون
دیتن کو د ساحلێ صەدەفوار
ئەو غەرقەئێ بەحرێ عشقێ خوونخوار
دوڕدانەئێ بێ بهایێ جانی
دەردایە ژ دەست خوە رایەگانی
فانووس و قەفەس وە مایە بێ تاب
گولزارێ بەدەن وە مایە بێ ئاب
وان پرس کرن ژ خەلقێ بەندی
حالێ وی فەقیر و موستەمەندی
خەلقێ کو د گەل مەمێ گرفتار
گۆتن کو مە دی ژ سەطح و دیوار
بەرقەک ب عەجەب مەمێ ب سەرکەت
شەوقەک ژ سەرێ مەمێ ب دەرکەت
یەک شوبهەتی ڕۆژ و یەک هەیڤ بوو
یەک شوبهەتی زێڕ و یەک ژ زیڤ بوو
ئەو شەمس و قەمەر کو موتتەصل بوون
دەر حال ب یەک ڤە موضمەحل بوون
گاڤا کو ب یەک ڤە موقتەبس بوون
ئەو هەردو ل ضەوئێ مونعەکس بوون
ئەو ڕەنگ گەڕیان مونیر و ڕەوشەن
زندان ل مە کرنە صەحن و گولشەن

مـەم ژی ب ڤـی ڕەنگـی بـێ خەبـەر بـوو
خوونـــا دلـــێ وی ب دەرڤـــە دەر بـــوو

ئـــەی دیـــدەئێ دل نـــەبوویی مـــەفتووح
ئنكـــار نەكـــەی تەجـــەلليا رووح

دا فكـــر نەكـــەی كـــو ئـــەڤ حولوولـــە
یـــان نســـخە خورووجـــە یـــان دوخوولـــە

دا ظـــەن نـــەبری كـــو ئـــەڤ مثالـــە
یـــا قـــەولێ ضـــەعیفـــە یـــا بـــەطالـــە

خـــەونا تـــو دبینـــی ئـــەڤ مەقامـــە
شـــەیئەک ژ شـــوهوودێ ناتـــەمامـــە

هـــەم صـــوحبەتییا مـــەمێ موكـــەررەم
ئاگاهـــ كـــرن هـــەڤال و هەمـــدەم

وی مورشـدی قـەنج ل وان نـەظـەر كـر
قـەلبێ وی د قـەلبێ وان ئەثـەر كـر

هەمخـــەلوەتییا مـــەمێ گرفتـــار
بـــوو پـــەردە گوشـــایێ یـــار و ئـــەغیار

دایـین و سـتی كـو چـوون ب سـەر دان
هنـدی كـو ئـەوان د گـەل خەبـەر دان

گـۆتن كـو مـەمۆ تـو ڕابـە زیـن هـات
رووحـا تەیـە بـێ گومـان یـەقین هـات

ئـــەو تەشـــنەلەبێ زولال دیـــدار
شـــاداب نـــەبوو ب نـــاڤێ دلـــدار

هندی کە ڕەها دلی کشاندن
هندی کو گولاڤ لێ ڕەشاندن
وان سەه نەکرن د جسمی جانەک
ئیللا ژ سەری دچوو دوخانەک
وی موردە چراغی ناگەهانی
دووکەل ژ سەری دچوویە بانی
زین هات و ژ پێشڤە بوو حەوالە
بەدرێ کو ڤەدا ژ بەر خوە هالە
بەرقەع کو ڤەدا ژ بەر جەمالێ
خورشید نەما د گەل هلالێ
زینێ وەهە گۆتە وی بەدیهی:
(قم یا جسدا نفخت فیە)
شەوقا خەبەرێ دەڤێ شەپالێ
بەربوویە سەرێ د وێ شەمالێ
وێ دوویێ قەبەس ژ شەوقێ ڕاگرت
قەندیلێ قەفەس قەبەس کو داگرت
ئەو خەلوەتییێ د ئعتکافێ
ڕابووڤە ب نییەتا طەوافێ
ئەووەل ئەوی کر ب صدقێ دەردەم
تەجدیدێ وضوو ب ئابێ زەمزەم
وەستا ل موصەللی و مەقامێ
وی جەبهە گهاندە ئستلامێ

طـــەوفـــەک دو کـــرن ل دۆری بـــەیتێ

پەروانـــــەئێ پـــەرِ گهانـــــدە زەیتـــــێ

گاڤـــا وەکـــوو پـــەرِ ل وی دســـۆتن

وان چـەنـد کـەلام ب یـەک ڤـە گـۆتن

پەروانـــەئێ گـــۆ: تـــو خـــوەش دەلیلـــی

شـەمعێ وهـە گـۆ: تـو خـوەش خـەلیلی

پەروانــــــەئێ گـــۆ: تـــــو رەهنمـــــایی

شـــەمعێ وهـــە گـــۆ: تـــو جانفـــەزایی

پەروانــــــەئێ گـــۆ: تـــــو دلفــــرووزی

شـــەمعێ وهـــە گـــۆ: تـــو ســـینە سـووزی

پەروانــــــەئێ گـــۆ: تـــــو چارەســــازی

شـــەمعێ وهـــە گـــۆ: تـــو دل نـــەوازی

پەروانــــــەئێ گـــۆ: تـــــو پادشـــــاهی

شـــەمعێ وهـــە گـــۆ: تـــو قبلـــەگاهی

پەروانـــەئێ گـــۆ: تـــو حـــووریێ ذاتـــی

شـــەمعێ وهـــە گـــۆ: تـــو نـــووریێ ذاتـــی

وان تـەشـــــنـەلـەبێ د بــــێ تـەکـــــەللوف

وان ســـوختە دلـــێ د بـــێ تـەصـــەرروف

ئەڤ رەنـگ دکرن ب یـەک ڤـە صـوحبـەت

لێـــک عــەرض دکــرن کــەمالێ ئولفــەت

دایـــین و ســـتی و ئـــەو پەرســـتار

ئـــەو بەنـــدی و حـەبســـی و گرفتـــار

سەرگەرم بووین ب گوفت و گۆیێ

سەرمەست بووین ژ بهن و بوویێ

وان گۆتە مەمێ کو ئەی جەگەرخوون

ئەم هاتنە دا نەبی تو مەجنوون

زین بوو سەبەبێ جنوونییا تە

میر بوو سەبەبێ زەبوونیا تە

میر بوو ب تە ڕا خودان تەرەححوم

زین هات و د گەل تە کر تەکەللوم

گەر تەشنەئی ئەڤ هە ئابێ حەیوان

وەر خەستەئی هاتە سەر تە لوقمان

مەجنوونی خوە هاتە با تە لەیلا

گەر وامقی ها ژ بۆ تە عەذرا

گەر بولبولی گول ژ بۆ تە حاضر

نیلۆفەری مهر بوویە ناظر

پەروانەئی شەمع وێ ئەییسا

وەر موردەئی هاتە سەر تە عیسا

دیوانە مەبە ب ڤی هەوایی

بێگانە مەبە تو ئاشنایی

حوورا کو تە جان و دل د دەس بوو

زینا کو تە دائما هەوەس بوو

چاوا تە دڤێ وە هاتە با تە

دونیایە فەنایە هات و باتە

ئـــەرزان مەفرۆشـــە عـــومرێ ضـــائع
بیهـــــوده مەبـــە ل جـــانی بـــائع
جامـــا ئەجـــەلێ حـــەتا بنۆشـــی
نـــابینی ژ بـــۆ خـــوە جانفرۆشـــی
دیســـان خـــوە ب عـــەقلی ئاشـــنا کـــە
زنجیـــرێ جنـــوونییێ رەهـــا کـــە
لـــەورا ڤـــەکرن مـــە قەیـــد و زنجیـــر
رابـــی ب مـــە ڕا بچینـــە پـێش میـــر
صـــاحب کـــەرەم و خـــودان عـــەطایـــە
ظلـــلا وی ســـها پـــەڕێ هومایـــە
ڤێکدانـــە ژ بـــۆ تـــە یـــار و ئـــەحباب
حاضـــر کرنـــە بســـاط و ئەســـباب
ثابـــت قەدەمـــە ل دەعوەتـــا تـــە
ڕوو دایـــە تـــە بـــەخت و دەولـــەتا تـــە
دەر حـــال دەمـــا بچـــی موقابـــل
دێ بـــۆ تـــە بکـــەت مـــورادێ حاصـــل
چـــاوا تـــە ژ وی مـــورادە دلخـــواز
ئـــەو ڕەنـــگ تـــە دێ بکـــەت ســـەرەفراز
وەقتـــێ کـــو مـــەمێ بهیســـتن ئـــەڤ پەنـــد
ئـــەڤ ڕەنگەهـــە گـــۆ ئـــەوێ هونەرمەنـــد
ئـــەز ناچمـــە حـــەضرەتا چـــو میـــران
ئـــەز نابمـــە بەنـــدەئێ ئەســـیران

ئـــەڤ میـــر و وەزیرییـــا مـــەجازی
ئـــەڤ شـــەعبەدە و خیـــال و بـــازی
(بالجملـــە) بـــەطـــال و بـــێ بەقانـــە
بـــێ عاقبـــەتن هـــەمی فەنانـــە
میـــرێ کـــو مـــرن هـــەبت نـــە میـــرە
مـــەعزوولی هـــەبت ئـــەوێ ئەســـیرە
ئـــەم چوونـــە حوضـــوورێ میـــرێ میـــران
وی حـــاکمێ حـــاکم و فـــەقیران
شاهنشـــەهێ میـــر و پادشـــهان
بەخشـــەندەئێ توهمـــەتا گوناهـــان
ئـــێ چێکـــری نـــەینکا جـــەمالێ
تیـــرا خـــوە نومـــا ب زولـــف و خـــالێ
فانووســـێ بـــەدەن کـــری موطـــەلـــلا
تێـــدا ژ مـــە ڕا کـــری تـــەجـــەللا
ئـــەو میـــر و حەکیمـــە (ذو الجـــلال)ە
بـــێ عـــەزل و تەغـــەییور و زەوالـــە
تـــەزویج کـــرن د عالـــەما غـــەیب
تەئبیـــد کـــرن ب ئـــەمرێ (لا ریـــب)
بـــاکوورەئێ بـــاغێ عـــزز و نـــازین
ســـەد شـــوکر کـــو بکـــر و ســـەرفەرازین
حاشـــا کـــو د ڤـــی ســـەراێ فـــانی
بـــێ جەننـــەتێ عـــەدنێ جـــاودانی

حـەیوان صـفەت ئـەم بكـین زنـایێ
بیهـــوودە د مســـكەنێ فـــەنایێ

تـەڕ دامـەن و سـەرنگوون و مـەردوود
شـەرمەندە بچینـە پـێش مـەعبوود

مـەعبوود ژ بـۆ مـە حـوور و غلمـان
تـــەزیین كرنـــە د بـــاغێ رضـــوان

ئـــەو مونتـــەظرن ل رحلـــەتا مـــە
فـــەخرێ دكـــەن ئـــەو ب دەعوەتـــا مـــە

لـــێ جەننـــەتێ عاشـــقان جودایـــە
میعـــــادێ لقـــــائێ كبریایـــــە

عـــالیترە ئـــەو ژ بـــاغێ رضـــوان
ناكونجنـــە وێ چـــو حـــوور و غلمـــان

هیڤـی دكـەن ئـەم ئـەوی ژ مـەعبوود
نینن مـە ب غـەیری وی چـو مەقصـوود

گاڤـا ئـەوی كـر تەمـەننی ئـاخر
دەرگاهـــ ڤـــەبوو ل بـــەر وی حاضـــر

طـەیرێ كـو قەفـەس ل بـەر ڤـەبوویی
ئـەو ڕەنگـە فـڕی وەكـی نـەبوویی

دەســتێ خـوە ژ قەیـدا گـل كشـاندن
چـــەنگێ د دلـــێ خـوە ڕاوەشـاندن

شـەهباز ژ قەیـدێ مەركـەزا فـەرش
پـەرواز كـر و گـەهشـتە (ذي العـرش)

## تەعزیە و مەئتەم و مەرثیە و شیوەنا مەمێ شەهیدە
## مرنا بەکرێ شەقی ب دەستێ تاجدینێ سەعیدە

ئـەو مەئتـەمییێ کـو بـا خەبـەر بـوو
ئـەڤ ڕەنگـە ژ بـۆ مـە نەوحەگـەر بـوو
گـۆ: جـان کـو ژ حەبسـێ تـەن جودا بـوو
فـەریاد و فغـان ژ شـەهری ڕابـوو
بـوو وەلوەلـە و فغـان و زاری
بـوو زەلەزەلـە و بـەزین هـەواری
بوهتـان ژ مـەزن حـەتا بچووکـان
نسـوان و کـەچ و بـەنات و بووکـان
ئـەعیان و ئـەکابر و ئـەعالی
میـرزا و ڕوال و لائوبـالی
یـەک فـەرد نـەما د شـەهری دلخـوەش
(بالجملـە) د سـەرخوەش و موشـەووەش
ڤێکـڕا دبـەزین ب سـەر مـەمێ ڤـە
وان دەرد بـڕن ب سـەر غـەمێ ڤـە
تاجـدین و بـەکر ب ئتتفـاقی
بـوون هـەردو ل عـەردەکی مـولاقی

گـۆ: ئـەی سـەبەبێ فسـادێ عالـەم
شـەیطان صـفەتێ ل شـەکلێ ئـادەم

ئـەی بـاعثێ فتنـە و فسـادێ
وەی مـانعێ مەقصـەد و مـورادێ

ئـەی پـەردەدرێ مـەمێ وزینـێ
وەی داغ کـشـێ ل سـەر برینـێ

ئبلیسـێ خـەبیثێ پـڕ نەدامـەت
بـەس نینـە ل مـن تـە کـر قیامـەت

دەر حـەققێ مـەمێ سـەقەط خەبـەر دا
حـەتتا کـو ل مـن تـە مـەم ب دەر دا

ئـەڤ چەنـدە مونـافق و نـەیاری
هێـژا تـو ب چـاڤێ مـن دیـاری

مـەم دێ بمـرت تـو دێ بمینـی
هێـژ خـوەش بگـەڕی ل ڕوو زەمینـی

حاضـر وی بـەکر د عـەردی ڕاکـر
جسـمێ ب بـەلا ژ جـان جـودا کـر

گاڤـا کـو گـەهشـتە سـەر برایـی
نـوورەک وی نـەدی د وی چرایـی

تاجـدین ژ سـەرێ خـوە تـاج و تۆمـار
هاڤێتنـە سـەر لشـێ مـەمێ ژار

دیـن بـوو ژ تەحەسسـورا برایـی
هـەر چـی کـو ددی وی ئـەژدەهایی

(فـي الحـال) دكـر كـو وى فـەنا كـەت
تەشـبيهى بـەكر د عـەردى ڕا كـەت
قـەط كـەس نەدشـێ بيـت موقابـل
بـێ شـوبهە ب وى دبوويـە قاتـل
ناچـار خەبـەر بـرن ژ بـۆ ميـر
ميـر هـات و ل پـێ وى بەسـت زنجيـر
گاڤـا كـو جـەنازە وان هلانـى
شـاهد كـو ژ مەشـهەدێ دەرانـى
مەشـهوود بـوويين ل وان عەلامـەت
ڕابـوو ل خـەلائقان قيامـەت
دێـوێ كـو ڤەبەسـتى وان ب تـەدبير
بزدانـدى ل بـەر خـوە قەيـد و زنجيـر
زنجيـر و كەمەنـد ئـەوى شـكينان
دەروازە و پـەردە وى هلينـان
ئـەژدەر ژ مـەغارەئێ كـو بـەر بـوو
دەر حـال بـەزى د نەعشـێ وەر بـوو
تـابووت ل سـەر سـەرێ خـوە دانـى
ئـەفغان دگهانـدە ئاسـمانى
هنـدى كـو د شـەهرى ئادەمى بـوون
تێكـدا د لباسـێ مەئتـەمى بـوون
هنـدى كـو هـەبوون د شـەهرى مەشـهوور
خـاتوون و موخـەددەرات و مەسـتوور

گیسۆ ڤەکرن ب طایێ طەرپۆش
سەر تا ب قەدەم هەمی سیەهپۆش

بێ مەعجەر و مەقرەع و سەرانداز
ڕەش گرتی ژ بۆ مەمێ ب دلخواز

نەبیاحە و مهرەبان و دایین
گۆیندە ب نالە شوبهی گۆیین

وان مەرثیە ئستران ب ئاهەنگ
زین ڕابوویە پێ ب قامەتا شەنگ

ناهیید صفەت ل دەنگێ سازێ
ڕەقاص د چوو د بەر جەنازێ

دام و دەد و ئادەمی و مووران
دار و بەر و جامەد و طویووران

(بالجملە) ژ بۆ مەمێ دنالین
هەر یەک ب مەقامەکێ دکالین

طەلپێ ڕەشێ وان سیاهپۆشان
ڕەهـ شوبهەتی عەورەکێ خورووشان

ئەو چەند ژ عارضێ د گولگوون
ڤێکرا دوەرین سرشکێ پوڕ خوون

گۆیا کو د فەصلێ نووبهاری
باران ل گولشەنان دباری

ئەڤ مەتەم و ئەڤ سیاهپۆشی
ئەڤ چارشەڤ و ئیزار و پۆشی

بوهتـــان وی زەمـــانی کرنـــە عـــادەت
بـــوو رەســـمێ قـــەدیم تـــا قیامـــەت

## ئلتماس و ئستدعایا زینێیە ژ بۆ بەکرێ موفسد ڕا

## عوذرخواهییا وێیە ژ بۆ وی یێ مولحد ڕا

وەقتێ وەکوو چوونە سەر مەزاران
وان دی مرییەک د نێڤ دو داران
هاڤێتنە عەردی شوبهی موردار
بێ نەوحەگەر و خودان و خەمخوار
پورسین: عەجەب ئەڤ چ بێ نەوایە؟
گۆتن: بەکرێ خودان جەزایە
تاجدینی ژ ڕوو دنێ فەنا کر
عالەم ب فەنائییا وی شا کر
راوی وەهە گۆتە مەن روایەت:
زینێ کو بهیستن ئەڤ حکایەت
ئەڤ ڕەنگەهە گۆتە میر و تاجدین:
ئەی شاه و وەزیر و عزز و تەمکین
ئەز هیڤی دکەم نەکەن عنادێ
دەر حەققێ ڤی مەنبەعێ فسادێ
لەورا کو خودانێ ئنس و جانان
وی خالقێ ئەرض و ئاسمانان

ڕۆژا ئـــەوی حوبـــب دا حـــەبیبان

هنگـــی ئـــەوی بـــوغض دا ڕەقیبـــان

مـــەوجوودکرن دەمـــا ژ مەعـــدووم

ئـــەم پێکڤـــە د لازم و د مـــەلزووم

ئـەم سـۆرگولن ئـەو ژ بـۆ مـە خـارە

ئـەم گـەنجن و ئـەو ژ بـۆ مـە مـارە

گـــول حفـــظ دبـــن ب نـــووکێ خـــاران

گەنجینـــە خـــودان دبـــن ب مـــاران

ژ ئـەووەل ڤـە ئەگـەر چ وی جـەفا کـر

ئـاخر ب مـە ڕا ئـەوی وەفـا کـر

ظـــاهر وی ئەگـــەر موخالەفـــەت کـــر

بـــاطن ب مـــە ڕا موافەقـــەت کـــر

گـەر ئـەو نـەبوا د نێـڤ مـە حائـل

عشـقا مـە دبـوو بـەطـال و زائـل

وی گـەر چ ژ بـۆ خـوە ڕا خـەراب کـر

دەر حـەققێ مـە وی قـەوی صـەواب کـر

ئـەو بـوو سـەبەبێ حەقیقـەتا مـە

داخـل گـەریا طـەریقـەتـا مـە

ئـەو ژی د ڕیـیـا مـە دا شـەهیدە

تـەحقیق بکـەن کـو ئـەو سـەعیدە

زنهـار! ژ مەشـهەدا کـو مـەم تـێ

ئەلبەتتـە ژ مەرقـەدا کـو ئـەم تـێ

مــــەحرووم مەكــــەن بــــەكر ئەمانـــــەت
ئــــەم بووينــــە ب وى صــــەيى صــــيانەت
گاڤـــا كـــو دچينـــە نێـــڤ صـــەعيدى
كـــەلبێ مـــە بـــتن ل بـــەر وەصـــيدى
ئنصـــافە ژ بـــۆ خـــودانێ ئنصـــاف
ئايينـــە دبيـــتن ئـــەڤ قـــەدەر صـــاف
قـــەط مومكنـــە ئـــاب و ئابگينـــە
ئـــەڤ رەنگـــە نەكـــەت قـــەبوولێ كينـــە
حاشـــا كـــو ب غـــەيرى پوختـــەئێ عشـــق
(كـــەللا) كـــو ســـوايێ ســـوختەئێ عشـــق
ئـــەڤ چەنـــدە ل صـــاحبێ جـــەفايێ
ئـــەڤ رەنگـــە كەســـەک بكـــەت وەفـــايێ
ئـــەڤ طائفـــە مەرحەمـــەت سورشـــتن
لـــەو لائقـــى نعمـــەتا بەحەشـــتن

## تجهیز و تەکفین و تەدفینا مەمێ مەحروومێ غەمگینە
## هەمنەفس و هەمقەفس بوونا ب فەوتا زینا نازەنین و غەمرەڤینە

(القصـــە) شـــەهیدێ عشـــقێ جـــەلللاد
مـــەقتولێ ســـتەم قـــەتیلێ بـــێ داد
ئـــەو کوشـــتەئێ جـــورمێ بـــێ گونـــاهی
تەشـــــبیهی بـــــەراتێ پادشـــــاهی
مەنشـــوور کـــرن ب نـــوورێ پـــاکی
مەســـتوور د نێـــڤ قوبـــوورێ خـــاکی
ئـــەو دورِ ب خەزینـــەئێ ســـپارن
ئـــەو مـــار ل بـــەر پیـــان ڤەشـــارن
دایناندنـــە بـــەر ســـەری عەلامـــەت
یـــەعنی ئەڤـــە ســـەروەرێ قیامـــەت
ســـەرخەیلێ قـــەبیلێ پـــاکێ بـــازان
ســـەرداری جـــەمیعی ســـەرفەرازان
زیـــن هـــات و ب قامـــەتا صـــەنەوبەر
بـــوو ســـەروێ ل ســـەر وی سایە گوســـتەر
بـــێ پـــەردە مثـــالێ نـــەی دنـــالی
هێســـتر دوەریـــن (علـــی التـــوالي)

عـــەینی تـــە دگـــۆ د فەصـــلێ نیســـــان
دەریـــــا رژیـــــا ژ عـــــەوری دیســـــان

بـــــاران کـــــو ل توربـــــەئێ دبـــــاری
هـــــەر دانـــــە دبوونـــــە دەهــــ مـــــراری

هـــەردەم کـــو دکـــر ژ دەردێ دل ئاهـــ
وان مەئتـــــەمیيان (نعـــــوذ باللـــــە)

ڤێـــــرا ب نـــــەوا دگـــــرتن ئاهـــــەنگ
هەر نەهـ فەلـەکان ب سەر دکەت دەنگ

جونـــــدی و ســـــوپاهی و ئـــــەمیران
دەروێـــــش و رەعییـــــەت و فـــــەقیران

دلـــــــدار و شـــــەپال و نازەنینـــــــان
حـــــووری و پـــــەری و غـــــەمرەڤینان

ڤێکـــــرا دکـــــرن هـــــەوار هـــــەر کـــــەس
ئـــەفغان دگـــەهانـــە چـــەرخێ ئـــەطلـــەس

زینـــــێ کـــــو نـــــەما قـــــوام و قـــــووەت
نـــــالی بریـــــان و کـــــەت ژ قـــــودرەت

رووڤنشـــــت ل بـــــەر ســـــەرێ مـــــەمێ ژار
مـــــەم کـــــر ب تەکـــــەللوم و خەبـــــەردار

کـــای مـــالکێ مـــولکێ جسـم و جـــانی
ئـــــەز باغچـــــەمـــــە تـــــو باغبـــــانی

بـــــاغێ تـــــە گهانـــــدی بـــــێ خودانـــــە
بـــــێ ڕوویـــــێ تـــــە ئـــــەو ژ بـــــۆ چرانـــــە

ئەڤ خال و خەط و عوزارێ گولزار
ئەڤ حوسن و جەمال و باغێ روخسار
بادامێ سیاهـ و چەشمێ شەهلا
نار و بهـ و سێڤێ شاخێ بالا
خوەش ڕەنگ ب لەذذەت و ب طامن
بێ شوبهە ل غەیری تە حەرامن
نەخلا بەدەنا خوە ڕاوەشینم
ڤی مێوەئی جوملە داوەشینم
ڤان سونبول و لالەئێ د غەررا
رەیحان و بنەفشەئێ موطەررا
یەعنی کو عوزار و زولف و خالان
یا قەنج ئەوە ئەز بدەم ب تالان
مانەندی گولان لباسی کەرکەم
ئاخ و خوەلییێ ب سەر خوە وەرکەم
زولفان هەمی طا ب طا بکێشم
حەققێ منە جا ب جا ب ئێشم
ئەڤ باغ و بوهار و بەرگ وئەثمار
ئەنوار و شوکووفە جەمعێ ئەزهار
نەذرا نەظەرا تە بوون ب جارەک
وەقفا بەصەرا تە بوون موبارەک
تالان بکەم ئەز ئەوان تەمامی
دا بەهرە نەخۆن ژ وان چو عامی

لێکن خوه ب خوه دکەم تەصەوور
بەلکی تو ل من ببی تەغەییور
ئەڤ جەزعە نەبت ل با تە مەقبوول
ترسم کو تو من بگێڕی مەسئوول
تەرکیبێ ووجوودێ جسم و جانن
مولکێ د تەنە نە بێ خودانن
نوقصان ببتن ژ حوسنێ موویەک
بەلکی کو بکەی ل من تو سوویەک
گاڤا کو ل من بکەی عتابێ
زانم کو نەشێم بدەم جەوابێ
نێزیکە ببم وەکی تە مەدهووش
ها وەقتە د گەل تە بم هەم ئاغووش
لائق ئەوە طەی بکەم بساطێ
پاکیزە ببم ژ ئختلاطێ
یا قەنج ئەوە هەر ب ڤێ جەمالێ
ئازوردە نەکەم قە زولف و خالێ
تسلیم بکەم ئەمانەتێ حەق
تەفویضێ تە بم ب خەمل و رەونەق
ئەڤ ڕەنگە ئەدا کرن حەقائق
بزدانە ژ عالەمێ عەلائق
هەمبێز د مەرقەدی وەرانی
بێزار نەما بەدەن ژ جانی

دەستێ خوە ب دل ژ جانی شوشتن
گۆیا کو شەمال بوو ڤەکوشتن
رووحا خوە شهاندە پێش باری
جسمێ خوە سپارە وی مەزاری
وان مەئتەمییێ د دل برینـدار
تەکرار ژ نووڤە کرنە هاوار
ئەفغان ژ جانێ حاضرینان
فەریاد نهاد نازەنینان
سێ رۆژ و شەڤان ژ فەرشێ غەبرا
پەیوەستە دچوونە عەرشێ ئەعلا
حەتتا وەکوو زین ب رەسم و ئایین
تەجهیز کرن وەکی دزانین
لەحدا کو مەمێ مەلەک نەظەر تێ
یەعنی صەدەفا کو ئەو گوهەر تێ
ئەو چەند ل سەر گرین ب زاری
بارانێ سرشکێ لێ دباری
ئەو چەند ل سەر بووین گوهەربار
سەر لێ ڤەکرن ژ نووڤە تەکرار
ئەو هەردو گوهەر د دورجەکێ دا
ئەو شەمس و قەمەر د بورجەکێ دا
بێ واسطە وان کرن موقارن
بێ فاصلە ئەو ب هەڤ سپارن

حاصل ڤەکرن ژ نووڤە صندووق
میر گۆتە مەمێ: ژ بۆ تە مەعشووق
سێ جار ژ قالبی صەدا هات
ئاواز ب لەفظێ (مەرحەبا) هات!
هەمیان کو بهیست سررێ تەحقیق
(بالجملە) کرن ب عشقێ تەصدیق
تەحسین و سەد ئافەرین ژ وان را
قەط مەیلێ دنێ نەبوو ژ وان را
ئالوودە نەبوون ب خاک و خاشاک
ئەڤ بوو ئەڤەرا مەحەببەتا پاک
پاکیزە و پاکباز ئەو چوون
دووشیزە و سەرفراز ئەو چوون
لەبتەشنە و بەر ژ هەڤ نەخواری
حەسرەت زەدە چوونە پێش باری
خوەش عەیش کرن ب عشقێ (واللە)
خوەش پێکڤە مرن (تبارک اللە)
هەرچی ب جوانی شوبهی زینێ
تەبدیل بکەت ب عشقێ ژینێ
یا مثلی مەمێ ب عشقێ سەر دەت
عەیش و خوەشییێ ل رێ ب دەر دەت
ئەلبەتتە مورادێ دێ هەلینت
هەرچی کو ئرادەتێ ببینت

یـــا رەب ب کـــەلالیّ عشـــقیّ صـــادق
یـــا رەب ب کـــەمالیّ صـــدقیّ عاشـــق

یـــــا رەب ب شـــــرینییا جـــــەمالیّ
یـــــا رەب ب ئـــــەڤینییا جـــــەلالیّ

یـــا رەببـــی ب دەردیّ هـــەجریّ جانگاهـــ
یـــا رەببـــی ب ذەوقـــیّ وەصـــلیّ دلخواهـــ

یـــــا رەب ب حـــــەلاوەتا حـــــەبیبان
یـــــا رەب ب عـــــەداوەتا رەقیبـــــان

یـــــا رەببـــــی ب نـــــازیّ نازەنینـــــان
یـــا رەب ب نیـــازیّ غـــەم گوزینـــان

یـــا رەببـــی ب ئـــاڤیّ چـــاڤیّ بولبـــول
یـــا رەب ب خونـــاڤیّ نـــاڤیّ ســـۆرگول

یـــا رەببـــی ب ئەشـــکیّ ئـــالیّ مـــەجنوون
یـــا رەببـــی ب روویـــیّ لـــەیلیّ گولگـــوون

یـــا رەب ب مـــەمیّ و ڤـــیّ ئـــەڤینیّ
یـــا رەب ب تەحەســـــوورا ل زینـــیّ

وەقتـــیّ کـــو جـــودا دکـــەی ژ جـــانی
بـــیّ بـــەهرە نەکـــەی ژ عشـــقیّ خـــانی

یـــــەعنی ژ ولایـــــەتا موحەمـــــەد
مـــەحرووم نەکـــەی تـــو یـــا رەب ئەحمـــەد

چاڤـــا ژ نوبـــــوەتیّ ب قالـــــە
مـــەطلـــەب ژ ولایـــەتیّ مـــەحالـــە

دائـــم ئـــەوی گوفتوگـــۆ وەلایـــە
لـــێكن ئـەوی جوســت و جـوو بەلایـە
قـەولێ د وی سـەر ب سـەر گـوذافن
فعلـــێ د وی (جملـــةً) خلافـــن
ظـــاهر ژ وە ڕا سەلیســـە گوفتـــار
بـــاطن ب وە ڕا خەبیثـــە کـــردار
مانەنـــدی مـــەمێ ئـــەوی مرنجـــان
تەشـــبیهی بـــەکر ببەخشـــە قـــەنجان

## تسویلێ تەفاوت و ئختلافێ خلقەتە

## تەمثیلێ تەقاضایێ سرشتێ طینەت و فطرەتە

حکمـەت ئـەوە ئـەو ژ دارێ دونیـا
چـوون سـەیر کـرن سـەرایێ عوقبـا
وان تـەرک نـەدا جبللـەتا خـوە
هـەر یـەک خـولقین د خلقـەتا خـوە
یـەعنی کـو ل سـەر مـەمێ و زینـێ
شـین بـوو ژ زراعـەتا ئـەڤینێ
رسـکین دو عـەدەد نهـالێ سـەروەش
رابـوون ب هـەوا ڤـە هـەردو سـەرخوەش
یـەک سـەرو سـهی و یـەک صـەنەوبەر
سـەر سـەبزە لـەطیـف و سـایە گوسـتەر
وان دەسـت د گـەردەنێ د یـەک ڕا
قـەددا خـوە درێژکـرن ب یـەک ڕا
شـین بـوو ژ ئـەوی بـەرێ ژ خێـرێ
دارەک ل قیافـەتا کنێـرێ
ئـەو دار ژ راحـەتێ بـەری بـوو
مانەنـدی خـودان ب ئـستری بـوو

ڕابوو خوە گهاندە هەردو داران

بوو مانعێ وەصلێ هەردو یاران

ڕاحەت نەشێ وی بکەت مودارا

خەصمانەئی کر وی ئاشکارا

دیسان خوە گهاندە وان حەبیبان

ئەو لێ پچیا وەکی ڕەقیبان

حاصل ل فورووع و گەر ئوصوولان

ئەو لێ فەتلی وەکی فوضوولان

خەلقێ کو ب ئەصلی بەد سرشتن

ئەو ئەصل ژ وان قە تێتە شوشتن

چل سالی تو حەنظەلێ بچینی

سەد ئاف بدەی ب هنگڤینی

پەروەردە بکەی ب ئافتابێ

هەردەم بڕەشینی لێ گولابێ

هەر ڕۆژ ڕەها وی لێ ب کەر کەی

وێ فاصلەئێ تژی شەکەر کەی

خدمەت بکەری تو هندووانە

ئەو بۆ تە دبیتە هندووانە

دا فکر نەکەی دەما کو بەر دت

ئەو غەیری ژ طەحلیێ ثەمەر دت

## مثالێ سەرەنجامێ بەنی ئادەم و مالە
## نە ب حسبێ ظاهری ب صوورەتێ حالە
## بەلکی موتەعەللقێ باطنێ مەعنا
## و مەوقووفێ مشلییەتێ (ذو الجلال)ە

ئاگـــاه ژ حـــالێ دەورێ ئـــەییام
ئـەڤ ڕەنگەهــە گۆتــە مــن ســەرەنجام
گــۆ: پیرەکــێ مهــرداری عاشــق
قــەولێ وی ژ ڕەنگــێ صــوبحێ صــادق
وەقتــێ وەکــوو ئــەو دبــوو موراقــب
رووحــا وی دبــوو ب جســمی غالــب
ئەســـــرار دبــــوون ل وی دیــــاری
نێچیــــر دکــــر ل عەرشــــێ بــــاری!
غائــب کــو دبــوو ژ عالـــەما گـــل
غالــب کــو دبــوو ل عالــەما دل
قــەلبێ وی ژ سـرڕێ لــەوحێ مــەحفووظ
هەر لەحظـە دبوو ب کەشفێ مـەحظووظ
ظــاهر کــو دبــوون ژ وی کــەرامات
ئاگەهـــ دکـــرن خـــودان مـــەقامات
وی پیــری ب خــەون ئەگــەر ب ئلهــام
ئــەڤ ڕەنگەهــە کــر حەقیقــەت ئعلام

گـۆ: چوومـــه ديـــارێ بـــاغێ رضـــوان
مـــن دی دو هـــەزار حـــوور و غلمـــان
(بالجملـــه) د قەصـــرەکی عـــەمـــەلـــدار
ئـــەو قەصـــر بتـــون ژ دوررێ شـــەهوار
يـــەک شـــوبهی بـــەکر ب تـــاج و بنپـــەر
وەســـــتايه ل بـــــەر دەری موقـــــەررەر
چەوگانـــــەکی حـــەيزەران د دەس بـــوو
ئـــەمما م نزانـــی ئـــەو چ کـــەس بـــوو
مـــن گۆتـــه وی: ئـــەی خـــودان مـــەراتب
ئايـــا تـــو خـــودانی يـــان حاجـــب؟
گـــۆ: شـــەيخ تـــو مـــا نزانـــی کيمـــه؟
ئـــەز ئـــەو بـــەکرێ کـــو قاپۆچيمـــه!
ئـــەز موشـــتەرکێ مـــەمێ و زيـــنم
لـــەو لێرەهـــه ئاســـتان نشـــينم
ئەڤ قەصره کو هەشت طـەبەق عـەيانن
يـەک يـا منـه حـەفت طـەبـەق د وانـن
ئـــەز لێـــره ئـــەمين و دەســـت ب دارم
لـــێکن د ڤـــی مـــولکی حوصصـــەدارم
هـــەر چەنـــد ب شـــەکلی پاســـبانم
ئـــەمما ب مـــەکان شـــەريکێ وانـــم
مـــن گۆتـــه وی: ئـــەی نکـــو ســـەرەنجام
واضـــح بکـــه بـــۆ مـــه حـــالی ئعـــلام

هـەر چەنـد کـەرەما کـەریمی عامـە
بـاری ب چ دا تــە ئـەڤ مەقامــە؟

گـۆ: شـەیخ تـو هێـژ نـەبوویی عـارف
ئـەمما د دنـێ تـو بـوویی واقـف

ئـەز گـەر ب خەبـەر رەقیبـێ وان بـووم
لـێکن ب نـەظـەر حـەبیبێ وان بـووم

مـن ئـەو ژ دنـێ ب پاشـڤە کێشـان
موعتـاد کـرن ب دەرد و ئێشـان

خوەشـیێ د دنـێ ل وان ب دەر دان
مونقـاد کـرن ب داغ و دەردان

ئـەو چەنـد مـە دانـە وان سیاسـەت
حـەتتا وەکـوو بـوون خـودان ریاسـەت

لـەورا مـە ل ضـەررێ وان خەبـەر دا
حـەتتا کـو سـەرێ خـوە تـێ ب دەر دا

ئـەڤ هـەردو جهـان ب هـەڤ هەوینـە
ئـەڤ ضـەررە ل ضـەررێ هـەڤ قەوینـە

حـەتتا وەکـوو بـەر نـەدەی تـو پێکـێ
نـابینی چـو لـەذذەتـێ ژ پێکـێ

ئـەو ضـەررە ب وان مـە دایـە بـەردان
کێشـانە ب ئاسـمان ژ عـەردان

مـن دائیـە وان بتـوون بەحەشـتەک
وان دائیـە مـن ژ بـاغی خشـتەک

شـەیخ مـــایی ل گوهتنـــا وی گوهـــدێر
گـۆ : ئـەی شـەقییێ تـە عاقبـەت خێـر
تاجدین کـو تـو کوشـتی بـێ جنایـەت
بـــاری ب وی ڕا چ کـــر عنایـــەت؟
گـــۆ: عـــەفو کـــر ئـــەو جـــەنابێ بـــاری
بـــوو جەننـــەتی و نەچوویـــە نـــاری
خـــەللاقێ خـــەرابی و خـــەبیثی
بەخشـــینە وی جەننـــەتی نثیســـی
عالـــەم کـــو ب دەســـت خـــەرابییا مـــن
عـــاجزکری بـــوو فســـادییا مـــن
کوشـــتم وی ژ بـــۆ نظـــامێ عالـــەم
بـــۆ ڕاحـــەتییا عـــەوامێ عالـــەم
ظـــاهر وی ئەگـــەر چ کـــر قەباحـــەت
بـــاطن بـــووە ڕاحـــەت ئـــەو قەباحـــەت
شـــۆلن هەنـــە (ظـــاهرا) خـــەرابن
فعلـــن هەنـــە (صـــورة) صـــەوابن
یـــەک عەدلـــە ل صـــوورەتێ جـــەفایێ
یـــەک قـــەهرە د کســـوەتێ وەفـــایێ
لـێ پـەردە کشـێ ڕومـوزێ حکمـەت
بـێ سـڕ نـەکر ئـەو کونـوزێ قسـمەت
تـــەوزیع نـــەکر ل عـــامێ خاصـــان
مەخصـــووص وی دا نـــەدیم و ناســـان

ئەو سرِ وی نەکر ژ بۆ مە مەعلووم
هن موحرمن و هنەک د مەحرووم
سەد شوکر ئەزێ خەراب و تاجدین
مەحضا ب تەعەللوقا مەم و زین
مەحرووم نەبوون ب پرِ گوناهی
بوون مەظهەرێ رەحمەتا ئیلاهی
ئەی دۆست ب دل بە یارێ قەنجان
یا قەنج ببە تەبایێ قەنجان
ئەو قەنجن و قەنجییێ دزانن
ئەو غەیری ژ قەنجییێ نزانن
هندی کو بکەی ب وان جەفایێ
ئەو دێ بگەرِن ب دل وەفایێ
زنهار! تو مەبە موحب خەرابان
نە دۆست و نە دوژمنێ کلابان
گەر دۆست بی دێ بکەن تە موردار
وەر دوژمنی دێ بکەن بریندار
ئەڤ همەتە خاصێ عاشقانە
ئەڤ مەرتەبە راهێ صادقانە
خەلقێ کو وەکی بەکر شەقینە
فعلێ د وی جوملە ناحەقینە
یان شوبهەتی تاجدین د جەبار
قەتتال و دلاوەر و جگەردار

مەعفوو بکەتن کەرامەتا وان
مەغفوور ببن ژ هممەتا وان
تەقوییەتێ وان ببت مەدەدکار
تەبعییەتێ وان بکەت سزاوار
ئەڤ رەمزە حەقیقەتا لەطیفە
ئذعان بکە نوکتەئێ ظەریفە
ئذعان بکە مسئەلێ، مودەررس
تەخمینێ مساحەتێ، موهەندس
دوژمن کو ژ عشقێ بەهرەوەر بن
بەس دۆست چ ڕەنگ د موعتەبەر بن
ئەڤ ڕەنگە تەعەللوقا رەقیبان
بەس چەندە تەفەووقا حەبیبان
خاسما کو موحب ببیتە مەحبووب
ئەو طالبێ حەق ببیتە مەطلووب
حەققا کو تەنێ وی حەق دزانت
قەط غەیری وی کەس ب حەق نزانت

## ئشباتێ خەواص و کەمالێ جەوهەرێ عشقە
## کو کیمیایێ ئەکبەر و کبریتێ ئەحمەرە ژ بۆ خودانی
## لەورا بەهیمە و دوڕندە و شەیطانییێ
## دکەتە مەلەک د نەفسا ئنسانی

ئـەی موسـتەمعێ مشـال و تـسـویل
وەی موجتەهـدێ قیـاس و تـەئویل

خـانی کـو ژ جـامێ عشـقێ دیـن بـوو
ئـەو شـۆڕە شـەراب پـێ شـرین بـوو

ئـەو چەنـد ڤـەخوار ئـەوی نەهشـیار
ئاگـاهی نـەما ئـەوی ژ گوفتـار

مەسـتانەیە ئـەو ب کـەیفێ مـەئموور
دیوانەیـە ئـەو ب عـورفێ مـەغدوور

مـەخمووره و بـادەنۆش و سـەرخوەش
لـەو بـادە فرۆشـە و موشـەووەش

هـەرچی کـو دبێـژتن هەوایـە
گـەر گوهـ بـدنێ هـەوایێ نایـە

ئـەو نـەی نـە حـەلال و نـە حەرامـە
بـێ پەردەیـە لـێ نـە بـێ مەقامـە

کـوردی و عـەرەبی دەری و تـازی
تـەرکیب کـرن ب هـەزل و بـازی

هنــــدەک ژ فســـــانەێ د بوهتـــــان

هنــــدەک د بەهانــــە هـــن د بوهتـــان

بــــوهتی و مهـــەمـــدی و ســـــليقی

هـــن لـــەعل و هنـــەک ژ زێــرِ و زيڤــی

خـــــەرموهرە و مـــــوٚرک و مـــــراری

هنــــدەک د شـــەفاف و هـــن د تـــاری

تەرصـــيع کـــرن وەکـــی بچووکــــان

ئينانــــــە ب قەيصـــــەری و ســـــووکان

هـــن قصصـــە و هـــن ژ وان مثـــالن

هنــــدەک د حـــەرام و هـــن حـــەلالن

هــــەر قصصـــە ژ حصصـــە بەهرەمەنـــدن

هــــەر ئەمثلــــە گـــەر بزانـــی پەنـــدن

لـــــێکن وی غـــــەرەض ژ گوفتوگـــوٚيێ

مەقصـــوود ژ هنـــدە جوســـت وجـــوٚ يـــێ

ظاهرکرنـــــا جـــــەمالێ عشـــــقە

ثابتکرنـــــا کـــــەمالێ عشـــــقە

عشـــــق ئايينـــــەئێ خـــــودا نومايـــــە

خورشـــيد صـــفەت خـــودان ضـــيايە

غافــل مبــە عشــقێ (فـــي الحقيقــە)

ئـــەی راهـــرەو (أقـــرب الطريقـــە)

خـــوەش جەوهـــەرە جـــنس کيميايـــە

قـــەدرێ وێ بـــزان گـــران بهايـــە

طـەبعـێ د كـو صـفر و بـێ جەلانـە
قـەلبێ د كـو قـەلپ و يـا قەلانـە
ئـەڤ جەوهـەرە وان دكـەت موطـەلـلا
ئـەڤ صـەيقەلە وان دكـەت موجـەللا
هـەرچی كـو كەسـەك بكـەت ئـرادە
يـا عشـق موريـدە يـا مـورادە
ئايينـەئێ عەكسـێ بـێ مثالـە
گەنجينـەئێ سـررێ بـێ زەوالـە
كـەس نينـە ژ عشـقێ بـێ ئەثـەر بـت
مـومكن كـو ژ ذەوقـێ بـێ خەبـەر بـت
هـەر كـەس ب قياسـێ هممـەتا خـوە
دێ صـەرف بكـەت ئرادەتـا خـوە
لـێ ئەكثـەرێ عامييـان نـەزانن
نەفسـا خـوە ژ بـۆ خـوە ڕا نـزانن
نابـالغ و ئەبلەهـ و سـەفيهن
يـا زاهـد و صـووفی و فـەقيهن
ئـەو جاهـل و ئـوممی و سـفيلن
بـێ مورشـد و ڕەهبـەر و دەلـيلن
ناچـار دبـن ل عشـقێ بـائع
نەقـدێ خـوە ددەن ب حوسـنێ ضـائع
هـن صـەرف دكـەن ب عەيشـێ دونيـا
هـن پـێ دكـڕن سـەرايێ عوقبـا

ئـەڤ هـەردو جەلـەب دبـن زیانكـار
مـــەحرووم دبـــن ژ ذەوقـــێ دیـــدار

## بەیانێ مەراتب و مەدارجێ سولووک و وصوولێ (إلی الله) و مەراسمێ فەنایێ (في الله) و بەقایێ (بالله)

سـاقی وەرە بێـژە مـن چ لەونـە
ئـەڤ کەونـە خیالـە یـان خەونـە؟
تـەعبیر مەکـە کـو ئـەو بـەطالـە
تەصـویر مەکـە کـو ئـەو خیالـە
ئاغـاز ئەگـەر چ ڕەنـگ حەیاتـە
ئـەنجامێ حـەیاتێ وی مەماتـە
یـەعنی کـو ووجـوودە بـێ ووجـوودە
خـوەش خلقەتـە حـەیف بـێ خولـوودە
ئـەفلاک و عەناصـر و مەوالیـد
ئـەخلاط و طـەبـائع و مەقالیـد
ڤێکـڕا د (بـدیع الاشـتراک)ن
تێکـدا د (سـریع الانفکـاک)ن
سـەر رشـتەئێ گەوهـەرا بەقانـە
سـەرمایەئێ عللـەتا فەنانـە
هنـدەک د ثـەقیـل و هـن خـەفیفن
هنـدەک د خـەفی و هـن لـەطـیفن

هەر چەند ژ بۆ مە ئەصل و بیخن
هەر چار ژ بۆ مە ئاخشیخن
ئاگر ڤەمرت هەوا هەوایە
ئاڤ ئەر چکییا هەبا هەبایە
ئەفلاک مثالێ ئاسیا بن
هەمواره ب چەرخ و ئنقلابن
دەخلێ ل وی ئاشی ئادەمینە
مەطموورەئێ ئەرضی ئاردەلینە
ئەو دانە ب نەوبەت و تەوالی
دائم دڕژن ژ دەڤ جوالی
هەرچی ڕژیا دبت موجەززا
ژێکرا دبتن دبن موهەررا
تەخمیر دکەن ژ نوو ڤە تەکرار
ئەو قالبێ قەلبە (قابل النار)
ئەو چەند دکێشن ئەو سیاسەت
راضینە ب مەرتەبا نەجاسەت
(في الجملە) نە موردە و نە ئەحیا
بەر موجبێ (لا یموت و یحیا)
ئیللا کو نەفیس و پاک طینەت
یەعنی کو نوفووس نیک سیرەت
دهقان ب خوصووصیەت هەلینت
وێ دانەئێ (خاصة) بچینت

حەتا نەرزت هەلاک نابت
نارسکت و قەنج پاک نابت
وەقتێ رسییا و بوویە خووشە
وێ دێ بقوتن ژ بوویی تووشە
ئاشێ دەڤ و چەقچەقا زەبانان
ئاڤا دهەن و بەرێ ددانان
ئەو چەند ئەوی دەڤ ددەن دهێرن
ئەو چەند د شەهرێ تەن دگێرن
ئەو چەند دقوتن وێ ئەڤ عەمەلدار
حەتتا وەکوو هوور ببت وەکی ئار
حاصل کو ژ پاشی وان جەفایان
دێ بێیتە تەصەرروفا قوایان
گەهـ جاذبە باطنی ڤەکێشت
گەهـ ماسکە بگڤشت ب ئێشت
دەم هاضمە بیت ئەوێ بکەت هەضم
دەم دافعە بیت ئەوێ بکەت کەظم
تەننورێ مەعیدە وێ بپێژت
هەرچی کو خرابە ژێ برێژت
تەصعید بکەن هەچی لەطیفە
تەنزیل بکەن هەچی کەثیفە
پاشی ژ وێ ئەلطەفێ جودا کەن
تەمییز بکەن ژ هەڤ بەلا کەن

طـــەبيـــاخێ حـــەرارەتا غـــەريزی

صـــەبباغێ مومـــەييزێ تـــەميزی

تـــەوزيع بكـــەت ل جســم و ئەعضـــان

مـــەعموور ببـــەت جهـــات و ئـــەركان

ديـــزا جگـــەر و دلـــێ زوجـــاجی

تـــەقطير بكـــەن مـــەيا مزاجـــی

حاصـــل عـــەرەقا مـــەيا حـــەياتێ

تـــەقطير كـــو بـــوو وەكـــی نـــەباتێ

هێـــژا ژ ظوهـــوورێ ڤـــان شـــوئوونان

بـــوو قـــابلێ عالـــەما بوطـــوونـــان

گەهـ غـەوطـێ دخـوت د بـەحرا مـائێ

ڕەنگـــين دبـــتن دەمـــەک د مـــائێ

دەم عەقـــد دبـــت ژ بـــۆيی تـــەركيب

تەصـــوير دبـــت ب نـــەظـــم و تـــەرتيب

تـــەركيب كـــو بـــوو مثـــالێ مـــەرجان

بـــوو عـــەكس پـــەذيـــرێ پەرتـــەوا جـــان

ئـــەو جـــان چييـــە؟ موهجـــەيا نـــەباتێ

ئـــەو موهجەيـــە مەنشـــەئا حـــەياتێ

هنـــدی وەكـــوو ســـاكنێ بوطـــوونـــە

خامووشـــە و خوارنـــا وی خوونـــە

وەقتـــێ كـــو ژ مـــەزرەعێ خـــەفايێ

ئـــەو ســـەبزەيێ تـــەر بكـــەت نومـــايێ

وێ سەبزەئێ دەم ب دەم بخوونێ
دێ ئاڤ بدەن ژ پاشی بوونێ
باران نە ژ فەیضێ بت مەدەدکار
ئەو دانە دبیتە نەخلێ بێ بار
سەرسەبز دبت ژ بەرگ و یاران
گەر لێ بوەرت ژ فەیضێ باران
ئەو سەبز کو بوو نهالێ سەرکەش
سەرخوەش گەڕیا ژ مێوەئێ خوەش
ئەو مێوە دەما گها کەمالێ
بوو مەظهەرا پەرتەویا جەمالێ
گەر لائقی عززەتا ئەمیرە
وەر دەرخورێ حەضرەتا قەدیرە
وێ هەلدگرن ژ بۆ دیاری
بێ واسطە وێ دبەن دیاری
(في الحال) کو چوو دبیتە مەحبووب
ناقێ وی ل وی دبیتە مەجذووب
ئەڤ نەخلەنە (وافر الفروع)ن
لێ زێدە د (نادر الوقوع)ن
وەر مایی وسان ل بەر هەوایێ
ئەو دێ چیتە مەعصەرا جەفایێ
لازم ئەوە پەروەشێ ببینت
تەربییەتێ دەرخورش هەلینت

گەهـــ پوختـــە ب ئافتـــابێ شـــەرعێ
گەهـــ ســـوختە ب ماهتـــابێ وەرعـــێ
گاڤـــا پژیـــا گهـــا کـــەمالێ
وەقتـــا رژیـــا ژ ســـەر نهـــالێ
حـــەتتا نەکـــەڤت ژ ئـــەوجێ عـــززەت
حـــەتتا نەگەهیتـــە خـــاکێ ذللـــەت
ئـــەو نابتـــە ســـالکێ طـــەریقـــێ
وێ نابـــەنـــە مەعصـــەرا حـــەقیقێ
ئەڤ رەنگەهە دەست ب دەست ب رێڤە
ئـــەو مەرتەبـــە مەرتەبـــە ب ویڤـــە
ئەو مێوە بخوت کـەمالێ ضـەریـەت
ئەو لوقمـەئێ خوەش ببیتـە شـەربەت
ئـــەو شـــەربەت ئەگـــەر شـــرینە خامـــە
وەر طـــەحلـــە و طرشـــە ناتەمامـــە
حـەتتا نـە ب دەسـتێ پیـرێ مـەیخوەر
ئـــەو هلکـــەلتن د خـــومێ ئەکبـــەر
گاڤـا کـو د وێ ڤـە کـەل ب سـەرکەت
وەقتـــێ ژ خـــومێ مـــەزن ب دەرکـــەت
یـــەعنی کـــو ژ کـــەثرەتـــا صـــفاتان
ئـــەو طـــەی بکـــەتن تەجـــەللیاتان
(القصـــە) ژ گـــەرمیا جـــەمالێ
حاصـــل کـــو ب شـــەوکەتا جـــەلالێ

جەوهـەر کـو تـەمام موضـمەحـل بـت
تەشـبیهی عـەرەض کـو مونفـەعل بـت
گەرمییـــــەتێ وان تەجـــــەللیاتان
وان مـــــوحرق و وان موقـــــموویاتان
تـــــەنزیل بکـــــەن ژ وێ غوبـــــارێ
تەصـــــعید بکـــــەن ژ وێ بوخـــــارێ
خـــالص کـــو ببـــت ژ پاشـــی تەصـــعید
هێـــــژا دچیتـــــە مـــــەقامێ تەجریـــــد
جەوهـەر ژ عـەرەض کـو بـوو موجـەررەد
داتینتـــــە بووتـــــەئێ موجـــــەددەد
ئـــەو بووتـــە ئەگـــەر چ تـــەنگ نایـــە
صـــــەحرایێ فـــــەنایێ دلگوشـــــایە
هـــــەمرەنگی ســـــوراحی و پەیالـــــە
هنـــدی وەکـــوو ســـۆرە یانـــە ئالـــە
هێـــــژا نەبوویـــــە رەحیقـــــێ مـــــەختووم
هێـــــژا نەچوویـــــە مـــــەقامێ مـــــەعلووم
هنـــدی ژ خـــوە وێ هـــەبت ووجـــوودەک
نیـــنن ژ خـــودێ ئـــەوێ نمـــوودەک
بـــێ مەشـــرەبەئێ وەفـــایێ شـــاهی
ئـــەو ناچتـــە مەشـــرەبا ئیلاهـــی
فـــانی نـــەبتن فـــەنایێ موطلـــەق
نـــابینتن ئـــەو بـــەقایێ (بـــالحق)

فـــانیتی ژ بـــۆ وی ڕا بەقایـــە
بـــاقیتی ژ بـــۆ وی ڕا لقایـــە
ئـەمما نـــە ب ئتتصـــال و ئلحـــاق
بـــەلکی کـــو ب ئنفصـــال و ئطـــلاق
ئـەڤ ڕەنـــگ دکـەت مـــورادێ حاصـــل
ئینجـــا دبتـــە موریـــدێ و واصـــل
یـــا ڕەب چ دبـــت ژ بـــەر مـــە کـــوران
جـــارەک تـــو ڤـەدی حجـــاب و تـــوڕان
بینەنـــدە بکـــەی ئـــەمێ د عـــاجز
بـــێ پـــەردە و بـــێ حجـــاب و حـــاجز
دەریـــایێ یـــەقین بکـــەت تەمـــەووج
ئـــەم ژی بکـــەرین دەمـــەک تەفـــەرروج
ئـەڤ ظـەنـن و گومـان و علـم و تەقلیـد
تەبـــدیل بـــبن ب عـــەینێ تەوحیـــد
ئەسـباب و وەسـیلە قـەط نـــەمینن
جـــارەک نـــە موســـببی ببیـــنن
ئیمـــان مـــە هەیـــە ب ذاتـــێ واجـــب
ئمکانیـــەتا مـــە بوویـــە حاجـــب
دیسـان ژ مـە هـەر تـو مـە خـەلاص کـە
یـا ڕەب مـە ژ بـۆ خـوە ڕا خوەنـاس کـە
ئـەڤ سـەیر و سـولووک و طـەییێ مـەنزل
مەخصووصـــە ژ بـــۆ موریـــدێ موقبـــل

کـەنگی ژ مـە ڕا دبـت مویەسسـەر
خـالق ژ ئـەزەل نەکـەت موقـەددەر
لـەورا کـو خـەرابی و قـەبوولی
نیـنن ب فـەضـائل و فوضـوولی
عابـد ب ریایـەکێ هلاکـن
عاصـی ب دوعایـەکێ دپـاکن
عالـەم کـو وەکـوو خیـالێ ظلـلـە
صـانع ب خـوە هـادی و موضـللە
ئـەو تیننتـە مەنظـەرا خیـالێ
ئـەو تێختـە پـەردەیا ضـەلالـێ
لـێ دایـە مـە جـوزئێ ئختیـاری
نەفسـا مـە ب لێـب و حیلـەکاری
ئـەو ژی بریـیـە ژ دەسـت مـە ناچـار
ئـەم مانـە و لـەطفـێ حـەق مـەدەدکار
بـەس قـەنج ژ بـۆ مـە عامییـان ڕا
هـەر ئـەڤ بەسـە بـۆ مـە عاصییان ڕا
ژ ئـەووەل ڤـە خـودێ ب حـەق بناسـین
هـەر چەنـد قوصـوور و کـێم و کاسـین
پاشـی ب دلـێ خـوە ژێ بترسـین
دینـێ خـوە ژ عالـمـان بپرسـین
چـاوا کـو دبێـژن ئـەم وسـا بـین
حـەتتا کـو ژ روو دنـێ وەفـا بـین

پـــالا خـــوه بـــدەینـــە لـــوطفێ بـــاری
بـــەلكی مـــە ب بەخشـــتن ژ نـــاری

## خاتمییا کتاب و نامەئ د صوورەتێ خطابا د گەل خامەئێ
## هەرچەندە غەرەض خەتم کەلامە لاکن ل موتەکەللمی ئبهامە

ئـــەی راکبـــێ واقعـــێ پـــەیادە
وەی عاشـــقێ صـــەفحەئێ د ســـادە
ئـەی شـاعرێ صـاغر و نگـوون سـەر
وەی ســـاخر و ســـاحرێ فوســـوونکەر
ئـــەی هـــائمێ وادییـــا ضـــەلالـــێ
وەی غـــاوییێ دەعوەیـــا کـــەمالێ
ئـەی خامـەئێ سەرتەراشـێ بـەدڕەنگ
بەس نامەئێ خوەش قوماشێ خوەش ڕەنگ
ڕووڕەش کـە ب نـاڤێ خـەطـط و خـالان
بـــەدنام بکـــە ب بـــێ و دالان
هـنـدی وەکـوو خـەط غوبـار و هـوورە
ئـەو خـەط ژ لـەطافـەتێ تـە دوورە
گاڤـا کـو ژ ڕەنگـێ مشـقێ پـڕ بـوو
یـا شـوبهەتی نسـخ و ثـولثێ گـر بـوو
ئـەو ناسـخێ نوسـخەیا جەمالـە
بـێ رەونـەق و روهنـی و کەمالـە

لازم ئـــــەوە دلبـــــەرێ د ســـــادە
خـــەط لـــێ نـــەبتن وەكـــی قـــلادە
خـوەش زینەتـە خـەط ل مـاهێ روخسـار
هنـــدی ل رووبـــان نەبوویـــە هەڤســـار
ئـەی خامــە تــە ژێ گەلــەک درێــژ کــر
ئـەڤ نامــە بەســە تــە پــڕ قرێــژ کــر
هــەر چەنــد کــەلام شــوبهی دوڕ بــت
بــێ قــەدر دبــت دەمــا کــو پــوڕ بــت
نـــابینی ب قیمـــــەتن جـــــەواهر
لـــــەورا کـــو د هنـــدكن د نـــادر
سـەهو و غەلــەط و خــەطــا و نسـیان
مەجمووعـــەئێ ناپەســـەندێ عصـــیان
تــــەحریرکرن تـــــە بـــــێ تەئـــــەمول
کــی دێ بکــەتــن ژ تــە تەحــەمول
کـەس نینـە بکـەت ژ بـۆ تـە تەحسـین
گۆیەنـــــدەئێ ئافـــــەرین و نفـــــرین
ئـــەی بـــێ ئـــەدەبا خەرابـــە بـــێ عـــار
گوســـــتاخ و ســـــتەمكەر و ســـــیەهكار
هنـدی کـو سـەرێ تـە مـن قەلـەم کـر
ئـەو چەنـد تـە خـەطـێ خـەطا رەقـەم کـر
هنـــدی کـــو ســـەرێ تـــە مـــن تەراشـــی
ئـــەو چەنـــد تـــە کـــر گونەهـــ تەلاشـــی

فەححاشــی تــە کــر ژ ڕەنگــێ خــانی
نەققاشــی تــە کــر مثــالێ مــانی
مەشـغوولی بسـە ب لـەعب و لـەهوان
تـەوبا خـوە بکـە ژ خـەطـا و سـەهوان
جـارەک وەرە سـەر طـەریقــێ تەوبـە
هنــدی نەگــەهشــتییە تــە نەوبــە
نەوبـەت کـو گـەهشـتە خەصـمێ خامـە
طـەی کـر ل مـە ئـەو نـزاع و نامـە
ئــەو بــەطلــێ دلاوەرێ زەبەردەســت
ئــەووەل کەمــەرا تەهــەووری بەســت
بــوو راکبــێ دولــدلێ ئــەنامل
دەر حــال د گــەل مــە بــوو موقابــل
کێشــا ژ زەبــانی ذولفقــارەک
بــوو خەصــم د گــەل مــە شەهســوارەک
ئــاخر ل مــە هاتییــە عتابــان
ئــەزمان گــەڕیا ل وان جــەوابان
گـۆ: ئەحمـەد ئەگـەر تـو نـەی خـەبیثی
هـەر چـی کـو تـە گـۆ مـن ئـەو نڤیسی
قەولێـد تــە قــەنج ئەگــەر خــەرابن
فعلێـد تـە خـەطـا ئەگـەر صـەوابن
ئـەی بـەد عەمـەلۆ تـو قـەنج دزانـی
تــو قائــل و فاعــل و خــودانی

نـەی بـووم ئـەز د عالـەما نەییسـتان
مـەی بـووم نـە ب دەسـتێ مەیپەرسـتان
گاڤـا كــو تــە ئـەز بـرم ژ سـازی
نـە دەنگـێ د مــن هـەبوو نـە گـازی
تــە دووركــرم ژ نــك هـــەڤالان
مـــــەهجووركرم ژ مولــــك و مـــالان
بەنــد و وەصــلێ د مــن ســەرابن
ئەووەل تـە كـرن ب ئـەمرێ (كـن) كـون
پاشــی تــە دكــر د بــاغێ عشـقێ
كـون كـون دلـێ مـن ب داغـێ عشـقێ
تـە پـف كـرە جسمێ مـن دەمـا جـان
هــاتن ژ دلــێ مــن ئاهــ و ئــەفغان
نـەفخا تـە ل مـن دل و جەگـەر سـۆت
هـەرچی كـو تـە پفكری مـن ئـەو گـۆت
ئـەز لالـم و بـێ زەبـان و خـامووش
بێ نـەفس نەفـەس ژ ڕەنگـێ قـامووش
بـەزما طـەرەبـێ ب مـن تـە خـوەش كـر
دیـوانێ گونەهــ ب مــن تــە ڕەش كــر
هــەر چەنــد كــو ظــاهری بـبم ئــەز
ســازەندە تــویی وەكــی نــەیم ئــەز
مــا نــەی ب خـوە تشـتەكی دبێـژت؟
خامــە ب خــوە رەشــحەكێ دڕێــژت؟

کاتــب قەلــەمی دکــەت ســیەهکار
ســازەندەیە نــەی ژ دەســت ب هــاوار
نــای و قەلــەم و صــەدا وە کیشــان
تیــر و هــەدەف و کــەمان و کیشــان
(محکــوم علیــە) بــوون د تەقــدیر
هێــژ ئــسمێ گونەهــ نــەبوویێ تەســطیر
یــا رەب تــو دزانــی خــانییێ ژار
تەشــبیهی ب خامــەیا گرفتــار
قــەلبێ وی د دەســت تــە دایــە ئــەلحەق
دەستێ وی د دەست خوە نینە موطلــەق
گاڤــا کــو ل وی تــە ســەرقەلەم کــر
هــەرچی تــە ئــرادە کــر رەقــەم کــر
ئــامر تــویی ئــەو ب ئــەمری مــەئموور
مــەئموور دبــن هەمیشــە مەعــذوور
گــەر دابییــە وی تــە ئختیــارەک
ئــەو ژی وێ ســپارە تــە ب جــارەک
ئــەو گــەر عــەدەم و وەگــەر قەلــەم بــوو
پەیوەســتە د دەســت تــە ســەر قــەدەم بــوو
نــەفع و ضــەرەرا خــوە ئــەو نزانــت
یــا قــەنج ژ بــۆ خــوە ڕا چ زانــت
چــاوا کــو ژ بــۆ تــە ڕا رضــایە
ئــەو نــەی صــفەتە وی ئــەو هەوایــە

وەللاهــ ژ سـفـيـــدی و سـيـــاهـــی

وی قەصـــد و غـــەرەض تـــويی ئيلاهـــی

ئـــــەمما ب مورەککــــەبا قـــــەبائح

ڕووڕەش کرنـــــە گەلـــــەک صــــەفائح

خەططـێ ب تە سەرنوشت و سەرمەشق

سەه ساله خەطـێ خەطـا دکەت مەشق

لـەورا کـو دەمـا ژ غـەيبێ فـەک بـوو

تـاريخ هـەزار و شێـسـت و يـەک بـوو

ئيســـــاله گهشـــــته چـــل و چـــاران

وی پێشــــــــرەوێ گوناهکـــــــاران

ڤێکـــدا ژ مـــەناهيان گەلـــەک مـــال

يـەک پـوول نـەهن ژ حوسـنێ ئـەعمال

ئـەووەل کـو تـە دا ژ عشـقێ مـەطلـەع

ئـاخر بـدە وی تـو حوسـنێ مەقطـەع

## نەققاشێ ئەزەل

نەققاشـێ ئـەزەل رۆژا سـەرلەوحەيێ رەنگـين دا

پـەرگار ژ دەسـتان بـوو سەرصـەفحە كـو تـەزيين دا

تـەذهيـب و زەرەفشـان كـر سـەرلەوحێ كيتابا عشـق

رەسـما ئـەزەلی كێشـا نەقشـێ خـوە نـوو ئـايين دا

ديباجـە كـو ئينشـا كـر فهرەسـتە كـو ئـملا كـر

جلـدەك ژ عەناصر بەسـت نەفخـەك ب سـوفالين دا

ئـەطفـالێ مەلـەك هـاتن وەسـتانە دبسـتانێ

(لا علـم لنـا) گـۆتن (ئەبجـەد) ب خـوە تـەلقين دا

وان سـادە روخـان مەشـقێ عشـقێ كـو تەمـەننا كـر

خەطـطاطێ ژ حوسنێ خەط سەرمەشقەكی زەررين دا

ئـەز چوومـە دەرێ ديـرێ مـن ديـت كـو (روح اللـه)

تـەكراری موصـەووەر بـوو حـەتتا د نهـالين دا

وان جوملە (أنا الحق) گۆت من واحدێ موطلـەق گۆت

سـاقی ب خـوە ئـەز گـرتم جامـەك مـەيێ نۆشـين دا

من نۆشی و سەرخوەش بووم (في الحال) مشەووەش بووم

ئەز چار و نەهـ و شەش بووم من تەکیە ب بالین دا[1]

هەرچی کو مە بەر پێ کر هندی مە نەظەر لێ کر

من سەیر ل ئێکێ کر لەورا مە دل و دین دا

من دی هەمی یەک پەرتەو ساری د مەظاهر دا

مومکن هەمی ژێ پڕ بوون ئەمما نە د تەمکین دا

ئەو بوو کو زولەیخایێ ئێ دیتی د یووسف دا

مەجنوونی د لەیلائێ فەرهادی د شیرین دا

جانا ژ جەمالا تە ئەز دێ کوو ببم صابر

شەیخان و ئولوعەزمان جانێ خوە د کابین دا

مصباحێ ئەبەد من دی ئیرۆهە د فندێ دا

گەنجا ئەزەلی مەرکووز من دی د گل و طین دا

مەعذوورە ئەگەر صووفی بت مونکرێ مەحبووبان

گەر تێ کو تەصەوور کت سررا کو د دووربین دا

ما سەجدە تەنێ من بر بەر صوورەتێ مەحبووبان

ئبلیسی نەبر سەجدە لەو مایە د نەفرین دا

---

(١) چار و نەهـ و شەش د حیسابا ئەبجەدی دا دکەفتە بەرانبەر (دطو) ئانکو: ئەز خوار بووم، وەکی مرۆڤێ قستا وەغەرێ دکەت، ڤێجا خوە دچەمینت، دا تشتێن خوە هلگرت.. و بەلکی مەخسەد ب چارێ هەر چار عونصر بن یێن کو هەبوون ژێ پەیدا دبت، و ب نەهێ هەر نەهـ فەلەکێن ل دۆر هەبوونێ دزڤڕن، و ب شەشێ هەر شەش جهەت بن یێن لەشی هەین.. ئانکو: دەما من مەیا عشقا حەقیقی ڤەخواری، ئەز بوومە هەبوون ب هەمی عونصر و فەلەک و جهەتان ڤە.

شاهد بی تو ئەی زاهد مەحبووب پەرەستم ئەز

بێ شاهد و مەی نابم شەیخێ مە ئەڤ ئایین دا

جانی ژ تە ئەی خانی جانان کو بخوازیتن

ها نوقطە ل بەر دانی (في الحال) د مزگین دا

## ئەی واحدێ پەنهان

ئـەی واحـدێ پـەنهان کـو ژ ذاتـێ تـەیـە پەیـدا

ئەڤ کەون و مەکان ئەرض و سەما گونبـەدێ خەضـرا

ئـەرواح و عوقـوول ئـەنفوس و ئـەعراض و جـەواهر

خـالن د موصـەووەر نـە مەحـەلل و نـە هـەیولا

لەوح و قەلەم و کورسی و عـەرش ئـەنجوم و ئـەفلاک

هـەم ئـاگر و ئـاخ ئـاڤ و هـەوا جوملـەئێ ئەشـیا

سـەد قافلــە مـــەوجوود پەیاپـــەی موتـــەواتر

هـەر لەحظـە ژ صـەحرایێ عـەدەم تـێن ب تەمـەننا

هـــن نەقـــدێ فـــەنائێ دگوهـــۆڕن ب بـــەقائێ

هـن نەقـدێ ووجـوودا خـوە دکـن بـێ بـەدل ئـەفنا

هـەر یـەک ب ووجـوودا خـوە ووجـوودا تـە دخـوازت

(بالجملــە) خەریـداڕێ جـەمالا تەنـە حـەققا

لـەو شـوبهەتی پیـرا ب هـەوەس طـالبێ یووسـف

دۆر هاتییـە (خـانی) کەلـەفا ڕیسـی د دەسـت دا

ئـەو ژی ب مـەتاعێ خـوە قوماشـێ تـە دخـوازت

(سـبحانک لـن تـۆیس مـن رَوحـک عبـدا)

ئەحمـەد ژ ثـەنایا تـە نـدا کـەت قـە چـو وەصـفا

(مـا أعجزنـي حمـدک أن أحمـد حمـدا)

# ئەی ئایینەئێ دل

ئـەی ئایینـەئێ دل ب جـەمالا تـە موجـەللا

سەد صەفحە ب یەک ذەررە ژ نوورا تە موطـەللا

ئنسـان تـە ژ بـۆ عالـەمێ کـوبرا کـرە نوسـخە

لـەو موضـغەیـەکێ ژێ تـو دکـی عەرشێ موعـەللا

وەحدەت ب حسـەب کثرەتێ ئـەعیانێ مـەظـاهر

هـەر سـوو ب صـفاتان دکـەتن کەشـفێ تەجـەللا

لـەو (مختلـف القـول) و عەمـەل بوونـە خـەلائق

کـافر ژ صـەنەم بوونـە ب نـاڤێ تـە تەسـەللا

سـررا خـوە نهـانی تـە کـو دا ئەحمـەدێ خـانی

(أز غیـر بـری شـد بـە تـو آورد تـولا)

## ژ لەعلێ د یارێ ئەمن

ژ لـەعلێ د یـارێ ئـەمن مـەی ڤـەخوارا

ب دل مـن دبەخشـی بەدەخشـان بوخـارا

مـودامێ د دەسـتێ غـەمان دا زەبـوونم

مـودامی دخـۆم مـەی بکـم ئـەز مـودارا

دەمـا کـر مـە عـوذرا ئـەوێ گولعـذارێ

دبـن بـێ تەکـەللوف دلـێ مـن غـەدا ڕا

هنـارن ژ بـۆ مـن دەراغـووش پـەروەر

هنـــارەک د تـــازە حـــەبیبا دلارا

نـە یـارا تـە ئیرۆ نـەظـەر دا تـە خـانی

نـە یـاران تـە مانـە نـە راحـەت نـە یـارا

# سەروا مە ب زەرزەنگ

سەروا مە ب زەرزەنگ و هەزار عشوە و مەش هات

عاشق کرن ئەحیا ل رەقیبان کو نەخوەش هات

سونبول کەملاندن گول و لالە خەملاندن

رەیحان شەتلاندن ل روخان تازە بنەفش هات

تەمن دەرقە نەبوو قەط نەددا بەختی گوشادەک

ڕوو دا مە شوکر کەعبەئێ طالع کو دوشەش هات

تیپێ د فرەنگان ب غلوو هاتنە ڕۆمێ

شوکرانە نیهانە ژ عەرەب هەم ژ حەبەش هات

ڕەشتۆزێ خوە نووبارە مە گەر گۆشە دخوازن

تیرا گۆشەئێ دا تە هەدەف گرت و ب کەش هات

یان هات و ب نیڤا دلی کەت قەط نە دوەسطا

لەورا کو ژ بەر قەوسێ مە دی زێدە ب وەش هات

خانی بەسە بێ عاری چڕا زێدەئێ سالان

ئیسالە ژ خوە طالع و بەختێ نە ب ڕەش هات

# عشوەیەك دا مە سەحەر

عشوەیەک دا مە سەحەر وێ پەرییا حووری سرشت

شەفەقا بەرقێ جەمالێ دل و جان سوهت و برشت

مە نەزانی کو مەلەک یانە بەشەر یا پەری بوو

یەدێ بەیضا وەکو مووسایی ل قەتلێ ڤەدمشت

ب تەمەننایا شەهادەت عاشقان جان برە پێش

ئەللاە ئەللاە چ غەرەضدارە کو یەک فەردە نەکوشت

(کعبە اللە)ی جەمالێ مە دکر چینە طەواف

خەیبەری هاتنە من خال و خەط و چەنبەر و قشت

علمێ ئەسما مە ژبەرکر د دبستانێ صفات

طالبێ ذاتیمە لەو من شەمراند باغێ بهشت

ئادەمێ کامل ئەزم بوویمە مسجوودێ مەلەک

موددەعی گەر نەبتن سەجدە ب من ها سەرێ خشت

خانیا دێ هەبتن بێ هونەران لاف و گەزاف

ئافەرین بەر تە کو ئەڤ شیوە ژ بۆ کەس تە نەهشت

## میرێ مەجلس نەکەنت

میرێ مەجلس نەکەنت موطربێ گۆیا چ بکەت

غونچە خەندان نەبتن بولبلێ شەیدا چ بکەت

نەینکا حوسنێ بوتان لازمە صاحب نەظەرەک

کسێ بینا کو نەبت دلبەرێ زیبا چ بکەت

بێ کەرەم ناچتە تیپا عەدوان مەردێ شەجیع

تیغێ ئاهیختە بێ دەستێ توانا چ بکەت

طالبێ علم و کەمالێ نەبتن قابلێ فەیض

حکمەت و تەربیەتا عالمێ دانا چ بکەت

طەبعێ خانی صەدەفا گەوهەرێ عرفانە وەلێ

مەتنخوانەک کو نەبت صاحبێ مەعنا چ بکەت

## أي گلبن پەروەردەء

ب زمانێ ترکی

أي گلــبن پــرورده‌ء گلــزار طــراوت

وی ســروقدن ســبزه‌ء بســتان طــراوت

وه‌جهــن بنــادر منبــر و محــراب عبــادت

زلفــن خمــی ســر حلقــه‌ء زنــار هــدايت

انســانه ده‌گلــدر بــو تصور بــو شــرافت

په په بو نه شكل و نه شمائل نه قيافت

گلــزار ارم دور چمنــى حســن و جمــالن

جنــت باغيــدر عاشــق بســتان وصــالن

ســودازده قلــدی بــن فكريلــه خيــالن

انفــاس مســيحا گبــودر فــيض مقــالن

آشــفته‌ء تعويــذ جنــون در خــط و خــالن

په په بو نه شكل و نه شمائل نه قيافت

هجــرن ألمــى جــان و دلــه درد و بــلا در

خــاكى قــدمن گوزلرمــه كحــل جــلا در

لطف ايله عزيز باشن ايچون بونه عنا در

ســاين باشــمه صــال بنــا ظــل همــا در

باللــه يــوزن آينــه‌ء نــور خــدا در

په په بو نه شكل و نه شمائل نه قيافت

ای غمزسی قانلر تو کچی لبلری خونخار
وی کبرکی مردم یقجی گوزلری خمار
رحم ایله آیا پادشهم کیم بو دلی زار
چاهی ذقنن ده نیچه بیر اوله گرفتار
حسنن کو دلی جان و دلی ایلدم ایثار

په په بو نه شکل و نه شمائل نه قیافت

رفتار ایله قدن صنما سرو خرامان
گفتار ایله جانا دهنن در درفشان
رخسار ایله سن عالمه خورشید درخشان
آغز کله لب کان گهر لعل بدخشان
بو وصف ایله خانی نیچه اولمز سنا قربان

په په بو نه شکل و نه شمائل نه قیافت

# ئەی دلا گەر تە دڤێتن

ئـەی دلا گـەر تـە دڤێـتن بیـی دائـم مسـروور

د طـەرەبخانــەێ دونیــا ڤــەخوە ئاڤــا ئــەنگورر

پـێ نـەبـە غەفلـەتێ غـەوغائێ جـەهانێ بـدڕین

ژ مـەقامێ كـو ب هـش تـێ ژ صـەدایێ طـەنبوور

زمزمــا زەمزەمــەیا راهــێ حوســەینی ژ حجــاز

ڤـەخوونت كەعبـەیێ دل تـا بتـە (بیـت المعمـور)

پـەردەئێ ظولمـەتێ عشـقا ل جـەهانێ بـدڕین

ژ نـەظـەرگـاهێ جـەمالێ تـو حجـابێ بكـە دوور

مەنظـەرێ دیـدەئێ جـانێ تـە مونـەووەر نـەبتن

نەصلێ (ما زاغ) نەكێشی تو ژ خال و خەطـێ هوور

گونـەهان گـەر نـەبویان لـەذذەت و ذەوقـەك حاشـا

فاعــل ئــاثم نـەدبوو، تــارك و تائــب مــەئجوور

مەی و مەعشووق و هەوەسبازی و دونیـایێ زوهوور

نـەبوو وانـا نــەدبوو ئسـمەكێ (اللــە)ی غــەفوور

من گونەه تێ ب گوناهان كو د نیڤ باغێ جەهان

ئـەمـەرێ خوەشـتر ئـەڤن، بـوون ب حـەرامی مشـهوور

هنگـی دەورێ فەلـەکێ سـاغەرێ مـە دەور دکـەت

مەهـ و سـالان دگـرت هـەروە ژ عـومرێ مـە قوصـوور

ڕابـە ئـەی سـاقییێ مـەهوەش تـو ژ ڕەغمـا فەلـەکێ

بـدە مـن بـادەئێ لـەعلێ تـو ژ جامـا فـەغفوور

شەیخێ جام ئەر نەفسێ هەمدەمێ دل کەت بێ موراد

ل مـورادێ دلـێ مـوردە دبـتن کەشـفێ قوبـوور

یـەعنی ئـەو خانـەئێ گـل نابتـە قابـل قـەطعـا

نـە ب چەشمێ دلـێ نـاظر نـە ب ڕوویـێ مـەنظوور

عشـقبازی دو طـەریقـن چ حەقیقـەت چ مـەجاز

شـەمعێ جـان دێ بسـوژیتن چ ب نـار و چ ب نـوور

شـەبێ ظولمـاتێ ب ئمکـانێ دبـت صـوبحێ نومـا

ئافتـابێ ئەحەدییـەت ژ فەلـەق تێتـە ظوهـوور

سـەر و مـال و دل و جـانێ مـە فـدایێ تـە بـتن

بکـە قـەلبێ مـە تـو ساقی ژ شـەرابا خـوە طـەهوور

دا بکـەم کسـبێ مـەقامات و عولـووێ دەرەجـات

یـا بکـەم کەشـفێ کـەراماتێ ژ دارا مەنصـوور

زاهـدا گـەر تـە دڤێـتن تـو خـودێ نـاس بکـی

وەرە بـەر سایەئێ شەمشـاد قـەدان قـەط مەچـە دوور

ب زیـارێ وەرە قەیـدا شـەجەرا وادیـێ قـودس

کـو بزانـی ببهـی صـیتێ (أنـا اللـە) ژ طـوور

ئــەز لــەما شــيفته و والهــێ مــەحبووبانم

كـو د نيـڤ ئايينـەئێ جەبهـەتێ وان مـن دييـە نـوور

هـەر دەمـا نـەتركێ خلخـالێ بنـێ تێنـە خـورووش

هەر دەما طـورره ژ بەر طايێ قەصەب تێتە صـودوور

يانــە كــاكول ژ كنــارێ كولــەهێ كــەج بــدەرين

يـا خـەطــێ مسـكێ برێـژ كـەت ژ كنـارێ كـافوور

كـافرێ عشــقم ئەگــەر ئــەز نــەدەمێ ئيمــانێ

يــا ب محرابــێ برووىــان نــەبرم ســەجده ژ دوور

واعظــا گوهـ بــده مــن دا ببهــى نــەقلێ صـەحيح

موصــحەفا چــەهرەئێ خووبانــە كتێبــا مســطوور

دەفتـەرێ عشـقێ نـەدا دەست تـە موعـەللم ژ ئـەزەل

مەعنـەيا ئايـەتێ حوسـنێ ل تـە لـەوما مسـتوور

بێ تەكـەللوف دخورم سـووندێ ب قورئـانێ شـەريف

خانييـا صــوورەتێ جانانــە ب مــن ســوورەئێ نــوور

# دیسان دلێ شەیدا ژ نوو

دیسـان دلـێ شـەیدا ژ نـوو
بـێ ئختیـار پـەرواز کـر
صـەیدەک دیبـە و بەردایـە دوو
مـەیل و فـڕا شـەهباز کـر
مـەیلا وی مەحضـا حکمەتـە
صـەیدا وی عـەنقا سـیرەتە
طـەیرێ وی بـالا هممەتـە
لـەورا طـەلـەب ئـەڤراز کـر
عـەنقا ب دەست کـەس ناکـەڤت
دامـەک دڤـێ ئـەو دا کـەڤت
نابـت کـو غافـل ڕاکـەڤت
ئـێ قەصـدێ صـەیدا بـاز کـر
صـەییادییا مـن بـوو عەبـەس
دائم ل مـن تـەنگ بـوو قەفـەس
راحەت نـەبووم ئەز یـەک نەفـەس
مـن لـەو ب ئـەفغان سـاز کـر

ساز و سەمایا صوحبەتێ
گۆڤەند و چەرخا دەعوەتێ
فکریمە شەکل و قامەتێ
بیر تێیە من ب ئاواز کر

شەکلێ مەجازی چەندەکە
صەیدا حەقیقی وەردەکە
تەیغوونێ قەیدا لێ ڤەکە
بەحری مە بەر ئەنداز کر

نێچیر د بێ تەیغوون بتن
چەندەک ل پێشبەر خوون بتن
شونقار نە دێ مەجنوون بتن
ئەسکۆف ژ چاڤان باز کر

شونقارە چاڤ تەیغوونە دل
بەردانە دوو چاڤێت ب کل
خانی ئەوان گێرا خەجل
لەورا مەجاز ئاغاز کر

# ئەز چوومە دەرێ مەیکەدەئێ

ئـــەز چوومـــە دەرێ مەیکـــەدەئێ صـــوبحەیەکێ زوو

مـن دی یـەکی ئەسـمەر

قامـــەت ب مثـــالێ دارێ شمشـــادێ دو گیســـوو

مانەنـــدی دو ئـــەژدەر

چـین چـین کربـوو بسـک ل سـەر گـەردەنێ روخسـار

مانەنـدی دو شـەهمار

کەرکـەر دخوەشـین زولفـێ ل سـەر قەوسـێ دو ئـەبروو

مانەنـدی دو شـەهپەڕ

مـاییم موتـەرەققب مەگـەر ئـەو مـەظـەهرێ ئعجـاز

جـارەک ب دوسـەد نـاز

حـالێ مـە تەفـەححوص بکـە بێـژە کـو ئەسـیرۆ

ئـەز بۆ تەمـە خـەمخوەر

مـن گـۆتی: د وەقتـێ سـەحەرێ ئـەو چ تـە دا مـن

ئـەی سـەروقەدا مـن

گـۆتی: تـو نزانـی چیـە مـن دا تـە فـەقیـرۆ

(أعطیتـــک کـــوثر)

حـەتتا ڤەکـە لـەوحێ صـەدەف و خامـەئێ یـاقووت

نێزیکـــی ب لاهـــووت

مـــن ســـەیرکرن ســـدرە و طـووبـا قـــەد و دلجـــوو

نیـــنن چـــو بەرابـــەر

هنـدی مەلـــەک و حـــوور و پـــەری بێنـــە تەماشـــا

(حاشـــا ثـــم حاشـــا)

کـــەنگی دبـــن ئـــەو لائقـــی نـــەظـارەئێ ئـــەبروو

ئـــەی دل مەکـــە بـــاوەر

یـــارێ ژ دەرێ مەیکـــەدەئێ مـــن مەکـــە بـــێ بـــار

ئـــەی سـەییدێ موختـــار

ســـاقی کـــو تـــووی (أشـــهد باللـــە)ی کـــو ئیـــرۆ

خـــانی بوویـــە مـــەیخوەر

# بیدای فنا گر ج بنم

ب زمانێ ترکی

بیـدای فنـا گـر چـه بـنم رهگـذرم در
عنقـای بقـا همـت همـراه پـرم در
وهـم أیلمـزم سـهم بـلا قـوس فلـک دن
أتلسـه چـو دسـتم ده توکـل سـپرم در
بـن بـاغ جهـان إیچره عجب نخل بلایم
باشـمده بـلا بـرگ و مشـقت ثمـرم در
سـاقی بکـا إمـداد قلوب فـاتح بـاب أول
میخانـه طریقنـده کـه أول سـفرم در
بـن عاشق دیـداری نـه حاجت غـم دیـوار
جنـه دخـی بـر پرده‌ئـی قطـع نظـرم در
پروانـه‌ئی پـر سـوختنه‌ئی شـمع قـدیمم
نیـران جهـنم شـرری بـال و پـرم در
آلام و جفاسـیله خوشم بـن رهـی عشقک
خـانی بکـا بـو یولـده قـدم چشـم تـرم در

## صەیدێ چەنگالا سەرێ زولفا

صەیدێ چەنگالا سەرێ زولفا شەها شەهبازم ئەز

مەستێ جاما عشوەیا شەهنازێ نازک نازم ئەز

رەمز و ئعجازێ دخوبان بێ عبارەت مەدح دکەم

مورشدێ کامل ئەزم ئیرۆهە صاحب ڕازم ئەز

بەیضەیا ئەز تێ عەبەس بوو ئاشیانا من قەفەس

گەر چ دل تێ پڕ هەوەس بوو بێ پەڕ و پەروازم ئەز

ڤێ حەیاتا حیرەتێ چ بکەم بەقا نینە ژ بۆ

لەو شەهیدێ غەمزەیا وێ دلبەرا طەننازم ئەز

دەردەمەندەک من دڤێتن هەمنەفەس بت خانییا

گەر مە هەمدەستەک هەبیتن سازێ خوەش ئاوازم ئەز

## هەر دنالم شەڤ و ڕۆژان

هەر دنالم شەڤ و ڕۆژان مەگەر ئەییوبم ئەز
هێستران هەر ڤەدمالم مەگەر یەعقووبم ئەز
ب کەرەم دەست ژ مە بەردن گول و وەردان بکن
وەر بپێچین ب جەفایێ خوە نە مەکتووبم ئەز
هندەکێ غەم هەیە دائم ل من ئەو ڤێک دکەڤن
ئەز نزانم کو ب چاڤ وان خوەیی مەحبووبم ئەز
غەم طەلەبکارێ مەیە ئەم خوە طەلەبکارێ د یار
وە طلسمێ طەلەبێ طالب و مەطلووبم ئەز
عەجەب ئقبالێ ژ من نهە خانی کو ل بال
پادشاهێ غەم و دەردان وەهە مەرغووبم ئەز

# هێدی ل ئەبریشەم بدە

هێـدی ل ئەبریشـەم بـدە ئـەی مـوطـربێ دەمسـاز
سەد دل بۆ ڤەبن بەستنە هەر یەک ب دوسەد ناز
ئـەی بـادێ صـەبا پـڕ مەهـەژین طـوررەئێ دلـدار
عوششـاقێ ب نالینـە ژ بـەر غوللـە و شـەهناز
سـاقی بگـەڕین بـادەئێ ئـەنگوور ب طـەنبـوور
جانـا بـدە مـن بووسـەیەکێ هـەروە ب دلخـواز
رووحـا مـن و سـررا د روخـێ یـارێ ب یـەک ڕا
ڕۆژا ئـەزەلی بوونـە ب دل هەمـدەم و هـەمڕاز
خانی تە غەلەط زانییە ئەو هەر ژ خوە یەک بوون
خـەللاقی تەعـەددود ب مـەظـاهر کـرە ئعجـاز

# ئەز چوومە باغێ سۆرگولان

ئـەز چوومــە بــاغێ سـۆرگولان  وەقتــێ ســەحەرگاهێ ب خــەف
مــن دی صــەدایا بولبــولان  داگرتبــوون هــەر چــار طــەرەف

صــەوتا هـــەزار و قومریـــان  دەنگــێ رەبــاب و موغنیـــان
تەشــبیهی بـــەزما بـــەنگیان  هەڤدەنگی هەڤ بوون چەنگ ودەف

مانەندی مەست و سەرخوەشان  ئـەز چوومــە بـەزما مەهوەشـان
ئـەبروو کـەمان و چـاڤ رەشـان  جـەرگ و دلـێ مـن کـر هـەدەف

پــەیگان د جــەرگی دل پــەڕی  ســنگ بوویــە صندووقا بـەری
صـەددەق ژ حوسـنا تـە پـەری  هێـژا ل مـن کـر کـەرب و گـەف

هێـژا ل مـن بـوو کـەرب و کـین  ظــاهر غــەضەب بـاطن کـەنین
لــێ غەمزەیــەک دا مـن نهـین  عـەقلێ مـە دیسـان بـر تەلـەف

دیسـان حـەبیبا چـاڤ بەلـەک  ئحسان د گەل مە بوون گەلـەک
لـەورا د گـەل زولفـێن هەلـەک  ئـالۆز مـە دیتـین قشـت و لـەف

شتری و قشت و زولـف و خـال  هـەمیان ل سـەر روخسـارێ ئـال
ڤێکـرا هـەبوون جـەنگ و جدال  لێـک ئالیا بوون صـەف ب صـەف

صەف صەف مە دی وێ کریە جەنگ    هندەک حەبەش هندەک فەرەنگ

ڤێکرا براندن وەک خەدەنگ    ڤێکرا هەبوون وان لاف و لەف

ڤێکرا هەبوون دەعوا و شەر    دەربوون ل من تیپا تەتەر

ژێک ڕاکرن قەلب و جەگەر    رهتن ژ دل خوونا ب کەف

رهتن ژ دل خوونا دلان    شەهمار و زولفێ سەرملان

بێ رەحم و مەست و قاتلان    مەی خوار ژ فنجانا صەدەف

وان مەیخوران ئەبتەر کرین    بێ قووەت و ڕەنگ زەر کرین

وەللاهـ ژ دل کەرکەر کرین    خانی بەسە ئاهـ و ئەسەف

# ئەی دل ئەگەر ب نەقدێ جان

ئـەی دل ئەگـەر ب نەقـدێ جـان
جنســێ گــران بهــایێ زولــف
دێ بکــرِی بــزان مــەجان
جەوهـەرێ جانفـدایێ زولـف
غونچــەئێ تــەنگ حەوصــلە
دل ژ رِکـــان بگرتبـــی
صـوبحەگەهان کـو سـەر دکـەت
لەخلەخـەئێ هـەوایێ زولـف
مەشـقێ دکـەت ت مەکتـەبان
رِوویـێ نگـار و حوسـنێ خـەط
بەنـده هــەزار و طفلــێ دل
هاتنـە بـەر مـەلایێ زولـف
عاشـقێ بـێ جەگـەر مەگـەر
صـەبرێ ژ جـان و دل دکـەت
مــانعێ گــەنج مەقصــەده
هەیبـەتێ ئـەژدەهایێ زولـف

هەر سەرێ موو ب سازەکی
جلوە دکەت ب نازەکی
عاشقێ عشقبازەکی
بەندە دکەت ب لایێ زولف
رۆم و فەرەنگ و هندییان
خال و نشان و خەمرییان
خەنجەر و شیر و مصرییان
جەنگە ل بەر لوایێ زولف
تاج و تۆمار و بن پەڕان
لەعل و گوهار و گەوهەران
سەرخوەش و دین و ئەبتەران
ذەوقە د گەل سەمایێ زولف
لاو و رەوال و ڕیسپییان
میر و وەزیر و جندییان
سەرخوەش و مەست و بەنگییان
دەردە ژ ماجەرایێ زولف
شەیخ و مورید و سالکان
شاه و فەقیر و مالکان
چوست و چەلەنگ و چاپوکان
دل کەتە بەندە پایێ زولف

ئـــەفعا و مـــار و ئـــەژدەرا
مســـک و زوبـــاد و عەنبـــەرا
نەفخـــــەئێ رووچـــــەروەرا
رائحـــەئێ هـــەوایێ زولـــف

بـــێ مـــەی و بـــێ دەوایـــەکی
بـــێ دەف و چـــەنگ و نایـــەکی
دیـــن دکـــەتن مەلایـــەکی
جـــەذبـــەئێ دلربـــایێ زولـــف

میـــر و مـــەلا و مـــاهران
چەنـــدی بـــەلیغ و شـــاعران
خـــانی و هنـــدی حاضـــران
دەردە ژ دەستێ طـایێ زولـف

# ئەی دلێ قەلب ناهەژی

ئەی دلێ قەلب ناهەژی یەک سەرێ موو ژ طایێ زولف

گەر نە هەژی تو پێلەکێ شوبهەتی من ل بایێ زولف

خوون و دل و جەگەر دخوون نافەفرۆش هەر سەحەر

بادێ صەبا کو تێک بدەت سونبولێ مشکسایێ زولف

غونجەئێ تەنگ حەوصەلە دل ژ رکان بکر دبست

صوبحەگەهان سەهـ دکەت لەخلەخەئێ هەوایێ زولف

مەشقێ دکەن د مەکتەبان ڕوویێ نگارێ حوسنێ خەط

هندە هەزارێ طفلێ دل هاتنە بەر مەلایێ زولف

عاشقێ بێ جەگەر مەگەر صەبرێ ژ جان و دل دکەت

مانعێ گەنج مەقصەدە هەیبەتێ ئەژدەهایێ زولف

طالبێ نوورێ غەیبیم ئەز مامە د قەید و ظولمەتە

هیڤی خودا و هممەتە حاضرێ ئەولیایێ زولف

بەحرێ جەمالێ یار ئەگەر کشتیێ تێ صەبرێ بکت

دەستێ من و تەعەللوقا دامەنێ با خودایێ زولف

طالع و بەخت گەر مە دی دەولەتێ سەرمەدی مە دی

دل کو خوە دایە بەر سها چەنک و پەڕێ هەوایێ زولف

خانییێ ژار و بێ نەوا لێ دجڤن وها ستەم

لەو دڕەڤی ژ دەرگەها شێر و شەها نەوایێ زولف

# ژ دەردێ عشقێ بەدحالم

ژ دەردێ عشـــقێ بـــەدحالم
عەجـەب بەربوویـە مـن نـارەک
وەرە جانـــا ببـــین حـــالم
نـە مـن دل مـا نـە دلـدارەک
نـە دلـدار و نـە مـن دل مـان
نـە ئالئـال و نـە سۆرگول مـان
نـە رەیحـان و نـە سـونبول مـان
د دل دا مـن خـەلی خـارەک
د دل دا مـــن خـــەلی پـــەیکان
وەرە ســەر مـــن بکـــە ئحســـان
ل گـــۆراهی رەقیبـــی مـــان
ببـین خـوەش بـوو برینـدارەک
قـــەدە دەســـتان حـــەبیبا مـــن
بکـــە دەرمـــان طـــەبیبا مـــن
بکـــە دەرمـــان برینـــا مـــن
ب دەسـت و تللـێ مویـارەک

برینـــداران بـــرین خـــوەش بـــوون

ڕەقیبـــان هـــەردو ڕووڕەش بـــوون

د باغێ حوسنێ گـول گـەش بـوون

نەکێشـــت بولبـــول ئـــازارەک

ســـــەحەر بولبـــول ب هـــاوارە

د دل دا ئـــــەو برینـــــدارە

کـــول و نـــالین ژ بـــۆ عـــارە

نـــە گـــول مانـــە نـــە گولنـــارەک

نەکێشـــــت بولبـــــول ئـــــازارێ

ل ڕەغمـــا موحبـــەتا خـــارێ

ل فەصـــــلا مـــــاهێ ئـــــازارێ

نـــەمینت قـــەط ل دل بـــارەک

ل دل بـــارێ غـــەمان بـــارە

نـــە نیســـانە نـــە ئـــازارە

هـــەرۆ خـــانی ب هـــاوارە

د دەســـتی مایـــە گوفتـــارەک

## فات عمري فى هواك

فـات عـمرى فـي هـواک يـا حبيبـي کـل حـال
آه ونـالم همـدمم شـد در فراقـت مـاه وسـال
گـر بـنم قـانم ديلرسـن چـوق دن أولموشـتر حـلال
مەست و سەرخۆشم ژ عشقێ من نەما عـەقل و کـەمال
أنـت فکرى فـى فـؤداى أنـت روحـى فـى الجسـد
لشـکر غمهـاى تـو ملـک دلـم ويـران کـرد
داده گلـدم عشـق ألـندن أيسـترم سـندن مـدد
ڤان تەتاران کرنە تالان عەقل و دين و ملک و مـال
طـال غمـى، زاد همـى، شـاع سرّى فـى المـلا
تشـنـهء جـام وصـالم چـون شـهيد کـربلا
يوقسـه سـن ديوانـه أولـدن نيجـه حـالن أى دلا
يـان ژ نووڤـه عشـوەيەک دا مـن حـەبيبا چاڤ غـەزال
بـت هجرانـاً حبيبـى لسـت منـى عالمـاً
مـردم از درد فراقـت غـافلى از حـال مـن
جـان و دل دن عـرض قلـدم حـالمى جانانـه بـن
عەرضێ حالا من تو غافل قـەط نەپرسی عەرضحال

هل لنا من نعمة الوصل حبیبی من نصیب

اوفتادم بر درت بی چاره سرگردان غریب

دردمن چوق الیک سندن اونه یوق هیچ طبیب

ئەی طەبیبێ من دەوایێ دەردێ خانی هەر وصال

## شیوەء و عشوەء و نازێد کو دلدار دکن

شـــیوەء و عشـــوەء و نازێـــد کـــو دلـــدار دکـــن

عاشـقان بـۆ چ گـەلۆ هنـدە قـەدەر هـار دکـن

گول د گەل بولبولی خوەش طەبعە و خەندانە وەلێ

بـێ وەفـایی و جـەفایا کـو دکـن خـار دکـن

هـوون مـەکن لەومـە ژ صـاحب کـەرەمان چەنـدینۆ

کـو چرانـە ئـەم و ئـەو بـێ زەرە و بـێ زار دکـن

وان دڤـێ هـەمی کـەس زێـدە ژ وان رازی بـن

لـێ رووز ب تەلـەس هنـدەکان سـار دکـن

دلبـەران گـەر نـەڤیا عاشـق و شـەیدا پـوڕ بـن

بـۆ چرا زینـەت و خـەملێ ل خوە ئـەو بـار دکـن

روحێ عاشق ڕوویێ مەعشووق ب سەر موتتەحدن

موتەعـەدد ئەرضـێ جەوهـەر ئنکـار دکـن

عـزەت و ڕوومـەتی دان جوملـە ژ بـال باخوێینـە

دا بزانـی تـو کـو نـە شاهـ و نـە خونـدکار دکـن

واجـب و لازمـە دائـم ل مـە کـەتما ئەمـەلێ

عـارف و عاقـل و دانـا ژ خـوە ئنکـار دکـن

نـە وەکـی خانییـە نـادان نەگهشـتی ئـاڤێ

پەلـەکا هلـددت یـا د دل ئظهـار دکـن

# ئیرۆ ل تەختێ دلبەرێ

ئیــرۆ ل تـــەختێ دلبـــەرێ
یـــا رەب چ شـــێرین ئەســمەرە
ژێ نـــابتن مـــن دلبـــەرێ
ئـــەو دلبـــەرە یـــا دل بـــەرە

دل بـــوو کـــو بریـــا جانـــە ئـــەو
دیـــن بـــوو وە یـــا ئیمانـــە ئـــەو
هـــەم لوطفـــە هـــەم ئحســانە ئـــەو
هـــەم لاڤـــە هـــەم گـــەردەن زەرە

کـــاکول ژ بـــەر تـــاجێ ب زەر
طـــا طـــا وەکـــی پـــڕ بێنـــە دەر
سەرعەســـکەرێ تیپـــا تەتـــەر
ســـەرداره یانـــە ســـەروەرە

یـــا رەب حـــەبیبا ڕەنـــگ فەلـــەق
جـــۆرێ تەتـــەق داگـــرت شـــەفەق
یـــا بـــەلگێ نـــوورە یـــا وەرەق
یـــا قشـــتە یانـــە چەنبـــەرە

زولفـن گـەلۆ پـوڕ پـێچ و خـەم
یــا ســونبولا بــاغێ ئـرەم
زنجیــرە یــا ســەر تــا قــەدەم
ڕەشـــمارە یانـــە ئـــەژدەرە
ئـەو طـوررە یـا گیسـۆنە ئـەو
زەنجینــە یــان هندۆنــە ئـەو
شــوترینە یــا شــەبیۆنە ئـەو
یـان تـۆغ و شـاهێ سـەنجەرە
ئەبروونــە یـا مەهــ بـوو هـلال
هندۆنــە یــا نیشــان و خـال
گیسـۆنە یـا حـەضـرەت بـلال
مەشـــغوولێ ئەللاهــ ئەكبــەرە
چـاڤن گـەلۆ یـا سـەرخوەشـن
یـــا كـــافرن یـــا دلڕەشـــن
بیمـــارن ئـــەو یـــا نەخوەشـــن
یـــا نەرگســـە جادووگـــەرە
روخســـارە یـــا رەب یـــا قەمـــەر
گوفتـــارە یـــا رەب یـــا گوهـــەر
ئـەو قەیـدە یـا رەب یـا خەبـەر
ئـەو شـەهـدە یانــە شـەككەرە

ڕوونــه گــه‌لۆ یــا وه‌ردێ ئــال

ئالالــه یــان دێمــا ب خــال

قنــدیلێ نــوورا (ذو الجــلال)

مرئاتــه یانــا مــه‌ظهــه‌ره

دێـم شووشـه نـوورا حـه‌ق د نـاڤ

ده‌و غونچــه‌یا شـێرین گــولاڤ

روخ وه‌ردێ گـول ڕه‌نگـین خونـاڤ

خـال بسـک و نیشـان عه‌نبـه‌ره

لــێڤن گــه‌لۆ یــا قــووتێ جــان

یاقووتــه یــا قــووتێ ره‌وان

یــان قۆتییــا دورجــا دوڕان

یــان حه‌وضــه یانــه که‌وثــه‌ره

یــا ره‌ب خــه‌طــێ ره‌یحانییــه

ســه‌ر ســووره‌ئێ قورئانییــه

یــان خاتــه‌ما ســولطانییه

فه‌رمانــــه یانــــه ده‌فتــــه‌ره

خــالن گــه‌لۆ یــا فــولفلن

ئـه‌و عارضــن یــان سـۆرگولن

ئــه‌م عاشــقن یــان بولبــولن

ذکــرێ مــه وه‌ردا ئه‌حمــه‌ره

ئـەو گـەردەنا شـوبهی شـەمال
سەرچەشـــــمەیا ئاڤـــا زەلال
قـــارووره یـــا خـــەمرا حـــەلال
یـــا شووشـــەیە یـــا شـــەککەره

یـــا رەب قـــەدا زیبایـــە ئـــەڤ
یـــان کەعبـــەیا عولیایـــە ئـــەڤ
یـــان (مسـجد الأقصـی)یە ئـەڤ
یـــان ســـدره یانـــە عەرعـــەره

یـــــا رەب دلـــــێ دیوانەیـــــە
یـــــا عـــــاقلێ فەرزانەیـــــە
یـــــان بولبـــــولێ وێرانەیـــــە
یـــان عـــووده یانـــە مەجمـــەره

ئـــــەو خـــــانییێ دل دادەیـــــە
مەشـــرەب ژ بـــەنگ و بادەیـــە
دەردێ وی یـــــارەک ســـــادەیە
لەو هەر ضـەعیف و ڕەنگ زەره

# م دی شەیخەك

م دی شـەیخەک ژ شـەیخێ[1] نەقشـەبەندان
قـەبوون بەنـدێ ت مـن یـەک یـەک ژ بەنـدان

گوشــادا دل ژ بــۆ مـــن ڕا مویەســـــەر
نــەبوو بــێ صـوحبەتا صـوورەت لەوەنـدان

دلـــێ مــە بـــوو د گـــەل غەوغایـــەئێ دەرد
هەژانـد شـوور و ل سـەر مـە هـات ب ڕنـدان

ل مـــن کـــورت بـــوو ڕیـــا کـــەعبا وصـــالێ
ژ شـــەکل و قامــــەتا بــــالا بلنــــدان

ئــەز ئیــرۆ سەرخوەشــم وەلاهـــی واعـــظ
ل مـــن ضـــایع مەکـــە ڤـــان وەعـظ و پەنـدان

کەســـێ گریــا بیـــت بـــەلکی ب عشـــقێ
دبیـــتن عاقبـــەت ئەلبـــەت ب خەنـــدان

مــە ســەد هیڤــی هەیــە دیســـان ژ صـــەییاد
مــە ئــازا کــەت ژ قەیـدێ قەیـد و بەنـدان

ژ ئاهۆیـــان مـــە یـــاهۆ خوەســـت ئـــەمما
دلـــێ مـــن مـــا د نیـــڤ موشـکین کەمەنـدان

---

(١) د هندەک دانەیان: م دی نەقشەک ژ نەقشێ.

هـەچی پیلـەک د عشـقێ دا عەمـەل کـر

دبیـــتن عاقبـــەت شـــادان و خەنـــدان

دلـــێ خـــانی ئەگـــەر بـــوو گـــەنج خانـــە

بـەلێ قـەط کـس نـە گـۆ خـانی ب چەنـدان

# دا ظەن نەبرن

دا ظـەن نـەبرن کـو ئـەم خەمۆشـین

ئـەم بسـتـە دەهـان و پـوڕ خورۆشـین

گـەنجا مـە د دل گوهـەر تژینـە

هـەر چەنـدە عـەیان خـەزەف فرۆشین

شـاهین و ب خـەف مـە لبسـە دیبـا

ظـاهر ژ خـوە ئـەم پەلاسـی پۆشـین

مجمەر صفەتە مە جسم و جان عـوود

دل ئاتەشـە دائمـا ب جۆشـین

مەیخانـە بهشـتـە حـوورە سـاقی

کەوثـەر مەیـە لـەو ڤـە بـادە نۆشـین

بیهۆدەیـە لافـە لـەو کـو خـانی

دونیاگـەر و ئاخرەتفرۆشـین

## دوڕدانه ژ دەڤ دا مه دبارن

دوڕدانـــه ژ دەڤ دا مـــه دبـــارن دەم و ســـاتان
کـــەس نینـــه ببـــەت وان بفرۆشـــت ل وەلاتـــان
ســـەوداگەرێ عشـــقێ پـــەریان جوملـــه دڕێـــتن
قـــەطعـــا و صـــەعالیکێ زەمـــانێ فەتـــەراتان
قـــەط گەوهـــەرەکی جەوهەریـــەک نینـــه بها کـــەت
بـــازارێ جیهـــان مایـــه ب ڤـــان تورکمـــەن و تاتـــان
عـــەبدێ ذەهـــەبن هندەک و هنـــد عابـــدێ فضـــه
عاشـــق دەریانییـــه ژ عیـــد و عـــــەرەفاتان
مەعشـــووقه جـــەمادات و عاشـــق ب خـــوە حـــەیوان
ئینســـــان برییانـــه چ خەبـــەر دەم ژ نـــــەباتان
کوففـــاری بـــوو دەم دایـــه حصـــارێ و مـــه خونـــدکار
هێـــژ وێ ل شـــــکارێ دگـــەڕیتن ل فـــــەلاتان
بەگلەریـــەگی و میـــر و وەزیـــر جوملـــەئێ پڕ تـــێن
کوففـــاری و خونـــدکاری غـــەضـــەب کـــر ل فوراتـــان
ئیســـلامی ل جـــەنگێت مـــه بـــی بـــۆچی زەبوونـــه
لـــەورا کـــو کـــەرەم نینـــه حوماتـــا کـــەلیماتان
ڕوودایـــــه عمـــــاراتێ مولـووکـــــان ب ئیســـراف
میـــرێ پســـییان نادەتـــه خـــەلقێ خـــوە خـــەلاتان

میرێـــت مەهمـــەدانی خـــوە دوبەندینـــە د خـــائن

عیســـێنە ل مووســـایی دخـــوونن صـــەلەواتان

خـەلقێ مـە هـەکاری وە دبیـتن کـو ژ بـۆ شاهــ

حینـــا ســـەفەران ئـــەو دشـــەهینن ئـەدەواتان

مێـــرێ نـــەمـــران وێ دمـــریتن ژ فـــەقیری

شـێروان و مـــوکس بووینـــە موحتـــاجی زەکاتـــان

یـــا رەب تـــو بپـــارێزە د ڤـــێ عەصـــرێ قزلبـــاش

طـوغیـــان و خـــورووجێ نەکـەن ئـــەو بێنـــە وەلاتـــان

کـی دێ ل ڤـێ سـەرحەددێ ژ پێش وان ڤـە بوەسـتت

کـەس نینـە کـو تێـر نـانی بـدەت پێـنج غوزاتـــان

یـــا رەب ب دوعـــایێ نـــەبیی ئـــو وەلییـــان کـــەی

ب ئنجیـــل و زەبـــوور و فورووقـــان و تـــەوراتان

یـا رەب ب مـەکێ کـەی ب مـەدینێ ب طـەوافـێ

یـا رەب ب حـەقێ سـەعی و ووقـووف و عـەرەفاتان

یـا رەبـی ب لـەوح و قەلـەم و کورسـی و عەرشـان

یـا رەب تـو ب مولـک و مەلـەکووت و سـەمەواتان

یـا رەب تـو ب تەوحیـد و ب تەسـبیح و ب ذکـران

یـــا رەب ب دوعـــا و ب صـــەلات و صـــەلەواتان

خونـدکاری ل کوففـاری موظـــەففـەر بکـە دیســـا

دا شاهـــ ژ ترســـان ل عومـــەر دەت صـــەلەواتان

نــــاقووس و صـــــەلیبێ د فـــەرەنگان چ رەوانـــــە

ئــەو بــێن بگــرن جوملــە جهــێ بانــگ و صــەلاتان

چەنـــدین د رجـــالان بشــــەهینە تـــو ژ غــــەیبێ

ئیســـالە ســـەفەرکێش بـــدە خـــەلقێ خەلـــەواتان

پامـــالێ ضـــەلال بێتـــە د نـــاڤ حـــۆزەئێ ئیســـلام

قـــەط لائقـــە ئـــەی خـــالقێ نـــوور و ظولوماتـــان

خـــەلقێ بـــەدەوان گـــەر چ مـــرن چوونـــە بەحەشـــتێ

حـــەیفا مـــە ل ئبنـــان و خـــەواتین و بـــەناتان

مورتـــەد بـــبن ئـــەو جوملـــە بمیـــنن د گرفتـــار

تـــەرکا تـــە بـــدەن ئـــەو بپەرســـتن بـــوت و لاتـــان

ئـەڤ چەنـدە تەفاسیر و مەصاحف ب تـەلف چوون

حورمـەت چـو نـەما ئایـەت و حـەرف و کـەلیماتان

ئـەی مەعشـەرێ ئیسـلامێ هـەمی صالح و طـالح

وەی عـــادل و فاســـق ژی بخـــوازن دەعـــەواتان

هەر کەس ب قەدەر حالی بکەن کەسب و تەقەرروب

ب ئصـلاحێ نوفووسـان دبـتن وەصـل و لقاتـان

دا مونتـــەقمێ قـــادرێ قـــەییووم ڤـــەخوازت

دادا مـــە ژ کوففـــار و ژ فوججـــار و بوغاتـــان

هنـــدی دکـــەتن خـــانییێ بێچـــارە گوناهـــان

یـــا رەب تـــو بـــەدەل وان بنڤیســـە حەســـەناتان

# کان پادشاهێ سەرحەدان

کانێ موحەممەد بەگ گەلۆ | کان پادشاهێ سەرحەدان؟
ئیرۆ ژ دل بگرین دە لۆ | کان پادشاهێ سەرحەدان؟

ئیرۆ ببینن عیبرەتێ | ئاغا و خەلقێ هێشەتێ
کانێ خودانێ غیرەتێ | کان پادشاهێ سەرحەدان؟

میرێ د نێڤ میران ب ناڤ | ئەشهەب سوارێ ڕم زراڤ
بالا بلندێ پەڕ بەلاڤ | کان پادشاهێ سەرحەدان؟

کێ دی وە ڕەنگ ذاتەک شەریف | ئەرکان و ئەزمانەک لەطیف
عالەم د دەست وی بوو ضەعیف | کان پادشاهێ سەرحەدان؟

کۆما دمل بوو سێ هەزار | سەد میرەکان ڤێکرا دو جار
ژێک ڕاکرن کر تار و مار | کان پادشاهێ سەرحەدان؟

سەنجەق ژ سەر قەرسێ بڕی | بدلیسییان وان ژێ کڕی
خانێ دمل کربوو چڕی | کان پادشاهێ سەرحەدان؟

کانێ عەزیزێ مصرییان | کانێ عەدووێ وانییان
کان هەڤرکێ مەحموودییان | کان پادشاهێ سەرحەدان؟

کانێ ئەمیرێ نامدار | سەرحەد نشینێ خوندکار
پاشان ژ بۆ پێشکێش هنار | کان پادشاهێ سەرحەدان؟

کـانێ ئـەمیرێ (ذو الفنـون) کـان عـاقلێ طبعـەت جونـوون
عالـەم ل بـەر وی بـوون زەبـوون کـان پادشـاهێ سـەرحەدان؟

د علمێ خوە ئەو عەللامـە بـوو بـەهرامێ گولگـوون جامـە بـوو
قـەتتالێ پـرِ هنگامـە بـوو کـان پادشـاهێ سـەرحەدان؟

چەنـد میـر و حـاکم رِاکـرن چەنـد خـان و سـولطان داکـرن
کـۆم و حەشـەم بـەرباکرن کـان پادشـاهێ سـەرحەدان؟

ئـەو حـاکمێ پـرِ نـاڤ و دەنـگ هەمطەبعەتێ تـەیموورێ لـەنگ
دەعـوە دکـر بچمـە فـەرەنگ کـان پادشـاهێ سـەرحەدان؟

پـێلا کـو وی دیـوان دگـرت خـەلقێ ئـەدەب ئـەرکان دگـرت
هەیبـەت ژ وان دیـوان دگـرت کـان پادشـاهێ سـەرحەدان؟

وەقتێ ب سـەر هەسپی دکـەت شـەش جانبـان رەڤ پـێ دکـەت
هەیبـەت ب سـەر خـەلقێ دکـەت کـان پادشـاهێ سـەرحەدان؟

دائـم عەدالـەت پیشـە بـوو غایـەت دەقیـق ئەندیشـە بـوو
نـازک طـەبیعـەت شیشـە بـوو کـان پادشـاهێ سـەرحەدان؟

دیـوان و عـەدل و دادگیـر ئـذعان پـرِ و رەوشـەن ضـەمیر
حـەتتا خوەشـین نـاکن ژ بیـر کـان پادشـاهێ سـەرحەدان؟

دیـوان و ئـەیوان شانشـین ئـەو صـەدر و حەوضێد نازەنین
مـان شـوبهی فردەوسێ بـەرین کـان پادشـاهێ سـەرحەدان؟

| | |
|---|---|
| فەرشێ د دیبا و حەریر | ئستەبرەقێت وی بێ نەظیر |
| بێ ئختیار مایین ژ میر | کان پادشاهێ سەرحەدان؟ |
| ئەڤ غالیەت ئەرمووش و قەز | وەرناگرت کەس شوبهی خەز |
| خالی بوویین مەیدان و ڕەز | کان پادشاهێ سەرحەدان؟ |
| ڕەز بوو میثالا جەننەتێ | ئەیوان ژ صونعێ قودرەتێ |
| کەس نینە تێ کەت شوبهەتێ | کان پادشاهێ سەرحەدان؟ |
| ئەلماس و لەعل و گەوهەران | تۆمار و تاج و بن پەڕان |
| حەد نینە بێخمە دەفتەران | کان پادشاهێ سەرحەدان؟ |
| سەد مەعنەک و هەسپێد بەدەو | صافی حودوود زێڕێن جەلەو |
| کەس نینە وان ڕاکەت ژ خەو | کان پادشاهێ سەرحەدان؟ |
| ئەو شەهنشین و حەوض و ئاڤ | نێچیرگەهێ پڕ صەید و ڕاڤ |
| نابت ببێژم ئەز ب ناڤ | کان پادشاهێ سەرحەدان؟ |
| شاهینشەهێ گەردەن فراز | ئازاکرن تەیهوون و قاز |
| تەرخان کرن تەیغوون و باز | کان پادشاهێ سەرحەدان؟ |
| میرێ مە وێ نابت سوار | تێربوویە ئەو ناچت شکار |
| تەیغوون و تەرلان مان ل خوار | کان پادشاهێ سەرحەدان؟ |
| سەرداریا کۆما گەلەک | ناکت سوارێ چاڤ بەلەک |
| چاڤەت سپی بن ئەی فەلەک! | کان پادشاهێ سەرحەدان؟ |

طـــاق و ڕەواق و مەنظـــەران | کۆشـک و خـەلات و خەیـەران
وان جوملـە نیشـان حەیـدەران | کـان پادشـاهێ سـەرحەدان؟

ئـەو جوملــە وی ئیجــادکرن | هـەر چەنـد قـەوی بنیـادکرن
چــەرخی هەژانـد بـەربادکرن | کـان پادشـاهێ سـەرحەدان؟

خـواهێ کـەلاتان ب ظـەفـەر | دوژمـن ژ بـەر وی بـێ مەفـەر
وێ چوویـە نیڤـا ئـاخ و بـەر | کـان پادشـاهێ سـەرحەدان؟

دونیـــا دبــــۆریتن ب دۆر | عـومرێ عـەزیز نـادن ب زۆر
دەولـەت دبـێن ناچیتـە گـۆر | کـان پادشـاهێ سـەرحەدان؟

یـا ڕەب هـەبت ئۆچـاخ قـەدیم | عەممێ د وی خوەش بن عەمیم
(بالخاصــە) ئـەو دوڕا یـەتیم | کـان پادشـاهێ سـەرحەدان؟

دوڕدانـەئێ گەوهـەر صـەدەف | ئـەو مـا ژ وی نەسلی خەلـەف
یـا ڕەب نـەکی وان زوو تەلـەف | کـان پادشـاهێ سـەرحەدان؟

خــەلقێ خــودانێ دەولــەتێ | وێ چوویـە مـالا ظولمـەتێ
ب وی ڕا بخــوونن ڕەحمــەتێ | کـان پادشـاهێ سـەرحەدان؟

خـانی تـو ژی دەسـتان هلـین | هـەر چەنـد کـو زێـدە دلکـولین
ئیـرۆ ژ بـۆ میـر سـائلین | کـان پادشـاهێ سـەرحەدان؟

ئـەو میـرێ ئەحمـەدێ خانی ئەڤ شعرە ب مرنـا وی ڤەهانـدی میـرێ کـەلا بایەزیدێ بوو نـاڤێ وی محەمـەد بـەگ بـوو و مرنـا وی ل سـالا ١٠٩١ مشـەختی (١٦٨١ ز) بوو.

## گەر گونەهكارین

گەر گونەهكارین ژ بۆ ئسمێ غەفوور ئەم مەظهەرین

وەر ستەمكارین تەماشاگاهێ ئەهلێ مەحشەرین

پڕ گوناهان گەر تو دێ مەهدەر بكی (یوم الحساب)

(أی شفیع المذنبین) ئەم بۆ تە ڕا سەردەفتەرین

گەر غەفووری ئەم نەبەخشین و شەفیعی ئەم نەدین

كار و بارێ مە كە مالك بۆ تە ڕا سەرعەسكەرین

دۆزەخ و جەننەت ل نك مە هەردو یەكسانن ب حال

عاشقێ دیدارێ یارین پەروەرێ پێغەمبەرین

گەر جەمالا بێ زەوال ئەم دێ نەبینین بێ حجاب

دار و دیوارێد رضوان خانی ئەم پێ كوو بكەرین؟

## زاهدێ خەلوەتنشین

زاهــدێ خەلوەتنشـــین پابەســـتێ کـــردارێ خوەیـــە
تـــاجرێ رحلـــەتگوزین دلـــدارێ دینـــارێ خوەیـــە
عاشـــقێ دلبەرحـــەبین دلـــدایێ دلـــدارێ خوەیـــە
دا بزانی هەر کەسەک بێ شوبهە غەمخوارێ خوەیە

بێ عەمەل تو ژ کەس مەکە هیڤی عەطاء و هممەتێ
بێ غەرەض ناکێشتن قەط کەس ژ بۆ کەس زەحمەتێ
کەس نەهن قەط هلگرت بارێ تە ئەو بێ ئوجرەتێ
گەر چ عیسا بت ئەوی فکرا کەر و بارێ خوەیە

هۆشیار بی! دا نەکی عومرێ خوە بێ حاصل تەلەف
لەو کو نادەت فایدە مال و گەنج و ئەولاد و خەلەف
ماجەرایا خضـر و دیـوارێ یـەتیمی بـوو سـەلەف
ڤی زەمانی هەر کەسەک معمارێ دیوارێ خوەیە

جا نەظەر کە تو ب پێلا کو وە واقع بت سواش
گـەر نـەبیتن ئلتفـات و مژچـە و دەبـر و مـەعاش
جنـدییێ رمبـازێ فـارس نـادەتن جـانی بـەلاش
سـاعەتا سـەربازییێ هیڤـی ژ سـەردارێ خوەیـە

خانییا ضائع نەکەی عومرێ خوە ئەی نادان عەبەس

بێ طەلەب نابی ژ وەصلێ بەهرەمەند ئەی بوولهەوەس

صانعێ موطلەق کو نینە ئحتیاجەک وی ب کەس

لوطف و ئحسان ژی ئەوی دەرحەق طەلەبکارێ خوەیە

# دلا قەط نینە مەحبووبەك

دلا قـــەط نینــــە مەحبووبـــەک
ژ تــــە جوزئـــەک نـــەبت لالـــی
دلارامـــــا نـــــە مەجذووبـــەک
هەیـــە ســـررا تــــە ژێ خـــالی

ئەگـــــەر ســـــررا د قەلبانــــــە
وە گـــەر نـــوورا د وەجهانــــــە
ب من یەک ڕەنگ و یەک طانە
د گـەل یـەک بـوون ل وی ئـالی

ژ غـــەیبێ ئـــەو ب یـــەک هـــاتن
هـــەمی جـۆتن نـــە تـــەک هـــاتن
وەکـــی چاڤێــت بەلـــەک هـــاتن
ب هـەڤ کـەت شـاهی و طـــالی

ئەگـــەر حوســنە ئەگـــەر نـــوورە
ئەگـــەر نێزیـــک ئەگـــەر دوورە
برینـــــا عاشـــــقان کـــــوورە
ژ ســـــەرتیرا کـــــوڕێ زالـــــی

ژ سەرتیرا موجەوهەر بوو
چ ئاور بوو چ خەنجەر بوو
ژ بۆ من ڕا موقەددەر بوو
دەما پفکرنە صەلصالی

وە گەر صەلصال و فەخخارم
تژی نوورم تژی نارم
د باطن شوبهی خونکارم
ب ظاهر کەتمە وی شالی

گەلەک شال جەوهەر و زیبا
گەلەک ئەطلەس گەلەک دیبا
گەلەک سیم و گەلەک شیبا
مە هاڤێتن بکر نالی

بکر نالی مە هاڤێتن
هەمی یەک یەک هلاڤێتن
گەلۆ کی بت کو ناڤێتن
حەبیبەک چاردە سالی

مەگەر هەر من دڤێ دلبەر
دوسەد علمان بکەم ئەزبەر
ژ خلخالان دبت ئەبتەر
مەلا مەقصوودێ خلخالی

مەلا مەقصوودێ من خالە
نە ملک و مەنزل و مالە
نە علمێ قالە ئەو حالە
مە حاصل کر ب ئەبدالی
مە حاصل کر ب خیزانی
ب موشتاقی و حەیرانی
وەکی گەنجا د وێرانی
مە پەیدا کر ب رەممالی
ب رەممالی مە پەیدا کر
دلێ غەمگین مە پێ شا کر
(نقی الخد) مە ئازا کر
وەکی پیرا دوسەد سالی
(نقی الخد) و لحیانن
بەرات و ئەمر و فەرمانن
ب طوغراء و ب نیشانن
د دەست عوششاقێ دەللالی
د دەست دەللالی دا من دی
روخێ کاغد سەمەرقەندی
خەطێ کووفی نوقەط هندی
کتابا حوسن و ئەشکالی

کتابا حوسن و دلبەر بوو
خەطێ (الله أکبر) بوو
مەلایێ گۆ ژ ئەزبەر بوو
ل تەختێ دل دبت والی
ل تەختێ قەلبی سولطانە
دلێ وی عەرشێ ڕەحمانە
وەکی خانی نە نادانە
دزانت ئەو ب ئەحوالی
ب ئەحوالی خەبەردارە
ب صوورەت شەکلێ دلدارە
د باطن عەینی دیدارە
(تعالی شأنە العالی)

# دلۆ ڕابە خوە دلخوەش کە

دلــۆ ڕابــە خــوە دلخــوەش کــە
هلـــۆ دا بچینـــە ســـەیرانێ
وەرە جارەک تـو خـوە ب وەش کـە
بچـــین ســـەیرا گولســـتانێ

گولســـتانا کـــو ســـۆرگول تـــێ
ســەمەن نەسـرین و ســونبول تـێ
هــەزار بولبــول ب غولغــول تــێ
د فەصـــلا مـــاهێ نیســـانێ

د فەصـــلا جـــادوی نیســـان
مــە دی بــوو دلبــەرەک دیسـان
ب دل مشـــعەل چـــرا ئیســـان
مـە جـان دا شـوبهی پـەروانێ

مـــە جـــان دا دلبـــەرەک ســـادە
لـــەطیـــف و شـــۆخ و بـــەگزادە
ژ قەیـــدان کرمـــە ئـــازادە
نهـــان خوەندیمـــە دیـــوانێ

نهـــانی خەلوەتـــەک دا مـــن
ژ لـــەعلان شـــەربەتەک دا مـــن
ب وەصـــلێ صـــوحبەتەک دا مـــن
کـــرم بەنـــدە د فـــەرمانێ

د فـــەرمانێ کـــی صادق بـــت
ئـــو نـــاخوازی مونـــافق بـــت
دڤـــێ هـــەردەم موافـــق بـــت
وەکـــی شـــەیخێ د صـــەنعانێ

وەکـــی شـــەیخی د هـــادر بـــت
د فـــەرمانێ دە نـــاظر بـــت
ب ئـــەمرێ دۆســـتێ کـــافر بـــت
بســـۆژی صـــوحفێ قورئـــانێ

دســـۆژم صـــوحفێ مەکتووبـــە
ب ئـــەمرێ یـــار و مەحبووبـــە
دەمـــا دل دەم ب مـــەطلووبـــە
ددەم ئـــەز دیـــن و ئیمـــانێ

ئەگـــەر دلبـــەر مـــەجازی بـــت
ژ ڕەنگـــێ لبســـێ غـــازی بـــت
بـــلا صـــووفی نـــەرازی بـــت
بمینـــە ئـــەو د حرمـــانێ

بنــێ صــووفی قــەوی دینــە

وەکــی خەففاشــێ مســکینە

ل نــک وی ڕۆژ تــو ڕەنــگ نینــە

چــو نابینــت ژ عومیــانێ

دلــێ وی کــۆرە ئەعمایــە

ژ وەصــلێ دوورێ دامایــە

ل بــەر وی دەرگــە دادایــە

نەهشــتە بێتــە دیــوانێ

د دیوانــا کــو قەرقــەف تــێ

ب بــەزما هــەر نــەی و دەف تــێ

مــەلائک ســەد هــەزار صــەف تــێ

ئــەزم یــێ هــاتی مەیــدانێ

ئــەزم ســەرخوەش ژ وێ جــامێ

ئــەزم ســەودا د نێــڤ عــامێ

ئــەزم عــەنقا کــەتی دامــێ

ب زولفــا ســەر ل خــال دانــی

ب زولفــا هــاتی ســەر خــالان

بنەفشــا تیتــک و ئــالان

دل و جــانێ مــە عەبــدالان

دبــت دیســا ب تــالانێ

د تالانـا کـو سـەد سـەر چـوون

هـەزاران گـەنج و گەوهـەر چـوون

دلـێ سـەد پـارە کەرکـەر چـوون

تـو خـانی بـەس کـە ئـەفغانێ

## هەرۆ سەد جار ژ ئولفا وێ

هـەرۆ سـەد جـار ژ ئولفـا وێ
دبـم کـەیفێ ل مــەیخانێ
ڤـەبیر مـن تێـت زولفـا وێ
دنــالم ئــەز ژ هجرانـــێ
ژ سـەهما عـەقرەب و مـاران
دنـالم ئـەز گـەلی یـاران
ژ چەهڤان خوون دچیت باران
وەکـی ئـەو تێنـە لێکـدانێ
وەکی ئـەو تێنـە سـەر بـالان
ببیـــنن نوقطـــە و خــالان
بنــەفش و تــەرحێ ئــالالان
د ســەر دا مــاهێ تابــانێ
د سـەر دا ئـەو مـەها ئـەنوەر
ژ رەیحـان سـونبولان دا سـەر
کـرم سـەودا و هـەم ئەبتـەر
ژ مــن دل بــر ب تــالانێ

ژ مــن دل بــر ئــەڤێ جارێ
کــو مــن دی قامــەتا یــارێ
وەکــی ســەلوێ ل جۆبــارێ
ڤەمەشــیا هاتــە ئــەیوانێ

ڤەمەشیا یــا صــفەت حووری
ژ ڕەنگـــێ ســـۆرگولا ژۆری
رحــێ شــێرین دکــەم گــۆری
ژ بــۆ خــالێ و نیشــانێ

ژ وان خـــالان تەجــەللێ دا
عــەطــارود بــوو د بــورجێ دا
دلــێ مــن کێزمەیــەک لێــدا
ب شیر ئــەو هاتــە مەیدانێ

ب شیر هات ئەو پەری پەیکەر
شــەڤی ماهــا تــژی ئــەنوەر
ل مــن دا بــاطنی خەنجــەر
دنــالم ئــەز ژ ئێشــانێ

ژ وی دەربــی یــێ گێــژم ئــەز
شــوبی بلبــل دبێــژم ئــەز
ژ چــەهڤان خــوون درێــژم ئــەز
وەکــی طــاڤێ ت بــارانێ

ژ چـــەڤان خـــوین دبـــارینم
ژ عشـــقا تـــە ئـــەزێ دیـــنم
شـــوبی فـــەرهاد و مـــەجنوینم
دبێم: لـــەیلا گـــەلۆ کـــانێ

خـــەریبم ئـــەز ژ لـــەیلایێ
نـــەهن وەک تـــە ل دونیـــایێ
بچیتـــــە بیتـــــە زیبـــایێ
کـــو عاشـــق وێ د زینـــدانێ

کـــو عاشـــق وێ دنـــالیتن
شـــەڤ و ڕۆژان دکـــالیتن
ژ چـــەڤان خـــوون دمـــالیتن
مەجالـــە بێتـــە زۆزانـــێ

مەجالـــە مـــە نـــەکر کـــارەک
ل ســـورمە وێ هـــەبوو مـــارەک
ڤەرێکـــەم ئایـــەتێ جـــارەک
د گـــەل بـــایێ شەبســـتانێ

د گـــەل بـــایێ ســـەحەرخێزێ
ببێـــــژە عەنبـــــەر ئـــــامێزێ
تە عاشق کوشت ب ڤێ ڕێزێ
بکـــە لـــوطفێ و ئحســـانێ

کو من دی بوو ل سەر بانی

دبێـژت: ئەحمـەدێ خـانی

بـدە رووحـێ د گـەل جـانی

دبێـژم ئـەز: بگـر.. هـانێ!

## ئەی دەریغا مامە تەنها

ئـەی دەریغـا مامـە تـەنها ئـەز ژ شەمسـا خـاوەرێ
خان و مان تێک بوونە ظولمەت پاشی وێ دێم ئەنوەرێ
بـێ قـەرارم شـوبهی زیبـەق بـێ ئـەوێ سـیمەنبەرێ
پاشـی لێڤێـت وێ ڤـەناخۆم موطلـەق ئاڤـا کەوثـەرێ

گـەر بـزانم ئـەز د حەشـرێ دا نـەبینم دلبـەرێ
دێ چ لـێ کـەم جەننـەتێ پـێ وەر بکـەم خاکسـتەرێ

سـەد مخابن چوو ژ بـال مـن ئـەو حـەبیبا چاڤ بەلـەک
ئاهــ و ئـەفغانم شـەڤ و ڕۆژان تچـن حـەتتا فەلـەک
وێ ژ فـەریادێ د مـن عـاجز دبـن ئـنس و مەلـەک
مـام د قەیـدا داغ و دەردان پاشـی وان زولفێـت هەلـەک

گـەر بـزانم ئـەز د حەشـرێ دا نـەبینم دلبـەرێ
دێ چ لـێ کـەم جەننـەتێ پـێ وەر بکـەم خاکسـتەرێ

هجرەتـا یـارێ بهـاتم شـوبهی فنـدا شـوعلەدار
کەتمـە حـالێ ئفتراقـێ ژ ئحتراقـێ بوومـە نـار
ئەو ووجوودا بێ ووجوودە سوهت و تێکدا بوو غوبار
من نـەڤێ دونیـا ب جارەک پاشی وان چاڤێت خومـار

گـەر بـزانم ئـەز د حەشـرێ دا نـەبینم دلبـەرێ
دێ چ لـێ کـەم جەننـەتێ پـێ وەر بکـەم خاکسـتەرێ

گـەر د حینـا ئـەز وەفـابم بێتـە سـەر مـن عزرەئیـل
موژدەیـا خولـدێ د وێ گـاڤێ بـدەت مـن جبرەئیـل
خضرێ فـەرروخ بـێ ژ مـن ڕا ئـەو د وێ ڕێ دا دەلیـل
دێ ببێـژم مـن نـەڤێتن خولـد و کەوثـەر سەلسـەبیل

گـەر بـزانم ئـەز د حەشـرێ دا نـەبینم دلبـەرێ
دێ چ لـێ کـەم جەننـەتێ پـێ وەر بکـەم خاکسـتەرێ

چـەرخێ کـەچ رەفتـارە وا وەیـلا! کـو ئـەز حـەیران کـرم
سـەر ب گـەردان بـووم وەلـێکن زێـدە سـەرگەردان کـرم
بـێ دل و عـەقل و هـەوەس جـارەک کـو بـێ ئذعان کـرم
زێدە ڤـێ بـێ مروەتـێ ئـەڤ ڕەنـگ کـو ئـەز تـالان کـرم

گـەر بـزانم ئـەز د حەشـرێ دا نـەبینم دلبـەرێ
دێ چ لـێ کـەم جەننـەتێ پـێ وەر بکـەم خاکسـتەرێ

زینهـار ئـەی دۆسـتان وەقتـێ بکـم ئـەز هجرەتـێ
ڤـان دو مصـراعان کتابـەت کـن ل پـەرکێ کاغـەتێ
دا د دەسـت مـن دا سـەنەد بت ئـەو د بـەیتا ئاخرەتێ
عەرضوحالێ مـن ببت مـەضموون ژ حینـا حەضرەتێ

گـەر بـزانم ئـەز د حەشـرێ دا نـەبینم دلبـەرێ
دێ چ لـێ کـەم جەننـەتێ پـێ وەر بکـەم خاکسـتەرێ

خانییا ئەڤ هەرزە گۆیی وە خەطاء و نە صەواب
خێر ژ تە صادر ببن ئەی بێ ئەدەب ئەی بێ حجاب
ئەڤ قەضایا بارییە راضی ببە ئەی مال خراب
بەلکی بیتە مووجبێ ناری ژ بۆ تە ئەڤ جەواب

گەر بزانم ئەز د حەشرێ دا نەبینم دلبەرێ
دێ چ لێ کەم جەننەتێ پێ وەر بکەم خاکستەرێ

# تاریخا ئاڤاکرنا
# مزگەفتا خانی

ل نێزیک زیارەتێ ئەحمەدێ خانی مزگەفتەک هەبوو ئەڤ هەر سێ مالکە ل سەر دیوارێ وێ هاتبوونە نڤیسین، کو ژ ڤەهاندنا ئەحمەدێ خانینە، و دیرۆکا ئاڤاکرنێ ب حسێبا ئەبجەدی ژێ دئێتە وەرگرتن، کو سالا ١٠٩٧ مشەختی ١٦٨٥ زایینییە.

مەحضا ئەڤرا خەیرێ نەدهات ژ دەستێ ئەحمەد
تەوفیق نەدایا وی پادشاهێ ئەمجەد
گولبانگێ ژ غەیبێ هات ئەڤ رەنگە تاریخ
مەعبوود عنایەت کر چێبوو ئەڤ مەعبەد
هاتف آندختی مارا ناگهان در سامعه
جامع التاریخ اللفظ (الصلاة جامعه)

# تاريخا ئاڤاكرنا
# مزگەفتا بايەزيدێ

هەر وەسا ل سەر دەرگەهێ مزگەفتەکا کەڤن ژی ئەوا ل بن کەلا بایەزیدێ هەی ئەڤ هەر دو مالکە ب فارسی ژ ڤەهاندنا ئەحمەدێ خانی هەبووینە، و دیرۆکا ئاڤاکرنێ ب حسێبا ئەبجەدی ژێ دئێتە وەرگرتن، کو سالا ١٠٩٣ مشەختی ١٦٨١ زایینییە.

آباد بو برشک أهل بایزید
سیف بردی از محمد بایزید

لعلی زرین شمشیر تیز
تاریخ ژ محمد هزار مزید

## شعرێن بەرگومان (مەشكووك)

ئەڤ هەر شەش شعرێن کو مە ل ڤێرێ دانایین ژ وان شعرانە یێن ئەم ژ پالدانا وان بۆ ئەحمەدێ خانی نە دپشتراست، بەلێ ژ بەر کو مە د هندەک ژێدەرێن دەستنڤیس دا دیتییە کو ئەو یێن خانینە، یان ژی ئەو د هندەک دەستنڤیسان دا د ناڤ شعرێن خانی دا هاتینە، و مە د چو ژێدەرێن دی دا نەدیتییە کو ئەو شعر یێن هندەک شاعرێن دی بن، مە ئەو ل ڤێرێ دانان، بێی کو ئەم پالدانا وان بۆ خانی مسۆگەر بکەین، و بەلکی د پاشەرۆژێ دا و د گەل دیتنا هندەک دەستنڤیسێن دی مەسەلە پتر ل بەر مە روهن و زەلال ببت.

# کانی موحەممەد موصطەفا

کان مەعدەنا صدق و صەفا
کانی عەطا جوود و سەخا
بەحرا کەرەم کانی وەفا
کانی موحەممەد موصطەفا

کانی گەلۆ شاهێ لەطیف
کان قامەتا شوبهی ئەلیف
مسکەن د نیڤ رەوضا شەریف
کانی موحەممەد موصطەفا

کانی گەلۆ شاهێ عەرەب
کان صاحبێ ئەصل و نسەب
موعجز ژ بۆ پورِ بوون عجەب
کانی موحەممەد موصطەفا

موعجز ژ بۆ پورِ بوون گەلەک
هەفت ئاسمان هەم نەهـ فەلەک
خادم ژ بۆ وی بوون مەلەک
کانی موحەممەد موصطەفا

خـــادم ژ بـــۆ وی جبرەئیـــل

مەنسووخکری تـەورات و ئنجیـل

مـســکەن ژ بـۆ وی سەلـســەبیل

کـانی موحەمـمـەد موصـطـەفا

بال خوە ڤـە خواند (بلا مکان)

تــەعلیم ددا ژ بـــۆ وی قورئـــان

بـــێ حـەرف و ئـەلفاظ و زبـــان

کـانی موحەمـمـەد موصـطـەفا

کـــانی گـــەلۆ (أبـــو الرفیـــق)

(ثـم استوی علـی الطریـق)

کـــانێ ئـــەبوو بـــەکرێ صـــەدیـق

کـانی موحەمـمـەد موصـطـەفا

کـــانی (أمیرنـــا البـــواب)

کـــانی گـــەلۆ کـــەهفێ صـــەحاب

کـــانی (عمـــر بـــن الخطـــاب)

کـانی موحەمـمـەد موصـطـەفا

کـــانی (أمیرنـــا الزمـــان)

کـــان جـــامعێ جوملـــە قورئـــان

کـــانی (عثمـــان بـــن عفـــان)

کـانی موحەمـمـەد موصـطـەفا

کـــانی گـــەلۆ ذاتـــێ کـــەرار
کـــان فـــاتحێ صـــەففا کوفـــار
کـــانی عـــەلی (مـــن الأخیـــار)
کانی موحەممەد موصطەفا

ب حـــەرفێ ئەلفاضـــێ رەئـــووف
ئەو ڕەنگێ وە گۆتی و عەطووف
(إنـــي رحـــيم هـــم غفـــور)
کانی موحەممەد موصطەفا

کـــانێ گـــەلۆ ئـــەو پێغەمبـــەر
کـــانێ ئـــەبا بـــەکر و عومـــەر
کـــانێ عوثمـــان کـــانێ حەیـــدەر
کانی موحەممەد موصطەفا

حینا کـو (هـات) ئـەو گولعـذار
غـــەوغا کەتـــە ئـــەهلێ کوفـــار
بـــەر لـــەرزی دێـــوێ غـــەدار
کانی موحەممەد موصطەفا

لـــەورا زەمانـــەک ڕابـــتن
شـەرعا شـەریف نوقصـان بـتن
دینـــێ مـــوبین هنـــدا بـــتن
کانی موحەممەد موصطەفا

گـــەر مـــوئمن و گـــەر كـــافرن

گـــــەر حـــــاكم و ئـــــەكابرن

(واللــــــه) هـــــەمى دێ بمـــــرن

كانى موحەممـەد موصطـەفا

قـــەولێ د مـــە غافـــل نـــەبى

حـــەتتا تەنـــەققول وه هـــەبى

(صـــلوا علـــى روح النبـــي)

كانى موحەممـەد موصطـەفا

لـــەورا كـــو ئەحمـــەد خانييـــه

ئـــەمما ب ئەصـــل عەدنانييـــه

ئـــەو نەســـلەكێ طـاهرييـــه

كانى موحەممـەد موصطـەفا

پاشى ئەڤ شعره من د دەستنڤيسەكا كەڤن دا ديت كو ل سالا ١٨٦٨ ز هاتييه نڤيسين، ئەڤ شعره بۆ كسەكێ ب ناڤێ عەبدللاهێ مەغربى هاتييه پالدان.

# موحەممەد صاحبێ تاجێ

موحەممــــەد صــاحبێ تـــاجێ
چراغـــێ جــنن و ئنســـانان
شــەڤا ئــەو چوویــە معراجـــێ
مەلــەکان شــاهییەک دانـــی

مەلـــەکان وێ کــرن شـــاهی
شــوکور خوەســتن ژ پادشــاهی
طــەوافا وان ووجــوود مــائی
خــودا ژ بــۆ مــوراد دانـــی

دەمــا ئــەو ژ مــەکێ دەرکــەت
ژ بـــۆ ڕاهـــاتی و فرســـەت
زێـدە ببــوو ل ســەر فرقــەت
ژ ئەرضــی چوویــە ئاســمانی

دەمــا هــاتی نــەبی ب کــەف
مەلەک ڕابوونە صەف ب صەف
ئــەوان مزگینـــی دانــە هــەڤ
ئەڤــە مــەحبووبێ ســولطانی

ئەڤـە مـەحبووب ئەڤـە طاهـا

ئەڤــە تاجــا ســەرێ شــاها

ئەڤـە شەمسـا د نیـڤ ماهـا

ب ڤـی خوەشـە موسـلمانی

ئەڤــە ئــەو ئەحمــەدێ نــادر

مەلــەکان پــورێ زیــارەت کــر

گـەها عەرشـان موشـەررەف کـر

خـودێ بـا کـر: وەرە بـانی

ب نـک ڤـە چوو کرە تـەعجیل

ب شـوون دان هشـتی جبرائیـل

گـەها عەرشـان مـابوو ذەلیـل

خــودێ پــەردە کــرە حائــل

خــودا پــەردە هلانــی بــوو

حـەبیب خـودێ ب چاڤ دیبـوو

حەقیقــەت پــێ نــەزانی بــوو

مونەززەهـ ئسـم و هـەم جانی

مونەززەهــ ئســم و جانــانی

حـەبیب ل خـودا بـوو مهڤـانی

ل جەننــــەتێ خورمــــە ئــانی

ب قــودرەتێ ل بــەر دانــی

خــودا گــۆتی ئــەیا مــەحموود

ئــەزم واحــد ئــەزم مــەعبوود

تــو چ بخــوازی دکــەم مەقصــوود

مـن وەعـدێ خوە ل تـە دانـی

ژ ئحســـانان تـــویی کامـــل

لـــەورا مـــن تـــو کـــری واصـــل

تـــو چ بخـــوازی دکـــەم حاصـــل

تـو ل دیوانـا مـن ترخـانی

حەبیب گۆ ل مـن بکـە مننـەت

بـدی مـن مەهـدەرا ئوممـەت

دا ئـەو سـوبە نـەبینن زەحمـەت

د نیـــڤ ئـــاگر و نیرانـــی

## دلۆ بەسکە

دلـێ بسـکە ئـەڤان فکـر و خـەیالان

ژ بەر تە من سوکوون نینە ل چو حالان

نزانـی مـا ژ هجرانـا حـەبیبی

ب نالـە شـوبهەتی نائێمـە نـالان

ت ئەزەل دا من دلێ غەمگین ب دەر دا

ژ دەردان چوویە صححەت لەو ب تالان

کوسـان دێ صـەبر و ئارامـەک هـەبیتن

هـەچی بـوو وەحشـییێ وەحشـی غـەزالان

چ لـێکم عشـرەتا عیـدا ل عـامێ

مـە عیـدە ژ طەلعـەتا ئـەبروو هـلالان

ت خوم سووندێ کو ناکم تـەرکێ عشقێ

بسـە واعـظ ئـەڤان وەعـظ و مثـالان

ژ بـێ مـە بێـدلان جەننـەت چڕایـە

بنـێ گرتـی جـەمالا مەهـ جـەمالان

ب قوربـانی تـە بـت میـر و ژ جـانی

دوعـاخوازم مویەسسـەر بـا دشـالان

# چەند بێژم چەند بەیان کەم

چەنـــد بێـــژم چەنـــد بـــەیان کـــەم
مـــــەخفیاتان ئاشـــــکەرا کـــــەم
سڕ و حـالان لێـک عـەیان کـەم
کـــەس ب حـــالێ مـــن نزانـــی
چەنـــد بێـــژم ســـڕ و حـــالان
ئاهــ ژ دەســتێ چـاڤ غـەزالان
هـــەر دنـــالم ماهـــ و ســـالان
کـــەس ب حـــالێ مـــن نزانـــی
ماهـــ و ســـالان هـــەر دنـــالم
شـــەڤ و ڕۆژ طالـــب وصـــالم
عاشـــــقێ بـــــەژنا شـــــەپالم
کـــەس ب حـــالێ مـــن نزانـــی
عاشـــقێ بـــەژنا لـــــەطـــــیفم
موبتـــــەلای قامـــــەت ئـــــەلیفم
خســـته حـــالم پـــوڕ ضـــەعـــیفم
کـــەس ب حـــالێ مـــن نزانـــی

خسته حالم پوڕ فەنامە
ژ یار و دۆستان ئەز جودامە
عاشقێ نوورا خودامە
کەس ب حالێ من نزانی
عاشقێ نورا خودامە
گەر ببینم ئەز جودامە
بۆ جەمالێ موبتەلامە
کەس ب حالێ من نزانی
ئەو جەمالا ڕەنگ قەمەر بوو
مەسکەنێ زولفان ل سەر بوو
چاڤا دیت دل کەر ب کەر بوو
کەس ب حالێ من نزانی
چاڤ ددی دل نالە نال بوو
شەڤ و ڕۆژان من خەیال بوو
لەو ژ ذاتی کبریا بوو
کەس ب حالێ من نزانی
ئاهـ ل من بۆرین فەضیلە
قەط نەهن بۆ من وەسیلە
هێڤییا من هەر جەلیلە
کەس ب حالێ من نزانی

هیڤیــا مــن هــەر خودایــە

لــەو کــو دونیــا هــەر وەهایــە

عاقبـــەت مـــرن و فەنایـــە

کـەس ب حـالێ مـن نزانـی

هــەر وەهــا خــانی مەرامــە

هیڤیـــدارێ وی خـــودا مـــە

دا کـــو وەصـلێ ئـەو بـدا مـە

کـەس ب حـالێ مـن نزانـی

## من دی شەڤا جومعەئێ

مـن دی شـەڤا جومعـەئێ ئەسـمەرەک ئـەز بـووم غـولام

چـووم طـەوافا راء و لامـان دلبـەرا شـێرین هـودام

شەوق و نوورا خەطط و خالان دل مورەففەهـ بوو تـەمام

ئەسـمەرا مـن دلبـەرا مـن ل تـە بـن یـووز بـین سـەلام

سـەد صـەلات و سـەد سـەلامێ پادشـاهێ قـودرەتێ

ئـەو ببـارن هـەر مودامـان بـەژن و بـالا قامـەتێ

بـێ حـەبیبا خـوە مـە نـەڤێ قـەط دوخـوولا جەننـەتێ

ئەسـمەرا مـن دلبـەرا مـن ل تـە بـن یـووز بـین سـەلام

ئـەز فـەقیرک بـێ نەصـیبم نـوورا ذاتـێ (ذو الجـلال)

هـەردو ئـەبروویی هلالـن ل جـەبینێ بوونـە خـال

ئـەز مەریضـەک بـێ دەوامـە هاتمـە نێـک عەرضـوحال

ئەسـمەرا مـن دلبـەرا مـن ل تـە بـن یـووز بـین سـەلام

لـەب عـەقیق و دوڕ و مـەرجان ئەو ژ ئەصلێ مەعدەنێ

قەمـەر و شەمسـێ د بورجـان روهنییـا وان داتـەنێ

صـنعەت و کـارێ خودێنـە خـال و نیشـان کـەتنێ

ئەسـمەرا مـن دلبـەرا مـن ل تـە بـن یـووز بـین سـەلام

ئەی دلۆ رابە خوە پێک بینە مەجالا بێت بوهار
باغ و بوستانێ مە خوەش بوو نێرگزا مەستی خومار
گولگول و چیچەک و ئالا ب خوە بوونە چار نەچار
ئەسمەرا من دلبەرا من ل تە بن یووز بین سەلام

گولگول و چیچەک و ئالا ئەو ژ رەنگێ تە گەشن
سونبول و رەیحان و سۆرگول ئەو ژ بهنا تە خوەشن
مسک و عەنبەر و بوخووره ئەم ژ بهنا سەرخوشن
ئەسمەرا من دلبەرا من ل تە بن یووز بین سەلام

سەد سەلام و صەلەواتێ پادشاهێ عابدان
ئەو ببارن هەر مودامان ل مەدینا ئەحمەدان
رەوضەیا سیما موبارەک هەم ل سەر وان مەرقەدان
ئەسمەرا من دلبەرا من ل تە بن یووز بین سەلام

## چوومە بەر دەرگاهێ رەحمەت

چوومە بەر دەرگاهێ رەحمەت
یا رەسوولوللاه مەدەد
بابێ شەفقەت بابێ رەحمەت
یا رەسوولوللاه مەدەد

بووسەگاهێ ئەنبیانی
مەلجەئێ مە عاصیانی
موستەغاثێ ئەولیانی
یا رەسوولوللاه مەدەد

موستەغاثی دەستەگیری
شاه و حکمەت بەر پەزیری
هیڤیدارێ من فەقیری
یا رەسوولوللاه مەدەد

ئەز فەقیرم ئەز گەدامە
ئەز گەدایەک ڕووسیامە
گەر چ بێم عەقلێ هوشامە
یا رەسوولوللاه مەدەد

ئـەز مەریضـم بـێ طـەبیبم
ئەبتـــەرم دیـــنم غـــەریبم
عاشـــقم دوورم غـــەریبم
یـــا رەسوولوللاهـــ مـــەدەد
عاشـــقم وەللاهـــ ژ مێـــژم
هـەردو چەشمان خوون درێـژم
هــەر دەمــا وەصــفان دبێـــژم
یـــا رەسوولوللاهـــ مـــەدەد
کەتمـە بـەر ئـێش و برینـان
مەلحەم و دەرمـان چو نینـان
ئـەز ژ کـوو بینم حـەکیمان
یـــا رەسوولوللاهـــ مـــەدەد
هـەر زەمـان و ئـان و حینـان
کەتمـە بـەر وەجـع و برینـان
ژاریـــێ ئاهـــ و ئـــەنینان
یـــا رەسوولوللاهـــ مـــەدەد
داعـی یـی تـو دل دەوا کـەی
هەر ب عشقێ موبتـەلا کـەی
جانفـدایێ موصـطـەفا کـەی
یـــا رەسوولوللاهـــ مـــەدەد

جانفـــدا هـــاتم ببیـــنم
دەفتـــەرا عشـــقێ بخـــوونم
دیـــن دبـــن ســـەودا دمیـــنم
یـــا رەسوولولـلاهـــ مـــەدەد
سـەرخوەش وسـەکران ومەستم
ئـــەفعییێ ئەســـوەد دکـــەزتم
صەبر وراحەت چوون ژ دەستم
یـــا رەسوولولـلاهـــ مـــەدەد
صەبر و راحەت بێ سـوکوونە
بـــازییێ نـــاڤ لـــێ عویوونـــە
دل ژ پـەنجان پورِ ب خوونـە
یـــا رەسوولولـلاهـــ مـــەدەد
صەبر و طاقەت مـن نـەمابوو
کـو مـە دی رووحـم جودا بـوو
شوبهی ڕۆژێ پورِ غـەمام بـوو
یـــا رەسوولولـلاهـــ مـــەدەد
شـوبهی ڕۆژا پـورِ دنـوو تـی
مثلـــی بلبـــل دل دســـۆتی
ب گـــول و رەیحـــان دگـــۆتی
یـــا رەسوولولـلاهـــ مـــەدەد

بێ گـوڵ و ڕەیحـان دمینـم

صـوبح و شـامان پوڕ حـەزینم

مەلحـەم و دەرمـان چـو نینن

یـا ڕەسوولوللاهـ مـەدەد

مەلحـەم و دەرمـان ل بـالن

هێسـترێ مـن پـوڕ دبـارن

هـەر وەکـی عـەورێ بهـارن

یـا ڕەسوولوللاهـ مـەدەد

مەلحـەم و دەرمـان ل بـا تـە

ئنتظـارم دیتنـا تـە

موسـتەمع بـوون گۆتنـا تـە

یـا ڕەسوولوللاهـ مـەدەد

موسـتەمع بـووم گوهـ ددێـرم

ژ مرۆڤـان ئـەز ب کێـرم

دل ژ پـەنجان وێ ب خوونـە

یـا ڕەسوولوللاهـ مـەدەد

سـەروەرێ ڕۆژا زەمینـێ

سـاکنێ بەلـدا ئـەمینێ

مـەنطقێ صـدق و یـەقینێ

یـا ڕەسوولوللاهـ مـەدەد

ئەشفەعێ عەبدێ موعینی
شارعێ ئەحکامێ دینی
شافیێ قەلبێ حەزینی
یا رەسوولولڵاهـ مەدەد
شافعێ قەلبێ مەلاحی
مەلجەئێ مەوجا نەجاحی
شافعێ عەبدێ موداحی
یا رەسوولولڵاهـ مەدەد
صادقێ صدق و صەفائی
راجییێ عەبدێ جەفائی
مەنبەعێ عزز و وەفائی
یا رەسوولولڵاهـ مەدەد
تو رەسوولێ کائناتی
هەم خودانێ موعجزاتی
ئەفصەحێ ئەهلێ لوغاتی
یا رەسوولولڵاهـ مەدەد
ئەفصەحێ ئەهلێ لسانی
حافظێ جوملە قورئانی
نەبییێ ئاخر زەمانی
یا رەسوولولڵاهـ مەدەد

نـەبییێ نەسـەب قورەیشـی
داوییـێ قـەلبێ حـەزینی
صـاحبێ ئـالا جـەمیلی
یـا رەسوولوللاهـ مـەدەد
قـائمێ ئـەمرێ جـەباری
گـازییێ ڕۆژا هـەواری
سـەروەرێ ڕۆژا غـەداری
یـا رەسوولوللاهـ مـەدەد
سـەروەرێ کـەعبا مونـەووەر
ذوودێ عنقـاب و موجـەووەر
شـافعێ ڕۆژا د مەحشـەر
یـا رەسوولوللاهـ مـەدەد

# ناڤەرۆك



طەبعێ خانی صەدەفا گەوهەرێ عرفانە وەلێ

مەتنخوانەك کو نەبت صاحبێ مەعنا چ بکەت؟



(ئەحمەدێ خانی)






ISBN: 9780750481175